# تەفسیری زمناكۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناكۆیی



جزمی: ١٧ ، ١٨ ، ١٩

بەرگی نۆیەم

# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿۱۷،۱۸،۱۹﴾

بەرگی نۆیەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی هەڤدەهەم و هەژدەهەم و نۆزدەهەم.
بەرگی نۆیەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ﴿ سورەتی ئەلئەنبیاء ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١٢) ئایەتن .

سُورَةُ الأَنبِيَاءِ — ترتيبها ٢١ — آياتها ١١٢

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ



## ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

﴿ اِقْتَرَبَ لِلْناسِ حِسابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴾ نزیکە بۆ ئادەمیزاد کـاتی پرسـیارکردنی خوا لـەوان لـەسەر کردەوەکانیان و ئەوان لـەبێ ئاگاییدان لـەو پرسـیارکردنەیانو بـیر ناکەنـەوە لەپاشەڕۆژی خۆیان و خۆیانیان بۆی ئامادە ناکەن و کەچی بە ئەقڵ ئەزانرێ پیاو چاکان و پیـاو خراپان ئەبێ پاداشتی کردەوەی خۆیان وەربگرن، هەرکاتێ بە خوێندنـەوەی ئایەتـەکان ئاگـادار بکرێن ڕووی خۆیانی لێ وەرئەگێڕن. لەم ئایەتەدا ووشـەی (اِقْـتَرَبَ ) بـە کـرداری ڕابـووردوو بێژراوە بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی ، لەبەرئەوەیە هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەندە نزیکە وەك هاتبێ وایە، با لای ئێمە دوور بێ، کاتی داهـاتوی جیـهان زۆر کـەمترە لـەکاتی ڕابـووردووی جیـهان، لـە زانیاری خوای مەزندا بڕیاری هاتنی ئەوکاتە بەسەرچوە.

﴿ ما يَأْتِيَهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُّحَدْثٍ إِلاّ اَسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴾ نایەت بۆلای دانیشـتوانی مەککە هیچ پەندێکی تازە لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوە بێتە خوارو ئاگاداریان بکا لـە یاسای بێ ئاگایی و نەزانین مەگەر ئەوان ئەو پەندە ئەبیسن و ئـەوان گاڵتـەی پـێ ئەکـەن و بـەدرۆی ئەژمێرن بەسوك تەماشای ئەکەن.

﴿ لاهِيَةً قُلُوبِهِمْ ﴾ بێ ئاگایە دڵیان لە ڕاستی و موبالاتی پێ ناکەن، هەست بـەڵێ پرسـراوی وپاداشت ناکەن و وێنەی ئاژاڵن و جگە لـە خواردن و خواردنەوە بیر لـە هیچی تر ناکەنەوە.

﴿ وَ أَسَرُوا النَّجْوى الَّذِيْنَ ظَلَمُوا هَلْ هذا إِلاّ بَشَرٌ مِثْلَكُمْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لـە خۆیان کردوە بەنهێنی گفتوگۆ ئەکەن لـەگەڵ یەکتری ئەڵێن: ئەو موحەمەدە داوا لــەئێوە ئـەکا دووای بکەون هیچ شتێ نیە مەگەر ئادەمیزادێکە وێنەی ئێوە، ئیتر بۆ ئەبێ شایستەی ئەوەبێ هەر بە تەنها ئەو بکرێ بە پێغەمەر. ئەوەندە گێل و گەوج بوون ئـەیان ووت: چـۆن ئـەبێ پێغەمبـەر

خواردن بخواو بڕوا بۆبازاڕ. زانست و ڕەوشتی بەنرخ لای ئەوان بێ مانایە و کاری پەکخەر لای ئەوان جادوە.

﴿ أَفَتَأْتُوْنَ السِحْرَ وَأَنْتُم تُبْصِرُونَ ﴾ ئایا ئێوە چۆن جادوی موحەمەد وەرئەگرن و بڕوای پێ‌ئەکەن و ئەزانن ئەوکارەی موحەمەد جادوەو ئەو کارە پەك خەرانەی لەسەردەستی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ پەیدا ئەبێ بەدرۆیان ئەزانی و نەیان ئەزانی چۆن ڕزگاریان ئەبێ لە ڕسوایی. بۆیە بە نهێنی گفتوگۆیان ئەکرد لەنێوان خۆیانا هەتا بتوانن خۆیان ئامادە بکەن بۆ پیلانێ لەدژی ئیسلام و پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ قالَ رَبِی یَعْلَمُ القَوْلَ فِي السَّماءِ وَٱلأَرْضِ وَهُوَ السَمِیْعُ العَلِیْم ﴾ بت پەرستان ئەیان ووت پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ جادوگەرە. پێغەمبەر لەوولامیان ووتی: پەروەردگاری من ئەزانێ بەهەمو گفتوگۆیە هەرکەسێ بەنهێنی بیکا لەئاسمان و لەزەویداو بەپیلانی بێباوەڕان ئەزانێو خوای مەزن گفتوگۆی ئەوان ئەبیسێو کردەوەی ئەوان ئەزانێ، هیچ شتێ لەخوای مەزن پەنهان نیە.

بت پەرستان کاتێ بڕوایان بەپێغەمبەر نەهێنا سەرگەردانبون بۆئەوەی کارەکەیان بچێتەسەر گەڕان بەدوای ئەوەدا فێڵی ساختە بهێنن، سەرەڕای ئەوەی ئەیان ووت: موحەمەد جادوگەرە.

﴿ بَلْ قالُوا أضْغاثُ أحْلامٍ بَلْ افْتَراهُ بَلْ هُو شاعِرٌ ﴾ هەندێکیان ووتیان: بەڵکو ئەو قورئانەی موحەمەد و شتە پڕوپوچەکانی خەون و لەخەودا بینیونی و تێکەڵاوی یەکی کردوون و وای زانیوە سروشەو لای خوای مەزنەوە بۆی هاتوە، هەندێ تریان ووتیان: بەڵکو ئەو قورئانە موحەمەد خۆی بەدرۆ و بوختان دروستی کردوە و خوای مەزن بۆی نەناردوە، هەندێ‌تریان ووتیان: موحەمەد شاعیرە و ئەو قورئانەی بەو جۆرە هۆنراوەتەوە. بت پەرستان لەسەر بیر و ڕایە ڕانەئەوەستان و ئەوەی ئەوان ئەیان ووت دژی یەك بون زۆر بە ئاشکرایی و ڕونی.

﴿ فَلْیَأتِنا بِآیَةٍ كَما أرْسِلَ ٱلأَوْلَوْنَ ﴾ بت پەرستان ووتیان ئەگەر موحەمەد پێغەمەرە، دوایی با ئەو بیهێنێ بۆلای ئێمە کارێکی پەکخەری ئاشکرا بەوێنەی شتێ پێغەمەرە پێشووەکان بەو شتە نێرراون. وەك هوشتری ساڵح و داری دەستی موسا و زیندوو کردنەوەی مردوان لەلایەن عیسا وە جگەی ئەوان لەکارە پەکخەرەکانی پێغەمەرانی پێشو. خوای گەورە وەڵامی دانەوەو ئەفەرموێ:

﴿ ما آمَنَتْ قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْناها أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ زۆر ڕاستە پێغەمەرانی پێشوو ئەو کارە پەکخەرانەیان هێنابو بەگوێرەی داخوازی تاقمەکانیانەوە. بەڵام باوەڕیان بە پێغەمەرەکانی خۆیان نەهێنا خوای مەزن لەناوی بردن و بنەبڕی کردن. یانێ دانیشتوانی هیچ گوندێ لەپێش بت پەرستانی ئێستاوە باوەڕیان بە پێغەمەرەکانیان نەهێناو بەدرۆیان خستنەوە، بۆیە لەناومانبردن، ئایا دوایی بت پەرستانی مەکە باوەڕ ئەهێنن ئەگەر داخوازی ئەوان جێ بەجێ بکرێ. بێگومان باوەڕناهێنن و پاشەڕۆژیان بەوێنەی گەلانی ڕابووردون ولەناو ئەچن

بت پەرستانی قورەیش ئەیان ووت: موحەمەد ئادەمیزادە وێنەی ئێمە شایستەی ئەوە نیە بکرێ بە پێغەمەر، خوای مەزن لە وەڵام دانەوە ئەفەرموێ:

وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُوحِي إِلَيْهِمْ فَسْئَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا لَا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ ﴿١٥﴾

﴿ وَما أَرْسَلْناكَ قَبْلَكَ إلاَّ رجالاً نُوحي إلَيْـهِمْ ﴾ وە ئێمـە ڕەوانـەمان نـەکردوە بـەر لـە تـۆ فریشتەکان بۆلای ئادەمیزاد. بەڕاستی هەر پیاوانمان ڕەوانە کردووە بۆلایان ئێمە سروشمان ناردوە بۆلایان بە وێنەی تۆ بوون:

﴿ فَاسْألُوا أهْلَ الذِكْرِ إنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئێوە پرسیار بکەن لە زانا خاوەن نامەکان هەتا هەواڵی پێغەمەرانتان بدەنێ ئەگەر ئێوە نازانن پێغەمەران هەر لە ڕەگـەزی ئـادەمیزادبوون، هەتا گومانتان نەمێنێ، خۆ ئێوە زۆر جاران ئەچنە لایان و بڕوایشتان بەوان هەیە، ئەو کاتە ئەوان بۆتان ڕون ئەکەنەوە پێغەمەران ئادەمیزادن.

﴿ وَما جَعَلْناهُمْ جَسَداً لا يأكُلُونَ الطَعامَ وَما كانُوا خالِدينَ ﴾ وە ئێمە پێغەمەرانمان دروسـت نەکردووە بەوێنە لـەشێکی بێ گیان خواردەمەنی نـەخۆن و بـەردەوام نـین لـەجیـهانداو نـەمرن. بەڕاستی وێنەی ئێوەن بەبێ جیاوازی بەڵام ئەوان کراون بە پێغەمەر بۆ ڕاگەیاندنی فەرمانیخوا.

﴿ ثُمَ صَدَقْنـاهُمْ الْوَعْـدَ فَأنْجَيْنـاهُمْ وَمَـنْ نَشـاءُ وأهْلَكْنـا الْمُسْرِفِينَ ﴾ لـە پاشـا ئێمـە ئـەو پێغەمەرانەمان بەڕاست گێڕا لـەو بەڵێنەدا بۆیان بە دانیشتوان کەخوای مەزن دوژمنانی پێغەمەران لەناوئەبا، دوایی پێغەمەران و کەسێ ئێمە ئارەزۆ بکەین لە باوەڕداران ڕزگارمان کردن و ئێمـە ئەوانەی لـە سنوری دەرچوبون و بێ فەرمانی خوای مەزنیان کـرد لـەناومان بـردن و بنـەبڕمان کردن.

﴿ لَقَدْ أنْزَلنا إلَيْكُمْ كِتاباً فيهِ ذِكْرُكُمْ أفَلا تَعْقِلُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردووە بـۆلای ئێوەی قوڕەیش نامەیە لـەو نامەدا هەیە کە قورئانی پیرۆزە باسی ڕێزوشانازیە بۆئێوە ئەگەر کـارە فەرمودەکانی بکەن و بە زمانی خۆتان هاتوەتە خوارەوە ئایا بۆ ئێوە بیرناکەنەوەو باوەڕبهێنن. ئەو قورئانە دەستوری ئێوەیە بە جۆرێکی شایستە، ئایا ئێوە بۆ بیر ناکەنەوە کە ئێـوە گـەلێکی پـرژو بڵاو بێ باس و بێ مێژوو بەر لـە هاتنی قورئان، دوای هاتنی قورئان ئێـوە ناوتـان پـەیدا کـردوو واتان لێ هات نەتەوەکان و مێژوو نووسان باسی پێشکەوتن و شارستانیەتی ئێـوە بکـەن، دوایـی پلـەو جێگەتان بەرزبویەوە .

بەسە بۆ بەرزی قورئان وگەورەیی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ — (و.ل دیورانت) لـەمەوسەعە مێژووەکەی خۆیا:

(قصة الحضارة) ئەڵێ: (موحەمەد یەکێکـە لـە گـەورەترینی گـەورەکانی مێـژوو، پێویسـتی کردبوو لـەسەرخۆی کە ڕەوشت و پلـەی گیانی گەلێ بەرز بکاتە لـە تاریکی ئـاژاڵی و کـەش و گەرما و لـە دەشت و بیابانێکی ووشکدا ئـەژیان، ئەوموحەمـەدە لـە مەبەسـتی خۆیـا دەسـت

کەوتێکی وای بەدەست هێنا هیچ پیاو چاکێکی مێژوویی وێنەی ئەو نەبێ و نزیکی ئەونەبووەتەوە. کاتێ بانگەوازی چاکەی موحەمەد دەستی پێ کرد عەرەبەکان لەو بیابانە ووشکەدا ئەژیان و چەن هۆزێکی بت پەرست بوون، ژمارەیەکی کەم وپارچە پارچە بوون، ڕاوێژو گفتوگۆیان یەکی نەئەگرت، هەتا وایان لێهات کاتێ موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی دوایی کرد عەرەبەکان بوونە نەتەوەیەکی یەکگرتوو، ڕەگەز پەرستی و بیروباوەڕی پوچ باوی نەما، لە ژووری جوەکان و گاوەرەکانەوەوئایینی کۆنی دانیشتوان شارانی تر ئایینێکی ئاسان و ئاشکرا پەرپا بکا کۆشکی ڕاوەستانی ئازایی و گەورە ئادەمیزاد ڕابوەستێنێ، تاقمێکی ژمارە کەمی پێکەوەنا کە لە نزیکەی سەد جەنگدا سەربکەون بەسەر ژمارەیەکی زۆرو بێ شوماردا، لەیەك خولەکدا دەوڵەتێکی گەورەی دروست کرد، هەتا ئەمڕۆیش خاوەن ڕێزو سامی گەورەن لەنێو بونەوەراندا

﴿ وَكَمْ قَصَمْنا مِنْ قَرْيَةٍ كانَتْ ظالِمَةً وَأَنْشَأْنا بَعْدَها قَوْماً آخرينَ ﴾ وە ئێمە دانیشتوانی زۆر گوندمان لە ناو بردون دانیشتوانی ئەو گوندە ستەمکاربوون و پێغەمەرەکانی خۆیان ئەکوشت و بەدرۆیان ئەخستنەوەو ئێمە دوای نەمانی ئەوان تاقمێکی ترمان دروست کردن و جێگەی پێشوەکانیان گرتەوەو بوون بە خاوەنی زەوی ئەوان .

﴿ فَلَما أَحَسُوا بأْسَنا إذاهُمْ مِنْها يَرْكُضُونَ ﴾ دوایی کاتێ ئەو تاقمەی تر هەستیان بە سزادان و لە ناوبردنی ئێمە کردو بە چاوی خۆیان سزای ئێمەیان بینی، دوای ئەو کاتە زۆر بە تیژی لەو گوندە ڕایان ئەکرد بە پیادەبێ و بە سواری وولاخەکانیان. بەڵام ڕاکردن لە دەسەڵاتی خوا زۆر دوورەو ناگونجێ. ئەگەر لەمەوبەر بۆلای خوای مەزن ڕایان بکردایە ئاسودە ئەبوون .

﴿ لا تَرْكُضُوا وَأَرْجِعُوا إِلى ما أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَساكِنِكُمْ لَعَلَكُمْ تُسْأَلُونَ ﴾ ئێوە ڕامەکەن و بگەڕێنەوە ئێوە بۆلای شتێ ڕاتان ئەبوارد لەنێویداو شانازیشتان پێوە ئەکردو بگەڕێنەوە بۆلای جێگەکانی خۆتان، بۆ ئەوەی پرسیارتان لێ بکرێ و سزاتان بدرێ، لەمەو بەربتەکانتان ئەپەرست، ئەوەیە پاداشتی کەسێ واز لە ڕێگەی ڕاست بهێنێ.

﴿ قالُوا يا وَيْلَنا إنا كُنا ظالِمِينَ ﴾ ووتیان: ئەی هاوارونەمان بۆ ئێمە. بە ڕاستی ئێمە ستەمان لە خۆمان کرد کە باوەڕمان نەهێناو، پێغەمەرەکانمان بەدرۆ ئەخستەوە، ئەوەی ڕۆیشت ناگەڕێتەوە، ئەوە بۆچی پێغەمەرەکانتان ئەکوشت؟.

﴿ فَما زالَتْ تِلْكَ دَعْواهم حتى جَعَلْناهُمْ حَصِداً خامدينَ ﴾ دوایی ئەو گەلانـە لانـەچوون و ئەو هاوارو واوەیلایەیان دوپات ئەکردەوە، پەپایەی سزا ئەڕژا بەسەریانا هەتا ئێمە ئەوانمان گـێڕا بە وێنەی ڕوەکێکی درەوکراوو بە مردویەکی بێدەنگ، پلەو پایەو سامان نەگەیشتە فریایان.

وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾

﴿ وَما خَلَقْنا السماءَ والأرضَ وَما بَيْنَهُما لاعِبينَ ﴾ وە ئێمە ســامان و زەوی ئـەو شـتەی لـە نێوان ئاسمان و زەویدان دروستمان نـەکردوون بـۆ یاری و بـێ سـوودی. بـەڵکو دروسـتمان کردون بە جۆرێك پڕکراون بە چەندین شتی زۆرو بەنرخ و بین بە هۆی پەند و ئامۆژگـاری بـۆ ئەوکەسانە خاوەنی ئەقڵ و هۆشن، جێگەی ژیـان و بـەڕێوەبردنی کـارو گـوزەران و فـێربوونی زانست و زانیاری و پەرستنی خوای مەزنە، بە جوانی و بـێ بـەردەوامی ئـەوان فریـو ئـەخۆن. بەڵگەن لـەسەر توانای بێ وێنەی خوای مەزن .

﴿ وَلَوْ اَرَدْنا أن نَتخِذَ لَهْوا لأتَخَذناه من لَدنا إنْ كُنا فاعِلِيْن ﴾ وەئەگەر ئێمە بمان ویستایە کە ئێمە وەربگرێن شتێ بۆ ڕابواردن و یاری پێکردنی خۆمان وەك کوڕ و ژن و شتی تـر. بەڕاسـتی وەرمان ئەگرت لـەلایەن خۆمان شتێ شایستەی ئێمەبوایە نـەك ئـەو شـتانەی ئێـوە ئەیکـەن لـە ڕابوارد نو خۆشـی ژن و منـاڵ و دروسـت کردنـی کۆشـکی نایـاب و بـەرزو ڕازاندنـەوەی و ڕێکخستنی ڕاخەرو سەرەخەر ئەگەر ئێمە بمان کردایە شتێ پێ ڕابوێرین. بێ گومان ئێمـە ئـەو شتەمان نەکردووە نایشی‌کەین، چونکە ئـەو شـتانە گونجـاوی بـەرزی و گـەورەیی ئێمـە نیـەو پێویستمان بە هیچ شتێ نی‌یە.

﴿ بَلْ نُقْذِفُ بالحَقِ على الباطِلِ فَيَدْ مَغُهُ فأذا هُوَ زاهِقٌ ﴾ بەڵکو ئێمە ڕاستی فڕە ئەدەینە سـەر کاری پڕوپوچ، دوایی ئەو ڕاستی‌یە ئەو شتە پڕوپوچە ناهێڵێ، دوایی کتوپـڕ ئـەو پوچـە نامێنـێ شوێنەواری وون ئەبێ، کاری بێ سوودو ڕابواردنی بێمانـا لـەهـەر جێگەیـە سـەرهەڵبدا خـوای مەزن پوچی ئەکاتەوە، چۆن خوای مەزن شتێ ئەکا بۆ خۆی و لای خۆش نەبێ بیدا بـە جگـەی خۆی کە ڕابواردنی بێ سوودە. یانی ئێمە درۆ پوچ ئەکەینەوە بە چ شتێ ڕوونی ئەکەینـەوە لـە ڕاستیدا، دوای خوای مەزن لـەسەر بێ باوەڕی خۆیان هەڕەشەیان لێ ئەکاو ئەفەرۆموێ:

﴿ وَلَكُمْ الوَيْلَ فَماذا تَصِفونْ ﴾ وەهاوارو شین و سزای سەخت بـۆ ئێوەیـە لـەبەرئـەوە ئـەو شتەی باسی ئەکەن و ئەیدەنە پاڵ خوای مەزن لـە مناڵ و ژن و ڕابواردن و شایستەی گـەورەی پەروەردگار نی‌یە .

﴿ وَلَهُ من السَـماواتِ والأرْضِ وَمِـنْ عِنـدِهِ لا يَسْـتَكْبِرُونْ عَـنْ عِبادَتِـهِ وَلا يَسْتَحْسِـرُونْ ﴾ وەبۆخوای گەورەیە هەموو کەس و هەموو شتێ لـە ئاسمانـەکاندا وەك فریشـتەکان و شـتی تـرو هەرکەسێ و هەرشتێ لـە زەویدان لـە مرۆڤ و جنۆکەو ئاوو شتی تریـش و، کەسـانێکی ئـەوتۆ نزیکن لـە خزمەت خوای مەزن خۆیان بەگەورە ناگرن بۆ پەرستنی خوای مـەزن و مـاندو نـابن لـەپەرستنی خوای گەورەدا. لێرەدا فریشتەکان بە تایبەت باسـکراون هەرچـەندە بەشـێکن لـەو شتانەی باسکراون لـە ئاسماندا لـەبەر ڕێزی گەورەییان .

﴿ يُسبِحونَ اللّيْلَ وَالْنَهارَ لا يَفْتَرُونْ ﴾ ئەو کەسانەی کە پلـەی بـەرزیان هەیـە لـە خزمـەت خوای مەزندا شەوو ڕۆژ و هەمووکاتێ نوێژ ئەکەن بۆ خوای مەزن و پـاك و دووربوونـی خـوا دەرئەبڕن لـە کاری ناشایستەو ماندوو نابن و بەردەوامن لـەسەر پەرستنی خواو بە گفتوگـۆو بـە کردار.

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِنَ الأَرْضِ هُمْ يُنْشِرُونَ ﴾ ئایا چۆن ئەو بێ باوەڕانە چەند خوا ئەپەرستن لە ڕەگەزی زەوی لە درەخت و بەردو زوێڕو زیوو ئادەمیزاد، ئەوخوایانە بەگومانی ئەوان مردوان زیندو ئەکەنەوەو خۆیان دروست کراون. یانێ هەموو پەرستراوەکانی پت پەرستان مردوان زیندوو ناکەنەوە. بەڵکو هەر خوای مەزن بە تەنها کەسێکی ئەوتۆیە بونەوەرانی زیندو کردووە و ئەیان مرێنی و دوای زیندویان ئەکاتەوە .

﴿ لَوْ كانَ فِيهِما آلِهَةٌ إِلا اللهُ لَفَسَدَتا ﴾ ئەگەر ببوایە لەنێو ئاسمان و زەوی‌دا چەند خوای جگەی خوای مەزن بە ڕاستی ئاسمان و زەوی لەناوئەچوون و ئەڕوخان بەسەریەکاو کارو بەڕێوەبردنی بونەوەران شلۆق ئەبوو بنەبڕئەبوون. زۆر ڕوون و ئاشکرایە هەرجێگەیە دوو فەرمان ڕەوایی تێدابێ ئیش وکاریان بەڕێوە نەچووە. بۆ نموونە: ئەگەر دوو خوا هەبێ یەکێان ئەیەوێ شتێ دروست بکا ئەوی تریان ئەیەوێ دروستی نەکا، دوایی ئەگەر دروستبووبێ دەسەڵاتی ئەوی تریان دەرئەخا. ئەگەر دروست نەبوبێ دەسەڵاتی ئەوی تریان دەرئەخا. ئەگەر هیچیان نەکرا لاوازی هەردووکیان پەیدا ئەبێ.

﴿ سُبْحانَ اللهِ رَبِّ العَرْشِ عَما يَصِفُونَ ﴾ دووایی پاکی و خاوێنی بۆ خوایە کە پەروەردگاری هەموو بونەوەرانەو خاوەنی تەخت و کورسی دەستەڵاتە، دورە لەو شتانەی ئێوە باسی ئەکەن لە ژن و مناڵ ولەوەی چەند خوایە ببێ لە ئاسمانەکان و لە زەویدا .

﴿ لا يُسْأَلُ عَمّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴾ پرسیار لە خوا ناکرێ لەو شتەی کە خۆی ئەیکا بە تەنها و ڕەخنەی لێ ناگیرێ، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و ئادەمیزاد پرسیاریان لێ ئەکرێ، چونکە ئەوان دروست کراوی خوای مەزنن و جێگەی هەڵەکردنن. پوختەو کورتەی مانای ئەوئایەتە ئەمەیە خوای مەزن خۆی لە خۆیا دادپەروەرە دروست نیە کەسێ ڕەخنە لە فەرموودەی و لە کرداری بگرێ، چونکە نابێ ببژێرێ بە دادپەروەر تۆ بۆ دادپەروەری، بە مرۆڤی ڕاست تۆ بۆ ڕاستی، دروست نیە مرۆڤێکی نەزان بە پزیشکێکی پسپۆڕ بڵێ: تۆبۆ باسی چاکەی ئەو دەرمانە ئەکەی. کەواتە مرۆڤی نەزان ئەبێ خۆی ماندو بکاو بگەڕێ بە شوێن زانایەکی کارامەدا، کاتێ بۆی دەرکەوت ئەو زانایە ئەبێ خۆی تەسلیم بکا لەو شتەدا ئەیزانێ.

خوێندکارێ بە مامۆستاکەی خۆی ووت: لەبەر چ شتێ ئێمە پەیدابووین و لەبەر چ شتێ ئەژین؟

دوای مامۆستاکەی پێی ووت: ئەی کوڕی خۆم: تۆ مامەڵە بە گیانی خۆت مەکە لە چەندین دەشتی چۆڵ و سەرگەدانیدا سەرەتاو کۆتایی نەبێ، لەبەر چ شتێ باوەڕ بە ئاینی خۆت نایەنی و دەرونی خۆت ئازار نەدەی و بە ئاسانی دانیشی و واز لە شتێ بهێنی لە توانای تۆدا نەبێ؟ ئەم زەوی بەفرە تۆ لەسەری ئەژیت ئەستێرەیەکە لە هەزاران ملیۆن ئەستێرە. تۆ تاکە کەسێکی لە ناو هەزاران ملیۆن ئادەمزادا. ئەم شارە تۆ لەنێویا ئەژیت شارێکە لە هەزاران شار. ئەم گەردوونەی ئەوتۆ ئەو هەمووە شتانەی تێدابێ چ کەسێکە بتوانێ وێنەی ئەوانەو زۆرتریش لەوانەمان پێ بناسێنێ؟ ئایا بەشێکی بچوك ئاگای لەوانە هەیە، دڵۆپە ئاوێ ئەتوانێ پرسیار لە زەریایە بکا؟.

ئەی کوڕی خۆم من نالێم: واز لە باس و زانین و بیرکردنەوە بهێنە. ئەوانە نوختەی سەرەکی بوونی ئادەمیزادن بەڵام هەرکاتێ ئەقڵت ڕێگەی بە زانینی شتێ نەبرد بوەستە هەتا زانین فراوان ئەبێ، کاتێ هیچ شتێکت بۆ نەکرا خۆت تەسلیم بەواقیع بکە، وابزانە کە تۆ شتێکت نەزانی مانای وا نییە ئەوگەردوونە بێ سوودە.

یانێ کە تۆ سودی گەردونت نەزانی، وازی لێ بهێنە بۆ دروست کەری هەموو بونەوەران، دوایی ئەو کارانە ئیشی بونەوەرێ بێ لەگەڵ بونەوەری ترا، دوای ئەبێ لەگەڵ دروست کەری بونەوەراندا چۆن بین؟

أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِى بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ

وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾

هۆزی خوزاعەی عەرەب ئەیان ووت: فریشتەکان کچی خوان و خوای مەزن خزمایەتی ژن و ژن خوازی لەگەڵ جنۆکەکاندا هەیە، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بووبێ، خوای مەزن لە وولاّمیانا فەرمووی:

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ اللهِ آلِهَةً قُلْ هاتُوا بُرْهانَكُمْ ﴾ ئایا ئەوان چۆن وەریان گرتووە بۆ خۆیان چەند خوایە لە جگەی خوای مەزن، هەموو داواکاریە ئەبێ بەڵگەیەکی هەبێ تۆ بڵێ بەو کەسانە ئێوە بەڵگەی خۆتان بهێنن لەسەر ئەو داوایەتان ئەگەر هەتانە، هەرکەسێ داوای هەرشتێ بکا پێویستە شایەتی بۆ بهێنێ بازۆر بێ نرخیشبێ، چۆن ئێوە ئەڵێن: خوای گەورە هاوبەشی هەیە .

﴿ هذا ذِكْرُ مَنْ مَعِيَ وَذِكْرُ مَنْ قَبْلِي ﴾ ئەم قورئانە بەڵگەیە بۆ کەسێ لەگەڵ منەو لەسەر ئاینی منەو دوای کەوتووە هەتا ڕۆژی دوایی و، بەڵگە و هەواڵی کەسێکە لە پێش منەوە بوون لە نەتەوە ڕابوردووەکان و هەواڵدانە بە شتێ ئەوان کردویانە لە جیهاندا، ئەو نەتەوە پێشوانە هەموویان لە نامەکانیانا فەرمانیان داوە بە تاك و تەنهایی خوای مەزن و بەبێ هاوبەشی خوای گەورەو شایەتە بۆ ئەوان، ئەی شایەتی ئێوە چشتێکە؟ کەواتە ئێوە نە بەڵگەی ئەقڵی و نە بەڵگەی نەقڵیتان نیە لەسەر بوونی چەند خوایە لە جگەی خوای مەزن، کوێرانەو بێ زانستی هیچ شتێکی دابین ناکرێ.

﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ الْحَقَ فَهُمْ مُعْرِضُونَ ﴾ بەڵكو زۆرتر لە بێ باوەڕان ڕاستی نازانن و ڕاستی و ناڕاستی جوێ ناکەنەوە، دوایی ئەوان ڕووە ئەگێڕن لە یەکێتی و لە پیڕەوی کردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. لەبەر نەزانینی بێ باوەڕان خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَما أَرْسَلْناكَ مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رسُولٍ إِلاّ نُوحي إِلَيْهِ أَنَهُ لا إِلهَ إِلاّ أَنا فَاعْبُدُونِ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان نەکردووە لە پێش تۆوە هیچ پێغەمەرێ مەگەر سروشمان ناردووە بۆلای ئەو پێغەمەرە. کە بەڕاستی هیچ خوایە نیە شایەنی پەرستن بێ جگەی من، دوایی پێویستە ئێوە هەر بە تەنها من بپەرستن. نەك فریشتەکان.

﴿ وَقالُوا أتَخَذَ الرَحْمانُ وَلَداً سُبْحانَهُ بَلْ عِبادُ مُكْرَمُونَ ﴾ وەبێ باوەڕان ئەیان ووت: خـوای خاوەن بەخشندە وەری گرتووە بۆخۆی منالْ، ئەوەبوو جوەکـان ئـەیان ووت: عوزەیـر کـوڕی خوایە، گاورەکان لایان وابـوو: عیسـا کـوڕی خوایـە، هـەندێ لـە عەرەبـەکان ئـەیات ووت فریشتەکان کچی خوان. پاکی و خاوێنی و بێ منالْی بۆخوای خاوەن بەخشـندەیە. بـەڵکو ئـەو فریشتە بەندەیەکن ڕێزدارن و دروست کراوی خوای مەزنن.

﴿ لا یَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأمْرِهِ یَعْلَمُـونَ ﴾ ئەوبەندانـەی پێشـی خـوای خـاوەن بەخشـندە ناکەون بە هیچ گفتوگۆیە و گفتوگۆ ناکەن بەبێ فەرمانی ئـەوو ئـەوان هـەر بـە فـەرمانی خـوا کارئەکەن، پێچەوانەی فەرمودەی خوا ناکەن، بەڵام بت پەرستان ئەڵێن: ئەو بەندانەی خوا بەبێ دەستوری خوای خاوەن بەخشندە گفتوزگۆ ئەکەن وکاریش ئەکەن بەبێ فەرمانی خوا.

﴿ یَعْلَمُ ما بَیْنَ أیْدیهِمْ وَما خَلْفَهُمْ وَلا یَشْفَعُونَ إلاّ لِمَـنَ أرْتَضـی ﴾ وە خـوای مـەزن ئـەزانێ بەشتێ لـەمەوبەر کردویانەو بەشتی لـەمەو پاش ئەیکەن و فریشتەکان و پیاوچاکان ناپاڕێنەوە بـۆ هیچ کەسێ مەگەر بۆ کەسێ خوای مەزن ڕازی بێ لێی. ئەوڕستەیە ئەوکەسانە بەدرۆ ئەخاتەوە کە پێغەمەرێ یان پیاو چاکێ یا فریشتەیە ئەپەرستن و ئـەڵێن: ئـەو کەسـانە بۆمـان ئەپاڕێنـەوە، پاڕانەوەی ئەو کەسانە بۆ کەسێکە خوا بەیەك خوا دابنێ و هاوبەشی بۆ خوای مەزن دانەنابێ.

﴿ وَهُمْ مِنْ خَشْیَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴾ وە ئەو بەندانەی خوا لـەبەر گەورەیی و سامی خـوای مـەزن ئەترسن لـە سزای خوای خاوەن بەخشندە بەو هەمووە ڕێزەوە خوای مەزن بەخشیویە بەوان.

﴿ وَمَنْ یَقُلْ مِنهُمْ إني إلهٌ مِنْ دُونِهِ فذلِكَ تَجْزیهِ جَهَنَمَ ﴾ وەهەر کـەسێ لـەو بـەندای ئێمـە بڵێ: من خوام لـە جگەی خوای مەزن، دوایی ئەو کەسەی ئەو شتەی ووتوە ئێمە سزای ئەدەین بە ئاگری دۆزەخ .

﴿ کذلِكَ نَجْزي الظّالِمِینَ ﴾ هەر بەو جۆرە ئێمە سزاو پاداشتی سـتەمکاران ئەدەینـەوە کـە بڵێ: بەڕاستی من خوام یان هاوبەش بۆ خوا دابنێ بەبێ جیاوازی .

أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠) وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ

رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾

بەر لەوەی دەست بکەین بە ماناکردنی ئایەتەکان ئەم ئاگاداریانەی خوارەوە باس ئەکەین:
بەڕاستی قورئانی پیرۆز خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پیشاندانی ڕێگەی ڕاست بۆ ئادەمیزاد هەتا بگەن بە بەختیار هەردوو جیهان و بۆ فێرکردنی ڕەوشتی چاك و نەهێشتنی ستەم، قورئان نامەیە نیە بۆ شی کردنەوە فەلسفەو زانیاری ئاسمان و فێرکردنی ئەندازیاری و پزیشکی و شتی تر لە کاروباری جیهانی نەهاتوەتە خوارەوە. ئەو ئایەتانەی باسی مێژوو کانگاکانی زەوی و باسی گەلانی پێشوو ئەکا مەبەست لەو باسانە بۆ ئەوەیە ئادەمیزاد ئامۆژگاری و تەمێ وەربگرن و خراپە نەکەن لەگەڵ یەکتری نەکەن و بیان کەن بە بەڵگە لەسەر بوون و توانای خوای بێ وێنەو باوەڕی پێ بهێنن. لەم ئایەتەی دواییدا کەباسی گەردوون ئەکەن و بۆمانی ڕوون ئەکەنەوە کە زەویی و ئەستێرەکان کۆمەڵگای خۆرن و وەك دایکیان وایە، زەوی و مانگ و

مەریخ و عوتاریدو جگەی ئەوانیش هـەموویان بەشێکی لکـاو بـوون بـە خـۆرەوەو لـەو جیـا بوونەتەوە، هەریەکەیان بوون بەئەستێرەیەکی سەربەخۆو بازنەیەکی تایبەتیان بۆ خۆیان دروسـت کردووەو کێشی تایبەتی خۆیان هەیە. زانایانی ئەم سەردەمەی ئێمە هەریەکەیان ئەو بڕیارەیـان لا پەسەندە. بەلاّم بیروبۆچونیان لـەیەکتری جیاوازە. کەواتـە بـۆ ئێمـە چـاك وایـە بـێ دەنگبـین و هەوالّەی زانیاری خوای گەورەی بکەین. باسکردنی قورئان لەو بارەیە تەنها بـۆ ئەوەیـە توانـاو زانیاری خوامان بۆ دەرکەوێ و ئـادەمیزاد سـەری بـۆ دانـەوێنن، خـوای مـەزن لـەو بـوارەدا ئەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ يَرَ الذيْنَ كَفَرُوا أنَّ السَماواتِ والأَرْضَ كانتا رَتْقاً فَفَتَقْناهُما ﴾ ئایـا کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان نەهێناوەونەیانزانیوە کە بە ڕاستی ئاسمانەکان وزەوی لکابوون و بەسترابون بە یەکـەوە، دوایی ئێمە لـەیەکمان بچڕاندن و لـە یەکمان جوێ کردنەوە. کەواتە زەوی پارچەیە بـووە لـە خۆرو لـەبەر تیژی توند سوڕانەوەی خۆر بە بەردەوامی لـەسەر سوڕانەوەی خۆی پارچەیـەکی لێ جوێ بۆتەوەو ئەم زەویە ئێستا لـە سەرینی ئەو پارچەیەتە، زەوی بەردەوامە لـەسەر سـوڕانەوەی خۆی بە دوای خـۆردا لـە سـالّێکا جـارێك، توێـژی سـەر زەوی پـاش هـەزاران هـەزار سـالّ ساردبونەتەوە بەجۆرێ شایستەیە بۆ ژیـانی ئـادەمیزاد لـەسـەری. بـەلاّم نـاوەوەی زەوی هێشـتا گەرمەو گڕی لێ پەیدا ئەبێ هەروەك بەر لـە جوێی بونەوەی لـە خـۆر، قورئـانی پـیرۆز ئـەو ڕاو بۆچوونەی باس کردووە بەر لـە هەزارو بیست سالّی کۆچی و زۆرتریش.

لـە پاشا تیشکی خۆرمان زالّ کرد بەسەر ئاوی دەریاکـانی ڕوی زەویـی و لـەو ئـاوە هـەلّم دروست ئەبێ و بەرز ئەبێتەوەو ئەبێ بە باران و ئەڕژێ بەسەر زەویدا، درەخت و ڕووەك سـەوز ئەکا، هەندێ لـەو ئـاوە ئەچێتـە نـاو زەوی و درزی کێوەکـان، نەختەنەختـە دێتـە دەرەوە یـا هەلّئەگۆزرێ لـە چالّەکانی زەوی هەتا ئادەمیزاد و گیاندارانی ترو ڕووەك گەشە بکەن و بژیـن. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَجَعَلْنا مِنَ الْماءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍ ﴾ وە ئێمە دروستمان کردوە لـەو ئـاوە هـەموو شـتێکی زیندوو وەك ئادەمیزادو گیان لـەبەرانی تر، هەروەك لـە دلّۆپێ ئـاویی نێرینـە هـەموو گیـانداری دروست کراون بەبێ ئاویش ناژین. کەواتە ئاو سەرچاوەی ژیانی هەموو بونەوەرێکی زینـدەوەو زۆربەی تەڕایی لـەشیشیان ئاوە. زیندەوەران ئەوپەڕی پێویستیان بە ئاو هەیە، زۆر بە کەمی ئارام ئەگرن بەبێ ئاو.

﴿ أَفَلا يُؤْمِنُونَ ﴾ ئایا بێ باوەڕان بۆ باوەڕ بەخوای مەزن نایەرن دوای ئەو هەمووە بەڵگە ڕون و ئاشکرایانە لەسەر توانای خوای مەزن وواز لە بت پەرستی ناهێنن؟.

﴿ وَجَعَلْنا فِي الأَرْضِ رَواسِيَ أَنْ عَيدَبِهِمْ ﴾ وە ئێمە دروستمان کردووەچەندین کێوی نەجوولاو لەبەرئەوەی زەوی نەجوڵێ بە دانیشتوانی سەریەوەو ئازاریان توشبێ، ئەگەر کێوەکان نەبونایە زەویی لەجوڵە جوڵ ئەکەوت، چونکە ناوەوەی زەوی شتی وای تێدایە هەموو کاتێ لە هەڵچونایە.

﴿ وَجَعَلْنا فِيها فجاجاً سُبُلاً لَعَلَهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ وە ئێمە دروستمان کردووە لەهەر یەکە لە زەوی لەکێوەکاندا چەندین شیوو ڕێگەی زۆرو فراوان لەبەر ئەوە ئەوان ڕانمویی وەرگرن بۆ هاتوچۆیان و پەیداکردنی ئیش و کاریان و لە کارواندا ڕێگەیان لێ وون نەبێ و بگەنە جێگەی مەبەستی خۆیان، بەڵگەیە تریشە لەسەر گەورەیی و توانای خوای مەزن:

﴿ وَجَعَلْنا السَماءَ سَقْفاً مَحْفُوضاً وَهُمْ عَنْ آياتِنا مُعْرِضُونَ ﴾ وە ئێمە ئاسمانمان گێڕاوە وە بانێکی پارێزاو لە کەوتن و لە گوێ گرتنی شەیتانەکان و لە مانەوەی ئەستێرەکان بە ڕاکێشانی خۆیانەوە بە جۆرێکی شایستە هەتا نەکەونە خوارو نەدەن لە یەکتری و، بێ باوەڕان لەو چەند بەڵگە ڕوونانەی ئێمە وازئەهێنن و ڕو وەرئەگێڕن و باوەڕ بە توانای خوا نایەرن کە ئەو پەیڕەوە سەر سوڕێنەرانە بەڵگەی بڕوندەن لەسەر بوونی یەکێتی خوای مەزن و توانا و زانیاری دانانی هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیانا .

﴿ وَهُوَ الذي خَلَقَ اللَيْلَ وَالْنَهارَ وَالْشَمْسَ وَالْقَمَر ﴾ وە خوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە شەوی دروست کردووە بۆ پشودان وماندوو دەرچونتان و خەوتنی ئێوەو ڕۆژیشی دروست کردووە بۆ هاتوچۆکردن و پەیداکردنی هۆی نەخۆشی و گوزەرانتان و خواردەمەنی بۆخۆتان و ئاژەڵەکانتان و خۆری دروست کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕوناکی و ڕژاندنی گەرمای پێویست و بۆ بینینی بەردەمی خۆتان و شتێ پێویستیان پێ هەبێ و خۆتان بپارێزن لە کارەساتی خراپ و بۆ ئەوەیش سەرماتان لێ دورخاتەوەو مانگی دروست کردوە بۆ بیرکردنەوە لە ژمارەی مانگ و ساڵ هەفتەو دیاری کردنی درۆشمەکانی ئایین. سودی ئەوانەی باسکران نایەنە ژمارە.

﴿ كَلَ فِي فَلَكِ يَسْبَحُونَ ﴾ هەموو یەکێ لە خۆرو لە مانگ لە چەرخ و بازنەی خۆیانا دێن و ئەڕۆن بۆ ئەو مەبەستەی خوای مەزن بۆی دروست کردوون. بە وێنەی مەلەوان بەسەر ڕوی ئاودا ئەڕوا، بە جۆرێکی شایستەو بێ کەم و کوڕی کاری خۆیان ئەکەن...... .

بۆزانین: هاتنی ڕاناوی واوی (یَسْبَحُونَ) کە بۆ زۆرتر لەو دوو شتە، خۆرو مانگ دووانن لەبەر ئەوەیە هەریەکە لە خۆرو لە مانگ جێگەی هەڵهاتنیان زۆرن و بەو مەبەستە بێژاوە (یَسْبَحُونَ) نەبێژاوە (یسبح)، هەروەها (واو) بۆ خاوەن ئەقڵ بەکار ئەهێنرێ و خۆرو مانگ بێ ئەقڵن لەبەر ئەوەیە ئەوەندە بەرێك و پێکی دێن و ئەڕۆن وەك خاوەن ئەقڵن وان .

کاتێ بت پەرستان پەکیان کەوتووە هیچ شتێکیان بە دەستەوە نەما پەکی پێغەمەر بخەن ووتیان: با چاوەڕوان بکەین موحەمەد بمرێ و ڕزگارمان ئەبێ لە دەستی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ خوای مەزن فەرموی:

﴿ وَما جَعَلْنا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدِ أَفَأنْ مِتَ فَهُمُ الْخالِدُونَ ﴾ وە ئێمە نەمان گێڕاوە بۆ هیچ ئادەمیزادێ پایەداری و بەردەوامی بۆی لە جیهاندا ونەمرێ، ئایا ئەگەر تۆ مردی بەر لە ڕاگەیاندنی پەیامی خۆت ئایا دوایی ئەوان ئەبن لە جیهانداو نامرن؟

﴿ كُلَ نَفْسٍ ذائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِ والْخَيْرِ فِتْنَةً وَإلَيْنا تُرْجَعُون ﴾ هەموو کەسێ ئەچێژێ تاڵی مردن لە جیهانداو دانیشتوان بە ڕاکردن لە مردن ڕزگاریان نابێ، بەرێزترین مردن ئەوەیە شەهید بکرێ لەبەر پەیداکردنی ڕاستی و نەهێشتنی خراپەو ئێمە ئێوە تاقی ئەکەینەوە بەشتێ پێیان ناخۆشەو بە شتێ لایان خۆشە بە تاقیکردنەوەیە شاراوەی دەرونیان دەربکەوێ بۆ ئادەمیزاد، دوایی ئێوە بۆلای ئێمە ئەگەڕێتەوە، هەر کەسێ لە کاتی خۆشی و هەرزانیدا وسوپاسی ئێمەی کردبێ وئارامی گرتبێ لە کاتی سەختیدا ئەوکەسە بە باوەڕدارێکی نیازپاك دائەنرێ و پاداشتی خۆی وەرئەگرێ و هەرکەسێ سوپاسی ئێمەی نەکردبێ سزای ئێمە وەرئەگرێ.

﴿ وَإذا رَأكَ الذيْنَ كَفَرُوا إنْ يَتخِذُنَكَ إلاّ هُزُواً أهذا الذي يَذْكُرُ أَلِهَتَكُمْ وَهُمْ بِذْكْرُ الرَحمنِ هُمْ كافِرُونَ ﴾ وەهەر کاتێ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا تۆیان بینی کە خراپە لە خواکانیان ئەگرێ و ئەڵێ: ئەو خوایانە بەردودەرەختن و سودو زیان نابەخشن و بانگیان ئەکەی بۆلای یەکێتی خوای مەزن ئەو بێ باوەڕانە تۆ بە هیچ شتێ وەرناگرن مەگەر گاڵتەکردن بەتۆو بەو بانگ کردنەی تۆ بۆلای ڕاستی، هەندێکیان بە هەندێ تریان ئەڵێن: ئا ئەو کەسەیە باسی خراپەی خواکانی ئێوە ئەکا بە خراپەو ئەڵێ: دارو بەردی ووشکن و، ئەو بێ باوەڕانە باوەڕیان بە باسی خوای خاوەن بەخشندە نیە کە پێغەمەران و نامەکانی ناردوە بۆلایان ئەو جۆرە کارانەی بێ باوەڕان جێگەی سەرسوڕمان نین، چونکە هەرکەسێ دوای سودی تایبەتی خۆی بکەوێ و لەسەر لاسایی کردنەوەی باو باپیری گەشەی کردبێ و بۆ مەبەستی خۆی ئیتر بت پەرستبێ یا ڕەگەز پەرستی بێ لای گرنگ نیە ناموسی و نیشتمانی خۆی بفرۆشێ .

خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ
ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ
إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ
لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا
هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا
يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ
بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ
يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ
ٱلرَّحۡمَٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ
لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ
أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ
وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي
ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بێ باوەڕانی ئەترسان لە پاشەڕۆژی بێ باوەڕی و بەوانی ڕاگەیاندن توشی سزای سەخت ئەبن ئەگەر بەردەوامبن لەسەر بێ باوەڕی کەچی ئەوان بێ فەرمانی خوای مەزنیان زۆرتر ئەکردو ئەیان ووت: ئەگەر ڕاستە با ئەو سزایە بێتە خوارەوە. خوای مەزن فەرموی:

﴿ خُلِقَ الأنْسانُ مِنْ عُجَلٍ ﴾ ئادەمزیاد دروست کراوە بە گوێرەی سروشتی لەوەی پەبە لە هاتنی شتێ ئەکا بەر لە کاتی پەیدابوونی لە هەندێ لە بیرو بۆچونیانا. خوای مەزن فەرموی پەلە مەکەن:

﴿ سَأُرِيكُمْ بِأياتي فَلا تَسْتَعْجِلُون ﴾ من نیشانی ئەدەم بە ئێوە تۆڵە سەندنەکانی من لە جیهاندا بە کوشتن و دیل کردنتان و لە ڕۆژی دوایدا بە سزای سەخت، دوایی ئێوە پەلە مەکەن بە هاتنی ئەو سزایە .

زۆرکەس هەن پەلە ئەکەن و ئەپارێنەوە بۆ هاتنی کارێکی ناهەموار کەچی ئەگەر ئەو کارە توشیان ببێ ئاوات ئەخوازن توشیان نەبوایە. ئەگەر خوای مەزن هەموو داخوازی ئادەمیزاد جێبەجێ بکا لە ڕوی زەویدا کەس نەئەمایەوە. بەڵام خوای گەورە بەویستی خۆی هەموو شتێ ئەکا نەك بە ویستی ئەوان .

﴿ وَيَقُولُونَ مَتى هَذا الْوَعْدُ إنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ ﴾ وەبێ باوەڕان ئەڵێن: چ کاتێ ئەو سزایە لە جیهان و لە پاشە ڕۆژدا دێت ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن دێت .

﴿ لَوْ يَعْلَمُ الذينَ كَفَرُوا حِينَ لا يَكُفُونَ عَنْ وجُهِهِمْ النارَ وَلا عَن ظُهُورِهِمْ وَلاهُمْ يُنْصَرُونَ ﴾ وەئەگەر بێ باوەڕان بزانن بە کاتێکی ئەوتۆ پەلەیان بۆ هاتنی ئەکرد کە ناتوانن لابدەن لە ڕومەت و پشتی خۆیان ئاگرێ دۆزەخ و ئەوان یارمەتیان نادرێ بۆلابردنی ئەو سزایە ئەوان ئەو داخوازیەیان نەئەکرد .

﴿ بَلْ تأتيهِمْ بغتة فَتبْهِتَهُمْ فَلا يَسْتَطِعُونَ رَدَها وَلاهُمْ يُنْظَرُونَ ﴾ بەڵکو دێت بۆلایان ڕۆژی دوایی و سزای ئاگری دۆزەخ کوتوپڕ لە ناکاودا، دوایی ئەو ڕۆژە سەرگەردانیان ئەکا، دوایی ناتوانن بیان گێڕنەوەو مۆڵەتیان نادرێ و دواناخرێن پەشیمان ببنەوەو باوەڕ بهێنن، وەك ئەوەی لە جیهاندا مۆڵەتیان ئەدراو بۆ ماوە بە دوائەخران هەتا پەشیمان ببنەوە.

موحەمەد تۆ هیچ نرخێ بۆ ئەو بێ باوەڕانە دامەنێ کە گاڵتەت پێ ئەکەن، ئەو کارە ناڕەوایانە لەگەڵ هەموو پێغەمەران کراوە، خوای مەزن دڵخۆشی پێغەمەرا ئەداتەوە ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ أسْتُهْزِىءَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ فَحاقَ بالذِيْنَ سَخَروا مِنْهُمْ ماكانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ وە بە ڕاستی گاڵتە کرياوە بە چەندين پێغەمەرا لە پێش تۆبوون. کەواتە تۆ ئارام بگرە وێنەی ئەو پێغەمەرانەی پێشوو، دوای دێتەخوارەوە بۆ سەرکەسانێکی ئەوتۆ گاڵتەیان بە پێغەمەران ئەکرد لەو بێ باوەڕانە سزای شتێ کە بەو شتە گاڵتەیان بە پێغەمەران ئەکرد. هەر بەوجۆرە تۆڵەی گاڵتە پێ کردنەکە چواردەوریان ئەگرێ.

﴿ قُلْ مَنْ يَكْلَؤُكُمْ بِالَّيْلِ وَالنهار من الرّحمن ﴾ تۆ بڵێ بە گاڵتەکەرەکان: چ کەسێ ئێوە ئەپارێزێ بەشەوا کاتێ ئێوە ئەخەون و بە ڕۆژا کاتێ ئەچنە دەرەوە بۆ پەیداکردنی هۆی ژیانی خۆتان لەسزای خوای خاوەن بەخشندە ئەگەر بیەوێ سزاتان بدات. بێگومان ئەو کەسە هەر ئەبێ خوای مەزن بێ.

﴿ بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِهِم مُعْرِضُونَ ﴾ بەڵکوئەو بێ باوەڕانە لە یادی خواو لە قورئان و لە ئامۆژگاری پەروەردگاری خۆیان ڕوویان وەرگێڕاوە وازیان لە فەرمودەکانی خوا هێناوە، لە جیاتی ئەوەی لە خوا بترسن گاڵتە بە پێغەمەران ئەکەن.

﴿ أمْ لَهُمْ آلِهَةٌ تُمْنَعهُمْ مِنْ دُونِنا لا يَسْتَطِعُونَ نَصْرَ أنْفُسِهِمْ وَلاهُمْ مِنا يُصْحِبُونَ ﴾ ئایا بۆ ئەو بێ باوەڕانە هەیە چەندین خوایە ئەوان بپارێزێ لە سزای ئێمەو لە بنەبڕکردنی ئەوان. خوای مەزن باسی لاوازی بێ نرخی ئەوخوایانەی ئەوان ئەکاو ئەفەرموێ: ئەو خوایانە توانای یارمەتیان بۆخۆیان نیەو ئەوان پەنایان نادرێ لەلایەن ئێمەوە سزایان نەدرێ. کەواتە چۆن ئەتوانن سزا لە کەس بگێڕنەوە کە خۆیان پەنایان نەدرێ .

﴿ بَلْ متَعْنا هؤلاءِ وَآباءَهُمْ حَتى طالَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ ﴾ بەڵکو ئێمە خۆشیمان داوە بەو بێ باوەڕانەو بە باوکەکانیان و بەرخوردارمان کردوون و مۆڵەتماندان هەتا درێژەی کێشا بەسەریاندا زیندەکانیان، دوای بەو مۆڵەتدانە یاخی بوون و بێ فەرمانی خوای مەزنیان کرد، نەیان ئەزانی خوای مەزن پلە بە پلە بەرزیان ئەکاتەوە بە جۆرێ نازانن پاشەڕۆژیان چۆن ئەبێ .

﴿ أفَلا يَرَوْنَ أنا نَأتي الأرْضَ نَنْقُصُها مِن أطْرافِها أفَهُمُ الْغـالِبُونَ ﴾ ئایا دوایی بێ باوەڕانی مەکە نازانن کە بە ڕاستی ئێمە زەوی بێ باوەڕان ئەدەین بە موسڵمانان و لە هەر چوار لاوە زەوی بێ باوەڕان کەم ئەکەینەوەو ئەیخەینە سەر زەوی موسڵمانان بەشی ئەوان زۆر ئەبێ، موسڵمانان نیشتمانی ئەوان داگیرئەکەن و جێگەیان پێ لەق ئەبێ، ئایا دوایی ئەوبێ باوەڕانە سەرناکەون بەسەر پێغەمەرو بەسەر باوەڕدارانداَ؟ بێگومان سەر ناکەون. خوای مەزن بەڵێنی داوە موسڵمانان مەکە داگیر ئەکەن و بێ باوەڕانی دانیشتوانی مەکە تاقم تاقم موسڵمان ئەبن .

قُلْ إِنَّمَا أُنذِرُكُم بِالْوَحْيِ وَلَا يَسْمَعُ الصُّمُّ الدُّعَاءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَهُم مِّنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ أَفَأَنتُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾

﴿ قُلْ إنما أنْذِركُمْ بِالْوَحْيِ وَلا يَسْمَعُ الصُمّ الدُعاءَ إذا ما يُنْذِرُون ﴾ تۆ بلّێ: بە ڕاستی من ئێوە ئەترسێنم لە سزا بەهۆی قورئانەوەو ئادەمیزادە کەڕەکان بانگ کردنی تۆ نابیسن بۆ باوەڕهێنان کاتێ بترسێنرێن. خوای مەزن فەرمانی داوە بە پێغەمەر بت پەرستان بترسێنێ لەهاتنی ڕۆژی دوایی و بلّێ هاتنی ڕۆژی دوایی بەهۆی سروشە باسی‌کراوە. بەلاّم ترسان کاریان تێ ناکاو نای بیسن وەك کەڕوانە، چونکە هەرکەسێ ئامۆژگاری خوا نەداتەوە کوێرو کەڕە با دوو چاو دووگوێچکەیشی هەبێ.

﴿ وَلَئِنْ مَسَتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذابِ رَبكَ لَيَقُولُنَ يا وَيْلَنا إنا كُنا ظالِمينَ ﴾ وە بە ڕاستی ئەگەر تووشی بێ باوەڕان ببێ بەشێکی کەم لە سزای پەروەردگاری تۆ، ئەو بێ باوەڕانە لە وەوبەر

گاڵتەیان بەو ترساندنە ئەکرد هەتا کاتێ سزایە تووشیان ئەبێ. بەڕاستی ئەو کاتە ئەڵێن: ئەی هاوارو گریان وەرە بۆلای ئێمە. بەڕاستی ئێمە ستەممان لە خۆمان کردووە باوەڕمان بە پێغەمەر نەهێناوە بەدرۆمان خستەوە، بۆیە ئێستا ئێمە تووشی ئەم سزایە بووین.

﴿ وَنَضَعُ الْمَوازِينَ الْقِسطْ لِيَوْمِ الْقِيامَةِ ﴾ وە ئێمە ترازووی داد پەروەری دائەنێین بۆ دانیشتوانی ڕۆژی دوایی زانایان بیروبۆچوونیان لەبارەی ترازووی ڕۆژی دوایی جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: مەبەست لە ترازوو فەرمانەکانی خواو دەستوری خوایە، خوای مەزن بەراوردی کردەوەکانی بەندەی خۆی بەهۆی فەرمانەکانی خۆیەوە ئەکا دوایی هەرکەسێ کارەکانی بە گوێرەی فەرمانی خواوە بوو، ئەو کەسە کێشراوەکانی قورسە، ئەگەر بە گوێرەی فەرمانەکانی خوای مەزن نەبوو کێشراوەکانی سووکە.

زانایانی پێشوو ئەڵێن: بەڕاستی خوای مەزن ترازووی ڕاستی دائەنێ لە ڕۆژی دوایدا کردەوەی بەندەکانی خۆی پێ ئەکێشێ. زۆرترین فەرمودەی زانایان لەسەر ئەوەن ترازووی ڕۆژی دوایی یەك ترازووە. بەڵام بەووشەی کۆمەڵ ئەیفەرموێ لەبەر ئەوەی کردەوە کێشراوەکان زۆرن.

﴿ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإنْ كانَ مِثْقالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرول أتَبنابِها ﴾ دوایی ستەم ناکرێ لە هیچ کەسێ هیچ شتێ ئەگەر کردەوەی ئەوکەسە بە ئەندازەی کێشانەی قورسایی دانەیە بێ لە تۆویی تەرەتیزە ئێمە ئامادە ئەکەین بۆ ئەو کەسەو پاداشتی پێ ئەدەینەوە.

﴿ وَكَفى بِنا حاسِبِينَ ﴾ وە بەسە بۆ ئێمە زانیاریمان بە هەموو شتێ وێنەی هیچ زانیاریە نیەو هیچ شتێکی لێ وون نابێ هەرچەندە ژمارەیشیان زۆربێ، هەموو کردەوەی ئادەمیزاد گەورە بن یان بچوك چاکبن یان خراپ لای ئێمە تۆمارکراوەو لەناو ناچێ و پاداشتیان وەرئەگرن.

لە توانای خوای مەزنە بۆ ئادەمیزادی دەرئەخا هەموو کردەوەکانیان و ترازووی چاکەو خراپیان و پاداشتی چاکەو خراپەیان لە تەنها چرکەی کات ژمێرێکا بۆ دەرئەخا. بەڕاستی تەرازووی ڕۆژی دوایی شتێکە ڕاستی زانیاری خوای مەزن و باوەڕ بە خواو شێوەکان وکارەکانی خوای مەزنیان پێ ئەزانرێ، فریشتەکان و نامەکان و پێغەمەرەکان و ڕۆژی دووایيان پێ ئەزانرێ، ترازووی ڕۆژی دوایی بریتیە لەو قورئانە خوای مەزن بەهۆی جبرەئیلەوە ناردویە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، دوایی بەهۆی فەرمانی قورئانەوە زانیاری ئادەمیزاد و ئەقڵ و گفتوگۆو کردەکانی بەراورد ئەکرێ، چاکەو خراپەی ئەناسرێ، دوایی ئەگەر کێشانەی چاکەکانی

قورسبێ ئەو کەسە بەختیارەو ئەگەر سوکبێ خاوەنەکەی بەدبەختە، ئەگەر چاکەو خراپەی ئادەمزیاد یەکسان بوون چاوەڕوانی فەرمانی خوای مەزن ئەکا یا لەو کەسە خۆش ئەبێ یا سزای ئەدا، بەڵام بەزەیی و لێبوردنی خوای مەزن لە هەمووشێ گەورەترە. هەموو شتێ ترازووی هەیە مەگەر ووشەی (لا إله إلا الله) کە ترازووی نییەو هیچ شتێ بەرامبەری ئەو ووشەیە ناکا مەگەر بێ باوەڕی کە ئەویش ترازووی نیە. بە ڕاستی قورئانی پیرۆز وەك خوانێ وایە هەموو خواردەمەنی نایاب و خواردەمەنی تریشی تێدایە، ئادەمیزادی ژیر چاکەکەیان هەڵئەبژێرێ بۆ خۆی و مرۆڤی بێ ئەقڵیش ئەوی تریان هەڵئەبژێرێ بۆ خۆی، بەڵام فەرمودەی خوا هەموویان چاکن.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنا مُوسى وَهارُونَ الْفُرْقانَ وَضِياءً وَذِكراً لِلْمُتَّقِينَ ﴾وە بە ڕاستی ئێمە بەخشیومانە بە موساو بەهارون نامەیە کە تەوراتە چاك و خراپی جوێ کردوەتەوەو ڕوناکیەو ڕێگەی ڕزگاری پێ ئەدۆزرایەوە ڕێزو ئامۆژگاریە بۆ ئەو کەسانەی خۆیان لە خراپە ئەپارێزن.

﴿ الذِيْنَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ وَهُمْ مِنَ السَّاعَةِ مُشْفِقون ﴾ خۆ پارێزێکی ئەوتۆن لە پەروەردگاری خۆیان ئەترسن و نهێنیە لەوان بە چاو نەیاندیوەو ئەوان لە هاتنی ڕۆژی دوایی وسامناکی ئەو ڕۆژە ئەترسن، بە جۆرێکی وا کە لەبەر چاویانابێ وایە .

﴿ وَهذا ذِكْرٌ مُبارَكٌ أَنْزَلْناهُ أَفأَنْتُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ ﴾ وە ئەم قورئانە ئامۆژگاریەکی پیرۆزە بۆ کەسانێ ئامۆژگاری وەرگرن ئێمەناردوومانەتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد، ئایا ئێوە بۆ باوەڕی پێ نایەرن، ئەو قورئانە پێچ و پەنامەیەکی تێدا نیە، ڕون و ئاشکرایە ئەگەر لەلای خوای مەزنەوە نەهاتایەتە خوارەوە ئایەتەکان دژی یەکتری ئەبوون .

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾

فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا مَن فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَينا إِبْراهِيمَ رُشْدَهُ مِنْ قَبْلُ وَكُنا بِهِ عالِمينَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە بەخشیومانە بە ئیبراهیم ژیری و شارەزایی چڕوپڕو بۆ چاکەی هەردوو جیهان لە پێش هاتنی موساو هارون. یا بەر لەوەی بالّغ ببێ و ئێمە زانیومانە کە شایەنی ڕانمویی وەرگرتن و پێغەمەرایەتیە. کەواتە خاوەنی چاکەی هەردوو جیهانە، خوای مەزن هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، پێغەمەرایەتی خوای مەزن ئەیبەخشێ و ئادەمزاد ناتوانێ خۆی پەیدای بکا.

﴿ إِذْ قالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ ما هذِهِ التَماثِيلُ الَتِي أَنْتُمْ لَها عاكِفُونَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیم ووتی بە باوکی و تاقمی خۆی لە دانیشتوانی بابول: ئەم پەیکەر بێ گیانانەی ئەوتۆ چ شتێکن ئێوە بەردەوامن لەسەر پەرستیان؟ ئێوە ژیرن و تێگەیشتنتان هەبێ ئەو پەیکەرانە خاوەنی سوودو زیان نین نەبۆ خۆیان و نە بۆ جگەی خۆیان .

﴿ قالُوا وَجَدنا آباءَنا لَها عابِدِينَ ﴾ ووتیان: ئێمە باوباپیری خۆمانمان دەست کەوتوە ئەو بتانەیان پەرستووەو ئێمەیش لاسایی ئەوان ئەکەینەوە ئەیان پەرستین. بێگومان ئەو جۆرە بیانوانە بەلّگەی کەسانێکن هیچ شتێکی بەنرخیان بەدەستەوە نەبێ جگەی لاسایی.

﴿ قالَ لَقَدْ كُنتُمْ وَآباؤُكُمْ في ضَلالٍ مُبِينٍ ﴾ ئیبراهیم فەرموی: بەراستی ئێوەو باوباپیرتان لە گومڕایی ئاشکراو هەلّەیەکی ڕوندان لە پەرستنی ئەو بەردە بێ گیانانەدا خووتان پێوەگرتوە.

﴿ وَقالُوا أَجِئْتَنا بِالْحَقِ أَمْ كُنتَ مِنَ اللاعِبينَ ﴾ تاقمەکەی ئیبراهیم ووتیان: ئایا تۆ بەشتێکی ڕاستە هاتووی بۆلای ئێمە یاتۆ لەو کەسانەی گالّتە بە ئێمە ئەکەی، ئەو شتەی تۆ ئەیلّێی زۆر دورە لەبیروباوەڕی ئێمەوە، بەلای ئێمەوە باو باپیرمان پاك و بێ هەلّەن و ڕاست ئەکەن لە پەرستنی ئەو بتانەدا.

﴿ قالَ رَبُكُمْ رَبُّ السَماواتِ وَالأَرْضِ الَذي فَطَرَهُنَ ﴾ ئیبراهیم فەرمووی: بەلّکو پەروەردگاری ئێوە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوین کەسێکی ئەوتۆیە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە بەبێ کەرەسەیە هەیانبووبێ .

﴿ وَأنا عَلَى ذلِكَ مِنْ الشّاهِدِينَ ﴾ وەمن لەسەر ئەو شتەی باسکران کە هەر خوا شایەنی پەرستنە بە تەنها دروست کەری ئاسمانەکان و زەویە شایەتی ئەدەم و گاڵتە بە ئێوە ناکەم و ئەتوانم بەسەر ئێوەدا سەربکەوم .

﴿ وَتاللهِ لأكِيدَنَ أصْنامَكُمْ بَعْدَ أنْ تُولّوا مُدْبِرينَ ﴾ ئیبراهیم لە دڵی خۆیا ووتی: سوێندم بە خوای مەزن: بە ڕاستی من ئەمەوێ خراپەیە لەگەڵ بتەکانی ئێوەدا بکەم و بتەکانتان بشکێنم دوای ئەوەی ئێوە چونە دەرەوە بۆ ڕابواردن لە چەژنداو پشتان کردە من و لە نهێنیدا بتەکانتان پارچەیان بکەم. ئەو گەلە وایان خوپێوە گرتبوو هەموو کاتێ لە کاژوان بهاتنایەوە یەکەم جار ئەچوون بۆلای بتەکان و کورنوشیان بۆ ئەبردن .

﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذاذاً إلاّ كَبِيراً لَهُمْ لَعَلَهُمْ إلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾ دوای ئەوان چوونە دەرەوە تەورێکی هەڵگرت و هەموو بتەکانی ئەوانی گێڕا بە پارچە پارچە و بڵاوی کردنەوە بەسەر زەویدا جگە لە بتە گەورەکەی ئەوان نەبێ نەی شکاندو تەورەکەی نا بەسەر شانیەوە، بۆ ئەوەی گەڕانەوە بۆلای ئەو بتە گەورەیە پرسیاری لێ بکەن چ کەسێ ئەو بتانەی شکاندوە. زۆر ئاشکرایە ئەگەر ئەوبتە خوای گەورە بێ بە گومانی ئەوان ئەبێ وولامیان بداتەوە چۆن ئەو بتانە پارچە پارچە بوون و بۆ بەرگری لێ نەکردوون؟.

﴿ قالُوا مَنْ فَعَلَ هذا بِالِهَتِنا إنَهُ مِنَ الظالِمينَ ﴾ تاقمەکانی نەمرود ووتیان: هەرکەسێ ئەو بتانەی ئێمەی شکاند وە بە ڕاستی ئەو کەسە ستەمێکی زۆر سەختی کردووە لەبەر ئەوەی ئەو تاوانە گەورەیەی کردوەتە سەر ئەو خوایانەی ئێمە .

﴿ قالُوا سَمِعْنا فَتىً يَذْكُرُهُمْ يقالُ لَهُ إبْراهِيمُ ﴾ ئەو تاقمانە بەنەمردویان ووت: ئێمە بیستومانە لاوێ هەیە باسی خواکانی ئێمەی کردووە بە خراپە و جنێویی داونەتێ، بەو لاوە ئەبێژرێ ئیبراهیم، لەوانە نیە ئەوکارە ناهەموارە ئەو کردبێتی.

قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ

رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾

﴿ قالُوا فأتُوا بِهِ عَلَى أعْيَنَ النّاسِ لَعَلَهُمْ يَشْهَدُونَ ﴾ نەمرودو کاربەدەستەکانی خۆیان ووتیان: دوایی ئیبراهیم بهێنن لەبەرچاوو لەبەردەم ئادەمیزادا دای نێنن، نەمرود لای چاك نەبوو یەکسەر سزای بدا، بۆیە ووتی، بۆ ئەوەی دانیشتوان بیناسنەوەو شایەتی بدەن کە ئەوە جنێوی داوە بە خواکانی ئێمە. ئیبراهیمان هێناو پرسیاریان لێ کرد: ئایا تۆ ئەو کەسەی بتەکانی ئێمەت شکاندووەو ڕزاڵ ڕزاڵت کردوون؟ کاتێ ئیبراهیمیان هێنا:

﴿ قالُوا أأنْتَ فَعَلْتَ هذا بِالِهتِنا يا إبراهِيمُ قالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبيرِهُمْ فَأسْألُوهُمْ إن كانُوا يَنْطِقُونَ﴾ بە ئیبراهیمان ووت کاتێ ئامادەیان کرد: ئایا تۆ ئەو کارەت کردووە بە خواکانی ئێمەی وشکاندوتن ئەی ئیبراهیم؟ ئیبراهیم ووتی:

ئەو کارە بتە گەورەکەیان کردویەتی و ڕقی لەوان هەڵساوەو لای گران بووە خوابێ تر هەبێ جگەی خۆی، دوایی ئێوە پرسیار لەو خوایەتان بکەن: چ کەسێ ئەو کارەی کردوە ئەگەر ئەوان گفتوگۆ ئەکەن.

﴿ فَرَجَعُوا إلى أنْفُسِهِمْ فَقالُوا إنَكُمْ أنْتُمْ الظالِمُونَ ﴾ دوایی گەڕانەوە بۆلای ئەقڵی خۆیان، دوایی هەندێکیان بە هەندێ تریان ووت: بە ڕاستی ئێوە ستەمتان لە خۆتان کردوە بەو پرسیارەتان و بە پەرستنی شتێ گفتوگۆ نەکاو سوود نەبەخشێ و زیان نەگێرێتەوە، نەك ئیبراهیم

وەك ئێوە ئەیلێن: ستەمی کردووە لە دوایدا خۆیان بۆیان دەرکەوت کە بە ڕاستی نەزانن و ئیبراهیم ڕاست ئەکا. بەڵام کتوپڕ گەڕانەوە بۆلای کردەوە خراپە پێشوەکەی خۆیان، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ نُكِسُوا عَلَى رُؤُسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ ما هؤُلاءِ يَنْطِقُونَ ﴾ لە پاشا گەڕێنرانەوە بۆلای بێ باوەڕی خۆیان و بۆلای کارە پوچەکەی خۆیان وەك ئیبراهیم فەرموی: ئەگەر گفتوگۆ ئەکەن ووتیان: بە ئیبراهیم: تۆ چۆن فەرمان ئەدەی بە ئێمە پرسیار لەو بتانە بکەین. بەڕاستی تۆ ئەزانی ئەوان کفتوگۆ ناکەن. سەرگەردان بوون .

﴿ قالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِنْ دونِ اللهِ مالا يَنْفَعُكُمْ شَيْئاً وَلا يَضُرُكُمْ ﴾ ئیبراهیم فەرموی: ئایا دوای ئەوەی ئێوە ئەزانن گفتوگۆ ناکەن ئێوە چۆن ئەپەرستن لە جگەی خوا، ئایا دوایی ئێوە بیرناکەنەوە لەو کارە خراپانەی خۆتان کە ئەو بتانە شایەنی پەرستن نین. بت پەرستان کە هیچیان بۆ نەمایەوەو پەکیان کەوت.

﴿ قالُوا حَرِقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إنْ كُنتُمْ فاعِلِينَ ﴾ ووتیان. ئێوە ئیبراهیم بسوتێنن و ئاگر سەختترین شتە بۆ ئازاردان و یارمەتی خواکانتان بدەن و تۆڵە لە ئیبراهیم بکەنەوە، هەتا کەسی تر نەتوانێ کاری بەو جۆرە بکا ئەگەر ئێوە ئەتانەوێ یاریدەی خواکانتان بدەن و تۆڵە لەو کەسە بکەنەوە گاڵتە بە خواکانتان ئەکاتەوە، خۆ خواکانتان ناتوانن تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، ئەوکارەی بەسەر ئەو بت پەرستانە هات و ئەوەی ئەوان ووتیان وەستانیانە لەسەر سەری خۆیان و قاچیان بەرەو ژوربێ. دوایی چاڵێکی زۆر گەورەو قوڵیا کەند، ماوەیەکی درودرێژ درەخت و پوش و سوتەمەنیان کۆکردەوە ئاگریان تێ بەردا، بەجۆرێ ئەگەر باڵندەیە لە بەرزایی ئەو چاڵەدا بڕۆیشتایە پەڕو باڵی ئەسوتاو ئەکەوتە خوارەوە، بەدورهاوێژی ئیبراهیمیان فڕێدایە ناو ئەو چاڵە بە بەدەست و پێ بەستراویی .

﴿ قُلْنا يا نارُكُوني بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إبْراهِيْم ﴾ ئێمە ووتمان ئەی ئاگر تۆ ساردبەرەوەو گەرماکەت نەمێنێ و ساردیەکەت بێ ئازاربێ لەسەر ئیبراهیم نەوەك ڕەق بێتەوە، ساردبوونەوەی ئاگر کارێکی پەك خەربوو خوای مەزن کردی بۆ ئیبراهیم .

﴿ فَأَرادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْناهُمُ الأَخْسَرِيْنَ ﴾ دوایی نەمرود دووپیاوانی نەمرود ویستیان پیلانێکی گەورە بسازێن بۆ ئیبراهیم و لە ناوی ببن بەو ئاگرەو بسوتی، دوایی ئێمە ئەوانمان گێڕا لەو کەسانە زیانیان پێ بگاو بە ئاواتی خۆیان نەگەیشتن، دوایی ئێمە ڕەوانەمان کردەسەری ئەو

گەلە مێشولەو بەو مێشولانە لەناوچوون. مێشولەیەچووە ناو مێشکی نەمرودەوە مۆخ و خوێنی نەمرودی خواردو لەناوچوو، ئەویە سزای کەسانێ بێ فەرمانی خوای مەزن بکەن.

بۆزانین:خوای مەزن و فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕونیان نەکردۆتەوە ئەو کەسەی ووتویە: ئیبراهیم بسوتێنن لە چ ڕەگەزێ بووە، چاك وایە هەواڵەی زانینی خوای بکەین. بەلاّم زانای بەرز (نیزامەدینی) نەیسابوری لە تەفسیرەکەی خۆیا (غرائب القرآن ورغائب الفرقان) ئەڵێ وامەشهورە ئەو کەسە نەمرودی کوڕی کەنعان کوڕی سەنجاریب کوڕی نەمرودوو کوڕی کوش کوڕی سام کوڕی نوح بوو. زانایانی تر ئەڵێن: ئەو کەسە کورد بووە ناوی (هەینون) بووە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەو زانایانە بە جۆرێ باسی کورد ئەکەن شایەنی مرۆڤی موسوڵمان نیە، بێگومان ئەو بیروبۆچوونانەی ئەوان لە ڕەگەز پەرستیوە هاتووە. زۆربۆی داچین ئیبراهیم و نەمرودو ئەو کەسەیش کوردبوون، ئیتر بۆ ئەبێ باسی کورد بکرێ بە خراپە؟.

وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِي رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ

وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾

﴿ وَنَجَيناهُ وَلُوطاً إلى الأرْضِ التي بارَكْنا فِيها لِلْعالَمِينَ ﴾ وە ئێمـە ئیـبراهیم و لـوتمـان ڕزگـار کرد لـە عێراقەوە بڕۆن بۆلای زەوێکی ئەوتۆ ئێمە پیرۆزی و فەڕمان دروست کردبوو لەناوئـەو زەویەدا بۆ هەموو بونەوەران.

کورتە باسێ لـە بەسەر هاتی ئیبراهیم و لوتی برازای ئیبراهیم: ئەوەبوو نەمرود ویستی ئـازار بگەیەنێ بە ئیبراهیم، خوای مەزن ئەو پیلانەی ئەوانی پوچ کردەوە. ئیبراهیم دوای ڕزگـاربوونی لـە سوتان بە ئاگر خۆی و لوتی کوڕی هاران برای گەورەی ئیـبراهیم و خـاتوون سـارای ژنـی ئیبراهیم وکچی هارانی مامی ئیبراهیم چوون بۆ شام، ئیبراهیم لـە (حەڕان) و هەندێ جێگەی تـر لـەشامدا نیشتەجێ بوون.

لـوتی برازایشی لـە (موئتە فیکە کە شەوو ڕۆژێ لـە یەکـەوە دووربـوون دانیشـت. پـیرۆزی شام ئەوەیە: جێگەی بلاوبوونەوەی زوربەی زۆری پێغەمەرانەو شوێنی بلاوبوونەوەی دەستوری خوای مەزنە. جێگەی ئەوان ئاوی شیرین و درەختی بەردارو میوەی زۆرو هـەرزانی و کـەش و هەوای مام ناوەندی و زۆرشتی تریش بووە.

بۆ زانین: کۆچ کردنی ئیبراهیم ئەوەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە ئیـبراهیم و پێغەمـەری ئیسـلام ﴿ﷺ﴾ خۆیان و تاقمەکانیان و وێنەی یەکن، تـاقمی هـەردووکیان بـت پەرسـتبوون و هـەوڵی کوشتنی ئەوانیان داوە، بە گوێرەی فەرمانی خوای مەزن ئیبراهیم و موحەمەد کۆچیان کردووەو نیشتمانی خۆیانیان بەجێ هێشتووە بۆ بلاوکردنەوی ئاینی خـوای مـەزن و ڕێگـەی کۆچـی بـۆ ئامادەکردن.

﴿ وَوَهَبْنا لَهُ إسْحاقَ وَيَعْقُوبَ نافِلَةً وَكُلاً جَعَلْنا مِـنَ الصّـالِحين ﴾ وە ئێمـە بەخیشـومانە بـە ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی لـە خاتوون سارای ژنی و ئامۆزای لـەسەر وەرگرتنی پاڕانەوەی ئیبراهیم و پێشمان بەخشیوە یەعقوبی کوڕەزای بە دیاری و بەخشش بۆی لـە لایـەن ئێمـەوە: ووشـەی

(فافِلَةً) هاتووە بە مانای بەخشش و بە مانا کوڕی کوڕ، وە ئێمە هەموویانمان گێڕان بە پیاوچاك و کردمان بە پێغەمەر.

﴿ وَجَعَلْناهُمْ أئمَةً يَهْدُونَ بِأمْرِنا ﴾ وە ئێمە ئەوانمان گێڕا بە پێشەوانانی ئادەمیزاد و چاو لێ کراوی ئەوان بانگی ئادەمیزاد بکەن بۆلای ئاینی ئێمە بە گوێرەی سروش و فەرمانی ئێمەو شارەزای یاسای ئێمەیان بکەن.

﴿ وَأوْحَينا إلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْراتِ ﴾ وەئێمە سروشمان نارد بۆلایان بۆ کردنی هەموو چاکەیە و ئادەمیزادیش هان بدەن بۆ کردنیان و دوربن لە هۆز پەرستی و لە ڕەگەز پەرستی و هاوبەشدانان بۆ خوای مەزن، بە نیازی پاکەوە هەر خوا بپەرستن.

﴿ وَإقامَ الصَلاةِ وَإيتاءَ الزَكاةِ وَكانُوا لَنا عابِدينَ ﴾ وە ئێمە سروشمان نارد بۆلایان و فەرمانمان پێدان نوێژەکان بەرپا بکەن و بیانپارێزن و زەکاتەکانیان بدەن بە هەژاران، ئەم ئایەتە بۆمان ڕون ئەکاتەوە کەنەتەوەکانی پێشوو نوێژ و زەکاتەکانیان لەسەر پێویست کراوە. بەڵام هەریەکەیان بە شێوەیەکی تایبەتی خۆیان، نەك وەك نوێژو ڕۆژووانەی پێویست کراوە لەسەر پێغەمەری ئیسلام و، ئەو پێغەمەرانە پەرستنیان بۆ ئێمە ئەکرد بە تەنها و بە نیازی پاکەوەو خوای مەزنیان بەیەك دائەنا .

﴿ وَلُوطاً آتَيْناهُ حُكْماً وَعِلْماً ﴾ وە ئێمە بە لوتمان بەخشیو دادپەروەری و لابردنی ناکۆکی نێوان ئادەمیزادو زانین و ناسینی ئەو شتانەی پێویستبوە کردنیان و فێریان بکا بە ئادەمیزاد.

﴿ وَنَجَيْناهُ مِنْ الْقَرْيَةِ التي كانَتْ تَعْمَلُ الْخائِث ﴾ وە ئێمە لوتمان ڕزگار لە دانیشتوانی ئەو گوندەی ئەوتۆ کارە پیس و بێز لێ کراوەکانیان ئەکردو ئەچونە لای پیاوان و وازیان لە ژنان ئەهێنا. ئەو گوندە بریتی‌یە لە شاری (سەدوم) ناویش ئەبرا بە شاری لوت یا مۆتە فیکە و بریتی بوو لە حەوت گوند.

﴿ إنَهُمْ كانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فاسِقِينَ ﴾ بە ڕاستی دانیشتوانی ئەو گوندە تاقمێکی کردەوە خراپ بوون، لایاندابوو لە سنوری دیاری کراوی خوای مەزن، لە ئایەتی (٨٠)ی سورەتی ئەلئەعراف و ئایەتی (٧٧)ی سورەتی هودا باسی ئەو تاقمە کراوە. ئەو گوندە بەخۆی و دانیشتوانی سەرێوە خوای مەزن ژێراو ژێری کردن و لە ناوی بردن بە ناو زەویدا .

﴿ وَأدْخَلْنا في رَحْمَتِنا إنَهُ كانَ مِنَ الصّالِحينَ ﴾ وە ئێمە لوتمان خستە نێو دانیشتوانی بەهەشتی ئێمە و پاداشتی چاکەی خۆمانەوە. بەراستی لوت لە پیاو چاکان و لە پێغەمەرانە.

﴿ وَنُوحاً إذ نادى مِنْ قَبْل فَأستَجَبْنا لَهُ وَنَجَيْناهُ وَأهْلَهُ مِنَ الكَرْبِ الْعَظيـمِ ﴾ وە ئێمە نوحمان ڕزگار کرد کاتێ پاڕایەوە لە خوای مەزن لە پێش ئیبراهیم و لوت و ئیسحاق و یەعقوبەوە، دوایی ئێمەو وەڵامی پاڕانەوەی نوحماندایەوەو، ئێمە نوح و خێزانەکەیمان ڕزگار کردبوو لە خەفەتێکی گەورە کە خنکانیان بوو بە ئاوی لافاو.

﴿ وَنَصَرْناهُ مِنَ الْقَومِ الذيْنَ كَذَبُوا بِأياتِنا إنَهُمْ كانُوا قَوْمَ سُوءٍ فَأغْرَقْناهُمْ أجْمَعِينَ ﴾ وە ئێمە نوحمان پاراست لە ئازاری تاقمێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە نیشانە ئاشکراکانی ئێمە نەهێنابوو. بەڕاستی ئەوان تاقمێکی خراپەکار بوون و بت پەرستبوون. دوایی ئێمە ئەوانمان خنکان بە لافاوو بنەبڕمان کردن. وەك لە ئایەتی (٢٥) هەتا ئایەتی (٤٩)ی سورەتی هودا باسکرا کە نوح (٩٥٠) ساڵ لەنێو ئەو تاقمەدا مایەوەو ئامۆژگاری کردن و سوودیان لێ وەرنەگرت و گاڵتەیانی پێ ئەکردو ئازاری زۆری چێشت بەدەستیانەوە دوایی خوا بە لافاوو لە ناوی بردن .

زانایان ئەڵێن: دوو پیاو چوونە لای داود پێغەمەر بۆلابردنی کێشەی نێوانیان: یەکێکیان خاوەنی کشتوکاڵ بوو، ئەوی تریان خاوەنی مەڕبوو، خاوەن کشتوکاڵەکە ووتی: بە ڕاستی مەڕەکانی ئەم پیاوە کشتوکاڵەکەی منیان خواردووە لە شەودا، دوای ڕون بوونەوەی داوەکەی داود فەرمانی دا بە خاوەن کشتوکاڵەکە مەڕەکان ببا بۆ خۆی لە جیاتی خواردنی کشتوکاڵەکەی، کاتێ سولەیمانی کوڕی داود بەو فەرماندانەی داودی زانی، ووتی: ئەی باوکی خۆم: چاکترین شت بۆئەم دووپیاوانە ئەوەیە: خاوەن زەوی‌یەکە مەڕەکان ببا سودیان لێ وەربگرێ نەك بیانبا بۆ خۆی، خاوەنی مەڕەکانیش زەویەکە دابچێنێ هەتا وەکجاری پێشووی لێ دێ،ئەو کاتە خاوەن مەڕ مەڕی خۆی بباتەوە خاوەن زەویش زەوی خۆی وەربگرێتەوە بۆلای خۆی، دوایی داود بیرو بۆچوونی کوڕەکەی خۆی پەسەندکرد. بێگومان پێغەمەران بێ گوناهن و بە دژی فەرمانی خوای مەزن فەرمان نادەن، بۆیە زانایان هەندێکیان ئەڵێن: فەرماندانی داود ڕاستبووە. بەڵام خوای مەزن فەرمانەکەی داودی گۆڕی بە فەرماندانی سولەیمان، ئەوەتا خوای مەزن فەرموی:

﴿ فَفَهَمْناها سُلَيْمانَ ﴾ کەواتە هەردووکیان بێ فەرمانی خوای مەزنیان نەکردووە .

بیروبۆچوونی زانایان لەم ڕووداوەدا بەم جۆرەیە: لای شافعی پێویستە ئەوەی لە شەودا لە ناو بدرێ ئەبێ ببژێرێ چونکە بە شەوا خاوەن ئاژەڵ ئەبێ ئاژەڵەکانی ببەستێتەوە لای حەنەفی نەبەشەواو نە بە ڕۆژدا زامن نابێ مەگەر کەسێکیان لابێ و چاودێریان بکا. بۆ ڕون کردنەوەی ئەو ڕووداوە خوای مەزن ئەفەرموێ:

وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾

فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾

﴿ وَداوُدَ وَسُلَيْمانَ إِذْ يَحْكُمانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتَ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمَ وَكُنا لَحُكْمِهِمْ شاهِدِيْنَ ﴾ وە تۆ بیری داودو سولـەیمان بکەرەوە کاتێ فەرمانیان ئەدا لـە بارەی زەوێکی کێڵراو تۆوی پێـدا کرابوو سەوز بوو کاتێ مەڕی تاقمێ لـە ئادەمیزاد بەشەودا سەوز بوی تاقمێ تریان لـە ئادەمیزاد خوارد، خاوەنەکانیان چوبونە لایان فەرمان بدەن بە چارەسەرکردنی ئەو ڕووداوەو ئێمە ئاگامان لـە فەرماندانی داودو سولـەیمان بوین و ئاگایشمان لـە فەرمان بۆ دراوەکانبووە .

﴿ فَفَهَمْنا ها سُلَيمانَ ﴾ دوایی ئێمە فێری سولـەیمانمان کرد فەرمانی دیاری کراو خۆمـان بـۆ بڕینەوەی کێشەی ئەو دوو تاقمە.ئەوەبوو سولـەیمان فەرموی: چاکتر بـۆ هـەردوولایان ئەوەیـە: خاوەن کێڵراوەکە مەڕەکان بباتە لای خۆی سوود لـە شیرو خوری و موی مەڕەکان وەربگرێ، خـاوەن مـەڕەکانیش زەویەکـە ببـاو دای چێنـێ هـەتا وەك جـاری پێشـــووی لێ دێ، دوایـی هەریەکەیان ئەوەی خۆیان ببنەوە.

﴿ وَكَلاً آتَيْناهُ حُكْماً وَعِلْماً ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بەهەر یەکە لــە داودو لـە سـولـەیمان و دادپەروەری لـە فەرمانداناو کردنمان بە پێغەمەرو فێرمان کردن زانینی چارەسـەرکردنی کێشـەی ئادەمیزاد بە گوێرەی یاسای ئێمە، دوربێ لـەلایەن گیریی و ئارەزۆی تایبەتی. زانا بـەرزەکان لــە

بارەی خواردنی ئاژەڵ کشتوکاڵی ئـادەمیزادە بیروڕایـان ئەوەیـە ئەگـەر خـاوەن کەمتەرخـەمی نەکردن زامن نابێ، ئیتر ڕۆژبێ یا شەو بێ، ئەگینا زامنە .

﴿ وَسَخَرْنا مَعَ داوُدَ الْجِبالَ يُسَبِحْنَ وَالطَيْرَ وَكُنا فاعِلِينَ ﴾ وە ئێمـەکێوەکان و باڵندەکانمـان ڕام کردبوون پاك و بەرزی دەربڕن بۆ خوای مەزن لـەگەڵ داوودا، ئیتر دەربڕینی ئـەو پـاکی و بەرزیە بە زمانێ بێ وەك ئێمە یا زمانێکی تایبەتی بێ خوادا بێیەتی بـەو کێوانـەو بـەو باڵندانـە و ئێمە ئەتوانین هەموو شتێ بکەین بۆ پێغەمـەران بـالای ئـادەمیزاد شـتێکی سەرسـوڕێنەر بـێ بـە گوێرەی سروشتی ئاسایی، بە وێنەی ساردکردنەوەی ئاگر بۆ ئیبراهیم.

﴿ وَعَلَمْناهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُـمْ شـاكِرُونَ ﴾ وە ئێمـە داودمـان فێری دروست کردنی زرێ چنین کرد بۆ سوودی ئێوە لـە بەرئـەوە ئێـوە بپـارێزێ لـە جـەنگی دوژمنی خۆتانا. یانێ بیکەنە بەرتان لـە کاتی جەنگ کـردن بـە شمشـێرو خەنجـەرو شـتی تـردا، دووایی ئایا ئێوە بۆ سوپاسی خوا ناکەن، یانی ئەبێ سوپاسی خوا بکـەن ئەگێڕنـەوە داود خـۆی وابوو خۆی ئەگۆڕاو بە جۆرێ تەنیاسن و بزانێ دانیشتوانی چۆنن. ڕۆژێ تووشی بوو بە تووشی پیاوێ کەوە پرسیاری لێ کرد ڕەوشتی داود چۆنە؟ پیاوەکە ووتی: پاشـایەکی چاکـە ئەگـەر بـە دارایی باوەڕداران نەژی، دوایی داود سوێنی خوارد لـەمەودوا ئەبێ بە دەسـت کـەوتی ئـارەقی ناوچەوانی خۆی بژی.

دوای ئەوە خوای مەزن ئاسنی بۆ نەرم کردو فێری چنینی زرێ کردو ئەیفرۆشت بـە نرخـی ئەوزرێیە ئەژیا. پێغەمەری ئیسلامیش کۆچـی دوایـی کـردو زرێکـەی لـە گرەویـی چەندمـەنێ جۆدابۆوە کەچی هەموو دارایی نێوە دورگەی عەرەب لـەژێر دەستیابووە. ئەوەی شایانی باسـبێ دادو زۆر دەنگی خۆشیوە.

﴿ وَلِسُلَيْمانَ الرِيحَ عاصِفَةً ﴾ وە ئێمە ڕامان کردبوو بۆ سولـەیمان بایەکی زۆر تیـژڕەو تـاقی بەیانی بە ئەندازەی ڕۆیشتنی ئاسایی مانگە ڕێگەیە ئەی بردو تاقی ئێوارەیش مانگە ڕێی بۆ هەر جێگەیە بیوستایە .

﴿ تَجْری بِأَمْرِهِ إِلَى الأرضِ التِي بارَكْنا فِيها وَكُنا بِكُلِ شَـيْءٍ عـالِمِينَ ﴾ ئـەو بابـە بـە هـۆی فەرمانی خوای مەزنەوە سولـەیمانی بەخۆی و بارەگایەوە ئەبرد لـەهەر جێگەیە بوایە بۆلای زەویە ئێمە پیرۆزی و فەرمان لـە نێویدا دانابوو، ئەو زەویەیش بریتی بوو لـە شام کە پیرۆز بوو بە هۆی

ڕوباری ئاوی شیرین و درەختی خاوەن بەرهەم و جێگە بڵاوبوونەوە پێغەمەرانبو بە زۆری و ئێمە بە هەموو شتێ ئەزانین و هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێن وئەو بایە بە ئاسانی و بەبێ ئازار سولەیمانی هاتوچۆ پێ ئەکرد.

﴿ وَمِنَ الشَّياطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ ﴾ وە ئێمە ڕامان کردبوو بۆ سولەیمان هەندێ لە شەیتانەکان کەسانێ خۆیانیان ئەکرد بە قوتابە نێودەریاکاندا و ئەچوونە بنیانەوە زۆر شتی نایاب و بەنرخیان دەرئەهێنا بۆ سوودی سولەیمان وەك لوئلوئو مەرجان و دوڕ.

﴿ وَيَعْمَلُونَ عَمَلاً دُونَ ذٰلِكَ وَكُنا لَهُمْ حافِظِينَ ﴾ وە ئەو شەیتانانە لە جگەی چونیان بۆ ناو دەریا کاری زۆر شتی گەورەی تریان ئەکرد وەك دروست کردنی کۆشك و مزگەوت و شتی تری سەرسوڕێنەرو ئێمە چاودێری ئەو شەیتانەنەمان ئەکرد کە سەرپێچی لە فەرمانی سولەیمان نەکەن و کاری ناڕەوا نەکەن.

ئەیوبی کوڕی ئەموس کوڕی تاریخ کوڕی ڕوم کوڕی غیس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و دایکی لە بنەماڵەی لووتە پێغەمەرێ بوو ناوی بڵاو بووەبووە کە زۆر لە خوا ترسەو هەتیو بێوە ژنانی بەخێو ئەکرد، زۆر میوان پەزێربوو ڕێزی لێ ئەگرتن، سامان و کوڕی زۆری هەبوو، پیاوێکی وابوو لە چاکیدا وێنە پێ ئەهێنرایەوە، زۆر خۆڕاگربوو لەسەر ئازارو نەخۆشی دورو درێژ. خوای مەزن ئەیوبی تاقی کردە بۆ دانیشتوان هەژاری کردو خانوو مناڵەکانی لێ سەندەوە، نەخۆشی و ئازاری توشی لەش و دەرونی کرد بە دورو درێژ. بەڵام ئەیوب هەر ئارامی گرت و بێ سوپاسی خوای مەزنی نەکرد. کاتی نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا پاڕایەوە لە خوای مەزن ڕزگاری بکا لەو نەخۆشیە، خوای گەورە پاڕانەوەکەی لێ وەرگرت، لەش ساغ بوو سامان و کوڕەکانی پێ بەخشیەوە زۆرتر لە جارانی پێشوو.

پێویستە ئەمەیش بزانرێ ئەو شتەی چیرۆك نوسان ئەی گێرنەوە لە ئەیوبەوە کە خوانەخواستە لەشی هەموو. تووشی برینداری بوبو بە جۆرێ کێم و زوخ بە لەشیا هاتوەتە خوارەوە، گۆشتی پارچەپارچە بە گەنیوی ئەکەوتە خوارەوەو ئەبو بە خواردەمەنی کرم، وای لێ هاتبوو دانیشتوان بێزی لێ بکەنەوە، لە چۆڵەوانیدا فڕێ درابوو، ئەوانە هەموویان ڕاست نین و درۆن لە ڕێزو پلەو پایەی پێغەمەرایەتی، خوای مەزن پێغەمەرانی خۆی و واڵێ ناکا دانیشتوان بێزی لێ بکەنەوە، بۆ ڕون کردنەوەی بەسەرهاتی ئەیوب خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِي رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُۨجِي ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩١﴾

﴿ وَأيوبَ إذ نادى ربَهُ أني مَسَني الضُرُ وَأنتَ أرْحَمُ الراحمينْ ﴾ وە تۆ بیری ئەیوب بکەرەوە کاتێ پاڕایەوە لە پەروەردگاری خۆی، ووتی: بەڕاستی بە من گەیشتوە ئازاری سەخت، بە بۆنەی ئازاری لەشم و لە ناوچوونی منالّ و سامان مەوەو بە ڕاستی تۆ خاوەن بەزەیی و میهرەبانترینی هەموو خاوەن بەزەییەکانی.

﴿ فَاسْجَبْنا لَهُ فَكَشَفْنا ما بِهِ مِنَ ضرٍ وَأتَيناهُ أهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنا وَذِكْرى لِلْعابِدِيْنَ ﴾ دوایی ئێمە وەڵامی پاڕانەوەکەی ئەومان دایەوە، دوایی لامان برد شتێ تووشی ئەو بوبو لە ئازارو لە نەخۆشی و ئێمە بەخشیومانەوە بە ئەیوب خێزانەکانی و بۆمان زیندو کردنەوە هەر لە جیهانداو پێشمان بەخشی وێنەیە تری خێزانەکانی لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا لەکوڕو کوڕەزاو سامانی تر، یانی بوون بە دوو ئەوەندی بەر لە نەخۆشیەکەی لەبەر میهرەبانی و چاکەکردن لەلایەن ئێمە لەگەڵ ئەیوبو لەبەر ئامۆژگاری کردن بۆ هەموو خواپەرستانی تر جگەی ئەیوب هەتا بزانن هەرکەسێ خۆی ڕاگرێ لەسەر ئازارو ناسوپاسی خوای مەزن نەکا بە وێنەی ئەیوب پاداشت وەرئەگرێ .

﴿ وَإسْماعيْلَ وإدْريسَ وَذا الْكَفِيلِ كلٌ مِنَ الصّابِرينَ ﴾ وەتۆ بیری ئیسماعیل بکەرەوە کە ئارامی گرت بۆ سەربڕینی خۆی و لەسەر دانیشتنی لە جێگەیەکی گەرمی بێ ناوو بێ شینایی و لەسەرماندوبوونی بۆ دروست کردنی کەعبەی پیرۆزو بیری ئیدریسی کوڕی شیسی کوڕی ئادەم بکەرەوە کە ئارامی گرت بە بەردەوامی لەسەر پەرستن و پاڕانەوە لە خوای مەزن لەناو گەلێکی بێ باوەڕداو بیری زولکیفل بکەرەوە کە ئارامی گرت لەسەر نوێژو ڕۆژو بەبێ کۆڵدان، ناوبراوە بە زولکیفل یانێ خاوەنی بەشی گەورەیە لای خوای مەزن. زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە: ئایا زولکیفل پێغەمەرە یانە؟ زۆربەی زۆریان لایان وایە پێغەمەرە، هەندێکیان ئەڵێن: دۆست و پیاوچاکی خوایەو پێغەمەر نیەو خاوەنی بەشێکی گەورەیە لای خوای مەزن. هەروەها بۆچوونی زانایان لە بارەی ناوی زولکیفلەوە: هەندێکیان ئەڵێن: ناوی بوشەعە، هەندێ تریان لایان وایە ناو ئیلیاسە، ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە بڕوامان وابێ لە پیاوچاکانە،هەموو یەکێ لە ئیسماعیل و ئیدریس و زولکیفل لەو کەسانەبوون ئارامیان گرت لەسەر ئازارو ئێشی جیهان.

﴿ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنا إِنَّهُمْ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ وە ئێمە ئەوانەمان خستە نێو چاکەی خۆمان لە ڕۆژی دوایداو خستنمانە ناو پێغەمەرایەتی خۆمان لە جیهاندا. بە ڕاستی هەندێکن لە پیاو چاکان.

بۆ ئاگاداری: باسێکی یونس پێغەمەر (ذا النونْ) یونس کوڕی مەتایە. خوای مەزن ڕەوانەی کرد بۆلای دانیشتوانی نەینەوای موسڵی ئێستا لە هەرێمی عێراق. یونس چوو بۆلایان دەستوری خوای پێ ڕاگەیاندن وولاّمیان نەدایەوە دژایەتی زۆریان کرد. فەرمووی: ئەگەر باوەڕ نەهێنن خوا سزاتان لە ئاسمانەوە بۆ ئەنێرێ، دوایی یونس ماندوو بوو ڕقی هەڵسا چونکە بەردەوامبوون لە سەربێ باوەڕی، بە توڕەیەوە وازی لێ هێنان و لەلایان ڕۆیشت، لەبەر ئەوەی تازە کرابوو بە پێغەمەرو ئازاری نەچێشتبوو خۆی ڕانەگرت، وای زانی ئەگەر واز لە ئامۆژگاریان بهێنێ خوای مەزن لە جیهاندا تووشی ئازاری ناکا. وای ئەزانی خوای مەزن پێویستی نەکردوە لەسەری بمێنێتەوە لەنێو ئەو گەلەدا. دوای دەرچونی بەرەو کەناری دەریای سپی ناوەند کەوتە ڕێ، سواری گەشتیەکی زۆر بارگرانبوو لەبەر قورسایی زۆر نزیکبوو دانیشتوانی سەر کەشتیەکە بکەونە ناو دەریاکە، دانیشتوان هەستیان بە مەترسی خنکان کرد. بەو بۆنەوە کەل و پەلی خۆیانیان فڕێدایە ناو دەریا، دوای پشکیان ڕاکێشا هەندی لە دانیشتوانی سەر کەشتیەکە فڕێ بدەنە ناو دەریاکەوە، پشکیان ڕاکێشا بەناو یونوسەوە دەرچو کە بخرێتە ناو دەریاوە، خستیانە ناوی و ماسیەکی زۆر گەورە قوتی داو کەوتە ناوچەندین تاریکیەوە، خوای مەزن باسی ئەو ڕوداوە ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغاضِباً فَظَنَ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ ﴾ وەتۆ بیری خاوەن ماسیەکە بکەرەوە کە یونوسی کوڕی مەتایە کە تاقمەکەی بانگ کرد بۆلای باوەڕهێنان بە خوای مەزن و وەلاّمیان نەدایەوە، دوای ماندوبو بە توڕیەوە لای ئەوان دەرچوو دوایی گومانی برد کە ئێمە تەنگانە ناخەینە سەری و تووشی ئازاری ناکەین ئەگەر گەلەکەی خۆی بەجێ بێڵێ، لایان ڕۆشیتوو سواری کەشتیە بوو فڕێدرایە ناوئاوی دەریا سپی و نەهەنگێ قوتی داو تووشی ئازاری زۆر گەورەبوو، خوای مەزن لەناو ئەو ماسیەدا بەندی کرد.

﴿ فَنادى فِي الظُّلُماتِ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحانَكَ إِني كُنْتُ مِنَ الظالِمِينَ ﴾ دوای خاوەن ماسیەکە هاواری برد بۆلای خوای مەزن و پاڕایەوە لە خوای مەزن لە ناو چەندین تاریکیدا: تاریکی ناو سکی ماسی، تاریکی ناو دەریا تاریکی شەوو، ووتی: هیچ خوا نیە هاواری لێ بکرێ

و بپەرستریّ مەگەر هەرتۆ بگەیتە فریام، پاك و بێ باکی هەر بۆ تۆیە بۆ ئەو شتانە دەستوری پێ ئەدەی. بەڕاستی من هەندێکم لەو کەسانە ستەمیان لە خۆیان کردووە، بە بۆنەی ڕۆیشتنم لەلای گەلەکەم بە گورجی و بەبێ دەستوری تۆ، هاوارم بۆلای تۆ هێناو ڕزگارم بکە.

﴿ فأَسْتَجَبْنا لَهُ وَنَجَّيْناهُ مِنَ الغَمِ وَكَذلِكَ نُنْجي الْمُؤْمِنينَ ﴾ دوایی ئێمە وەلامی پاڕانەوەی یونسمان دایەوەو ئێمە ڕزگارمان کرد لە خەفەتی بەندی خانەی ناوسکی ماسیەکە، فەرمانمانداندا بەو نەهەنگە یونس فڕ بدا بۆ سەر زەوی بەبێ ئازار، یونس بە لاوازوی بەدەردەداری هاتە دەرەوە، خوای مەزن درەختی کولەکەی بەسەیەوە ڕوواند، چونکە گەلاکەی پان و گەورەیەو لەمێش ئەی پارێزێ و لە بەرهەمەکەی بخوا دوای چاکبوونەوەو پشودانی چویەوە بۆلای گەلەکەی خۆی و دەستی کرد بە ڕاگەیاندنی فەرمانی خوای مەزن و ئەوانیش باوەڕیان بەخوا هێنا، ژمارەی گەلەکەی زۆرتربوون لە دووسەد هەزار کەس، هەربەو جۆرە ئێمە یونسمان ڕزگارکرد لە ئازارو تەنهایی بەندیخانە هەروایش ئێمە ڕزگار ئەکەین باوەڕدارانێکی ئەوتۆ بە نیازی پاکەوە لە ئێمە بپارێنەوە.

﴿ وَذَكَريا إذ نادى رَبَهُ رَبِ لا تَذَرْني فَرْداً وَانْتَ خَيْرُ الْوارِثِينَ ﴾ وە تۆ بیری زەکەریا بکەروە کاتێ پاڕایەوە لە پەروەردگاری خۆی ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ من بە تەنها و بەبێ مندالّ و بەبێ جێگە نشین بەجێ مەیەلەو ئەگەر جێگە نشینم پێ نەبەخشی تۆ چاکترین کەسانێکی یاریدەدەری منبێ، دوای مردنی من و مردنی هەموو بونەوەران.

﴿ فَاسْتَجَبْنا لَهُ وَوَهَبْنا لَهُ يَحْيى ﴾ دوایی ئێمە پاڕانەوەکەمان لێ وەرگرت و کوڕێکمان بە ناوی یەحیا بەخشی بەزەکەریاو لە مەترسی بێ کەسی ڕزگارمان کرد.

﴿ وَأَصْلَحْنا لَهُ زَوجَهُ ﴾ وە ئێمە ژنەکەی زەکەریامان گێڕا بە جۆرێ منالّی ببێ دوای ئەوەی نەزۆك بوو منالّی نەئەبوو زەکەریامان دلّخۆش کرد بە بوونی ئەو کوڕە.

﴿ إنَهُمْ كانُوا يُسارِعُونَ في الْخَيْراتِ وَيَدْعُونَنا رَغْباً وَرَهَباً وَكانُوا لَنا خاشِعِينَ ﴾ بە ڕاستی زەکەریا وژنەکەی و یەحیا پەلەیان ئەکرد بۆکردنی کارە چاکەکان و بۆلای دەرگای هەمووچاکەی‌یەو لە ئێمە ئەپاڕانەوە بۆ ئومێدی پاداشتی خوای مەزن و لەبەر ترسی سزای خوای گەورەو ئەوان لە ئێمە ئەترسان و مل شۆڕی فەرمانی ئێمەبوون. لە ئایەتی (٣٨)ی سورەتی ئالی عیمران و لە ئایەتی (٧)ی مەریەمدا باسی بەسەرهاتی زەکەریاو یەحیا کراوە.

﴿ وَالَتي أحْصَنَتْ فَرْجَها فَنَفَخْنا فِيها مِنْ رُوحِنا ﴾ وە تۆ بیری ئەوژنەی ئەوتۆ بکەرەوە کە دایکی عیسایە شەرم گەی پاراستبوو لە کاری ڕەواو ناڕەوا هیچ ئادەمیزادێ دەستی لێ نەکەوتبوو، دوایی ئێمە گیانی عیسامان خستە ناو منالّدانی بەهۆی فویەکی جبرەئیل بە یەخەی کراسەکەیاو عیسا بە زیندووی لە دایکبوو. خوای مەزن عیسای ناوبردووە بە ڕۆحی خۆی لەبەر ڕێزی عیسا.

﴿ وَجَعَلْناها وَابْنَها آيَةً لِلْعالَمِينَ ﴾ وە ئێمە ئەو ژنەو کورەکەیمان گێڕا بە نیشانەیەکی زۆر گەورەو بەڵگە لەسەر توانای ئێمە بۆ هەموو بونەوەران کە ئێمە بەبێ باوك لە ژنێکی بێ مێرد منالێ دروست بکەین لە منالدانیا.

ئەو ژنە داوێن پاکە ناوی مریەمی کچی عیمرانە یەکێ بووە لە زانا گەورەکانی بەنو ئیسرائیلی. لە ئایەتی(٤٥)ی سورەتی ئالی عیمران و ئایەتی (٤٥) و لە ئایەتی (١٦)ی سورەتی مریەم و ئایەتی (١٦) باسی مەریەم کراوە دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو پێغەمەرانەی کرد کە ڕەوانەی کردبوون بۆلای گەلەکانی خۆیان و بۆلای ئادەمیزادی تریش کە ڕانمویان بکا بۆلای خواپەرستی و فەرمووی: هەموویان خوایەکی تەنهایان ئەپەرست و یەك ئایینیان هەبووە، لەم ئایەتانەی دوایدا فەرمانمان پێدا ئەو ئایینە شایستەی پەرستنبێ و بکرێ بە یاسا هەر ئاینی ئیسلامە، هەموو یاساو دەستوری هەموو نامەکانی پێشووی تێدایەو ئەفەرموێ:

إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ ۖ كُلٌّ إِلَيْنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ فَإِذَا هِىَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَٰوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا

ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ إنَ هذِهِ اُمَتَكُمْ اُمَةً واحِدَةً وَأنا رَبُكُمْ فأعْبُدُونِ ﴾ بەڕاستی ئەو بیروباوەڕەی پێغەمەرانە کەبریتیە لە یەکێتی خوای مەزن و مل کەچیە بۆ خوا بە گفتوگۆو بە کردەوە ئایینی ئێوەی ئادەمیزادە یەك ئایینە بەبێ جیاوازی نێوان پێغەمەران هەموویان یەك ئایینیان بووە من پەروەردگاری ئێوەم، دوایی ئێوە هەر بەتنها من بپەرستن بە نیازی پاکەوە. خوای مەزن فەرمانی داوەبە ئادەمیزاد هەموویان لەسەر باوەڕی یەکێتی خوابن و هاوبەشی بۆ دامەنێن .

﴿ وَتَقَطَعُوا امْرَهُمْ بَيْنَهُمْ كُلُ إلَيْنا راجِعُونَ ﴾ وە ئەوان پارچە پارچە بوون لە نێوان خۆیاناو بوون بە چەند تاقمێ: هەیانە بێ ئایین. هەیانە بت پەرست. هەیانە جولەکە. هەیانە گاور. هەیانە ئاگر پەرست. هەیانە گاو ئاژەڵ پەرست. بگرە نەتەوەی تاکە پێغەمەرێ چەند کۆمەڵێکن و نفرەت لە یەکتری ئەکەن و بێزارن لە یەکتری. هەموویان بۆلای ئێمە ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئێمە بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆیان پاداشتیان ئەدەینەوە، ئەو کاتە ئەزانن کامیان ڕاستن و کامیان درۆزنن.

﴿ فَمَنْ يَعْمَلْ مَنَ الصَالِحاتِ وَهُوَ مُؤْمِنَ فَلا كُفْرانَ لِسَعْيِهِ وَإنا لَهُ كاتِبُونَ ﴾ دوایی هەرکەسێ کردەو چاکەکان بکا کەمبێ یا زۆر بچوك بێ یا گەورەو ئەو کەسە باوەڕی بە خواو بە فریشتەکان و نامەکانی خواو پێغەمەران و ڕۆژیدوایی هێنابێ، دوایی کۆششەکەی لەناو ناچێ و سوپاسی ئەکرێ و پاداشتی ئەرێتەوەو بە ڕاستی ئێمە ئەو کۆششەی بۆ ئەنوسین لە نامەی کرداریاو بۆی ئەپارێزین .

﴿ وَحَرامٌ عَلَى قَرْيَةٍ اَهْلَكْناها أنَهُمْ لا يَرْجِعُونَ ﴾ زانایان بیروبۆچوونیان لە ماناکردنی ئەو ڕستانە جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: پیتی (لا)ی (لا يَرْجِعُونَ) زیادنیە. کەواتە مانای ئەو ڕستانە

بەم جۆرەیە: وەقەدەغەیە لەسەر دانیشتوانی هەموو گوندێ ئێمە لە ناومان بردوون و ئازارمان داون بەهۆی گوناهەکانیانە کە بە ڕاستی ئەوان نەگەڕێنەوە بۆلای ئێمە لە ڕۆژی دووایدا بۆ پرسیارو پاداشت. بەڵکو پێویستە بگەڕێنەوە بۆلای ئێمە لەو ڕۆژەداو سزایان بدرێ بەو جۆرەی لە جیهاندا سزایان درا. هەندێ تر لەزانایان ئەڵێن: پیتی (لا) زیادەیەو هێزاوە لەبەر بەهێزکردنی ناوەڕۆکی ڕستەکان: کەواتە مانای ڕستەکان بەم جۆرە ئەکرێ:

وە قەدەغەیە لەسەر دانیشتوانی هەموو گوندێ ئێمە لەناومان بردوون گەڕانەوەیان بۆلای جیهان دوای لە ناوبردنیان بۆ ئەوەی پەشیمان ببنەوە لە گوناهەکانیان.

پرسیار/ ئایا خوای مەزن سزای بێ باوەڕان ئەدا لەسەر بێ باوەڕیان لە پاشە ڕۆژدا دوای ئەوەی سزای داون لە جیهاندا، ئایا دروستە کۆبوونەوەی دوو سزا لەسەریەك تاوان؟

وەڵام/ سزادانیان بە لە ناوبردنیان سزایە لەسەر ئەوەی پێغەمەرەکانیان بەدرۆ ئەخستەوە بەو هەموو کارە پەك خەرانەوە چوبوون بۆلایان. بەڵام سزادانیان لە ڕۆژی دواییدا لەسەر گوناهەکانی تریانە وەك بوختان کردنیان و ستەم کردنیان و جگەی ئەوانیش. کەواتە سزادانیان لەسەر تاوانێ نیە. بەڵکو لەسەر چەند تاوانێکە.

﴿ حتى إذا فُتِحتْ يَأجُوجُ وَمأجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ ﴾ نەگەڕانەوەی بێ باوەڕان یا گەڕانەوەیان بەردەوامەهەتا کاتی بەرپابونی ڕۆژیدوایی ودەرکەوتنی نیشانەکانی بەهۆی ڕوخانی ڕێگە گرەکەی یاجوج و ماجوج و بلاوبونەوەیان بە ڕوی زەویدا. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ: یاجوج و ماجوج لە هەموو بەرزاییەکی زەوویە بەپەلە دێنە دەرەوە وئامادەی پاشە ڕۆژ ئەبن.

﴿ وأقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُ فَأذا هِيَّ شاخِصَةٌ أبْصارُ الذيْنَ كَفَـرُوا ﴾ وە نزیکە بەرپابوونی ئەو بەڵێنە ڕاستە کە هاتنی ڕۆژی دووابیە و دوای ڕوخانی ڕێگەگرەکەی یاجوج وماجوج، ودوایی کوتوپڕ ئەو شتەی پەیدا ئەبێ ئەمەبە چاوی بێ باوەڕان ئەکرێتەوە لەترسی سامناکی ئەو ڕوداوەو داناخرێ پێڵوی چاویان بەرز ئەبێتەوە وناتوانن دای نەوینن.

بۆ ئاگاداری: لە ئایەتی (٩٤)ی سورەتی ئەلکەهفدا باسی ئەوەمان کرد یاجوج تەتەرەکانن وماجوج مەنغولیەکانن، هەر لە ئایەتی (٩٨)ئەو سورەتە دابێژراوە ئەو ڕێگەگرەی ئەوان بەهۆی تێپەڕبونی ڕۆژانی زۆری ڕابردو بەسەر یا شوێنەواری نەماوە، ئەگینا ئەو ڕێگە گرە لەم سەردەمەی ئێمەدا دائەبینرا ئێمە بڕوامان وایە کە ئەو ڕوداوە یا لەمەوبەر پەیدا بووە یالەمەو دوا پەیدا ئەبێ، خوا زانا ترە.

﴿ يا وَيْلَنا قَدْ كُنا في غَفْلَةٍ مِنْ هذا بَلْ كُنـا ظـالِمينَ ﴾ بێ بـاوەڕان ئـەڵێن: ئـەی هـاوارو بەدبەختی: وەرە بۆ لای ئێمە، بەڕاستی ئێمە لـە بێ ئاگاییدا بووین لـەجیهاندا لـە بۆ هـاتنی ئـەو ڕۆژە. بەڵکو ئێمە ستەمكاربووین كە پێغبەرەكانمان بەدرۆ ئەخستەوە و باوەڕمان بـە هـاتنی ئـەم ڕۆژە نەبوو ڕێگەمان لـە بلاوبونەوەی پەیامی خوای مەزن ئەگرت.

﴿ إنَكُمْ وَما تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ حَصَـبُ جَـهَنَمَّ أَنْتُمْ لَـها وارِدُونَ ﴾ بەڕاسـتی ئێـوەی بـت پەرست وشتێ ئێوە ئەیپەرستن لـە جگەی خوا سـوتەمەنی دوزەخـن. ئێـوە هـەردوولاتان ئەچنـە دۆزەخەوە. بتەكان هەرچەندە بێ گیـان وبـێ گونـاهن. بـەلام هـەر لـەبـەر ئـەوەی بیـان بینـن وخەفەتیان زۆر تر ببێ كە خواكانیان لـە دۆزەخدان ئەبنە سوتەمەنی دۆزەخ بۆ سوتانی ئەوان.

﴿ لَوْ كانَ هَؤلاءِ آلِهَةً ما وَرَدُواها وَهُمْ فِيها خالِدُونَ ﴾ ئەگەر ئەوبتانە خوا بونایـە نەئەچونـە نێو دۆزەخو ئەوانو خواكانیان بەردەوامن لـە نێو دۆزەخدا و ڕزگاریان نابێ.

﴿ لهم منها زفير وهم فيها لايسمعون ﴾ بۆ بێ باوەرا هەیە لـە نێـو دۆزەخـدا نالـەو هـاواری ئازاروئێش، لـە هیچ كەسێكە وە گفتوگۆیەكی چاك نابیسن وهیچ كەسێ بەزەیی بەوانا نایەتـەوە هەركەسێ بیان بینێ سەرزەنشتیان ئەكەن.

ڕۆژی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چو بۆلای كەعبە، پیـاوە گـەورەكانی قورەیـش لـەوێ بـون، لـەم لاولای كەعبەدا (٢٦٠) بتیان، هەڵواسرابون، پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ دانیشت لـە گـەڵیان. نـەزری كوڕی حەرس كەوتە گفتوگۆ لـەگەڵ پێغەمبەرو پەكی كەوت، لـەپاشا پێغەمبەر فـەرموی: ئێـوە ئەو شتانە ئەپەرستن سوتەمەنی دۆزەخن، ئیبنولزەعبە ووتی: ئەی موحەمـەد: ئـەوەی بپەرسـترێ بچێتە دۆزەخ.ئەبێ عیسا وعوزەیر و فریشـتەكان كـە پەرسـتراوی جولـەكـەكان وگاورەكـان و هەندێ لـە عەرەباكانە بچنە دۆزەخەوە. پێغەمبەر فەرمووی تۆ زمانی خۆت نازانی ئەوەندە گێلی ونازانی پیتی (ما) بۆ جگەی ئاقلان بەكارئەهێنرێ. لـەپاشـا خـوای مـەزن ئـەم ئایەتانـەی نـاردە خوارەوە.فەرمووی.

إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ

خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾

﴿ إنَ الذيْنَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنا الْحُسْنى أوُلئِكَ عَنها مُبْعَدُونَ ﴾ بە ڕاستی کە سانێکی ئەو تۆ خوای مەزن بە لێنی دابێ بەوان چاکەیان لەگەڵ بکاو مژدەی دا بێ بە هەشتیان بداتێ ئەو کەسانە دور ئەخرێنەوەی لە دۆزەخ. وەك عوزەیر و عیسا وجگەی ئەوان.

﴿ لا يَسْمَعُونَ حَسِيسَها وَهُمْ في ما أشْتَهَتْ أنْفُسُهُمْ خالِدُونَ ﴾ ئەو کەسانە دەنگی کلپەی ئاگری دۆزەخ نابیسن و ئەوان بەردەوامیشن لەنێو هەرشتێکا دەرونیان ئارەزۆی بکا بەبەردەوامی خاوەنی ئاسودەن وترسیان لە سزای خوای مەزن نیەو لەبەهەشتان.

﴿ لا يَحْزُنُهُمْ الْفَزَعُ الأكْبَرُ ﴾ ترسی گەورەی ڕۆژی دوایی خەفەتباریان ناکا بریتیە لەو کاتەی بێ باوەڕان ئەچنە دۆزەخ و وبانگ ئەگرێ لەمەو پاش مردن نامێنێ.ترسان چەندین پلەی هەیە هەر لە بێهۆشی سەرەمەرگەوە هەتا چونیان بۆ دۆزەخ دەرگای دۆزەخ دائەخرێ بەسەر دانیشتوانیدا.

﴿ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ هذا يَوْمُكُمُ الذي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ وە فریشتەکان پێش وازی لە خاوەن چاکەکان ئەگەن بەرێزەوە بەوان ئەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە بەڵێنی پێ درا بۆئێوە توشی بەن، موژدەبێ لێتان ئەم ڕۆژە پیرۆزە.

﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَماءَ كَطَيِّ السِجَلِ لِلْكُتُبِ ﴾ ئەو ڕۆژە بریتیە لە ڕۆژێ ئێمە ئاسمان لولە ئەکەین بە وێنەی لولەکردنی نوسەر بۆ نامەکانی خۆی. ئەستێرەکان ئەدەن لەیەکتری و کێشیان نامێنێ و ئەکەونە خوارەوە، هەربەو جۆرەی ڕستەی نوسراوی پێنچ راوە نابینرێ ئەستێرەکانیش نابینرێن. ئاسمانەکان ئەگەڕێنەوە بۆ لای نەبون.

﴿ كَما بَدَأنا أوَلَ خَلْقٍ نعيده وَعْداً عَلَيْنا إنا كُنا فاعِلِينَ ﴾ هەروەك یەکەم جار هەمو شتێ ئێمە ئەی گێرنەوەبۆ لای نەبوون، ئێمە بەڵێنمان داوە بە بەڵێنێکی بێگومان بە ڕاستی ئێمە ئەیان گێڕینەوە بۆ لای جاری پێشوو ئەو شتانە ئەکەین، ئێمە توانامان هەیە جارێ تر مردووان زیندو بکەینەوە بۆ پرسیارو وەڵام و پارچە پارچەی بونەوەران کۆبکەینەوە.

﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنا فِي الزَبُور مِنْ بَعْدِ الذِكْرِ أنَ الأَرْضَ يَرِثُها عِبادي الصَالِحُونَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە نوسیومانە لە هەمونامەیەکی نوسراوا لەو نامەیانە ئێمە ناردوومانە بۆ لای پێغەمبەرەکان لە تەورات وئینجیل وقورئان دوای ئەوەی ئێمە تۆمارمان کردبو لەوحەلمەحفوزدا کە بەڕاستی زەوی بەهەشت بەندە چاکەکانی ئێمە سودی لێ وەرئەگرن ئەیکەن بەبەشی خۆیان بەبێ ماندوبون، ئەو بەندە چاکانە بریتین لەو کەسانە لە ڕوی زەویدا بە لاواز تەماشا ئەکران.

هەندێ لە زانایان مانای ئەو ئایەتەیان بەم جۆرە کردوە. یانێ فەرمان ڕەوایی و دەسەڵات لە زەویدا هەر چەندە بەدەستی پیاو خراپان وتاوانبارانەوە بێ، دوایی ئەدرێتە دەست پیاوچاکان بەبێ گومان، ئەو کاتە ئاسایش وداد پەروەری ڕوی هەموو زەویی ئەگرێتەوە پیت وپیرۆزی هەمو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە بێگومان ئەو پیاوچاکانە هەرئەبێ موسڵمانانی باوەڕدار بە ئایینی خوای مەزن و پێغەمبەری ئیسلامیشن. هەرچەندە لەم کاتەی ئێمە دا هێز بەدەستی کۆمەڵی دڕوندەوەبێ، بە ئومێدی خوای مەزن ئەو هێزە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەدرێ بەو کەسانەی خاوەنی ڕاستی و داد پەروەری بن.

﴿ إنَ فِي هذا لَبَلاغا لِقَوْمٍ عابِدِينَ ﴾ بە ڕاستی هەیە لە نێو ئەوشتانەدا لەم سورەتەدا باسی کرا لە ئامۆژگاری و هەواڵی ڕابردودان ولەبەسەرهاتی پێغەمبەران و مۆژەدان و هەڕەشە کردن گەیشتن بە ئاوات بۆ تاقمێ خواپەرستن. بەڵگەی بێگومانن لەسەر یەکێتی خوای مەزن بۆ تاقمێ مەبەستیان پەرستنی خوای مەزنبێ.

﴿ وَما أَرْسَلْناكَ إِلاّ رَحْمَةً لِلعالَمِيْنَ ﴾ وە ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردوە بەو هەمو دەستورەبە نرخانەوە مەگەر هەر بۆ ئەوەی هۆی بەختیاری چاکەی ژیانی هەردوو جیهان بۆ هەمو ئادەمیزاد بێ چونکە ئادەمیزادی پێش تۆ لەسەر گەردانی دابون. پارچە پارچە بون، تۆمان ڕەوانە کرد ڕاغویان بکەی بۆ لای ڕێگەی ڕاست، لە تاریکی بێ باوەڕێوە بەرەو ڕوناکی بڕۆن چاك و خراپ جویێ بکەنەوە ئەو ئایینەو ئەو قورئانە هاتون بۆلای تۆ شیاوی هەمو کات هەمو موجێگەیەکن.

هەر لەبەر ئەوەیشە کە ئادەمیزاد باوەڕ بەو ئایینەی تۆ ناهێنن و قورئان ناکەن بەیاسا بۆیە ستەم و جەنگ و بێدادی باڵی کێشاوە بەسەر دانیشتوانی ڕوی زەویدا، هۆی چاکەیە بۆ باوەڕداران لە هەردوو جیهاندا، بۆبێ باوەڕان کە خوای مەزن بە گورجی لە جیهاندا سزایان نادا، جگەی ئادەمیزادیش ئەبێ مافی خۆیان وەرگرن.

قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۖ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١٠٩﴾ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١٠﴾ قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ ۗ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١١﴾ ﴿١١٢﴾

﴿ قُلْ إِنَما يُوحى إِلى أَنما إِلَهُكُمْ إِلَهٌ واحِدٌ فَهَلْ أَنتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾ تۆ بڵێ بەبێ باوەڕان: بەڕاستی سروش نێراوە بۆلای من کە بە ڕاستی هیچ خوایە نی‌یە شایەنی پەرستنبێ و خوای ئێوە خوایەکی تەنهایە و ئەم گەردونە سەر سوڕهێنەرەی هێناوەتە بونەوەو بەڵگەن لەسەر توانای خوا، دوایی ئایا بۆ ئێوە باوەڕناهێنن و مل کەچی فەرمودەی خوابن و واز لە بت پەرستی بهێنن .

﴿ فَإِنْ تَوَلَّوا فَقُلْ إِذَنْتُكُمْ عَلَى سَواءٍ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە پشت بکەنە یەکێتی خـوای مـەزن خۆتان پاك نەکەوە لەشتێ شایستەی خـوای مـەزن نـەبێ، دوایـی تـۆ بـەوان بڵـێ: مـن ئێـوەم ئاگاداری شتێ کـردووە فـەرمانم پێـدراوە لـەسـەر دادپـەروەری و یەکسـانی بـیرورای چـاك و بەڵگەی ڕون، هەموو پەیامی خوای مـەزنم پێتـان ڕاگـەیاندووە بیـانو بـۆ هیـچ کەسـێ لـەئێوە نەماوەتەوە کە باوەڕ نەهێنن .

﴿ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَمْ بَعِيدٌ ما تُوعَدُونَ ﴾ وەمن نازانم ئایا نزیکە شتێ بەڵێنی پێدراوە بە ئێوە لەلایەن خوای مەزنەوە لە سزاو لە هاتنی ڕۆژی دوایی یا دوورە، بەڵام ئەوەندەیـە گومـان لـە هاتنیانە نیە .

﴿ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ ما تَكْتُمُونَ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن ئـەزانێ بـەلای شتێ ئێوە ئاشکرابێ لە گفۆکانتان و ئەزانێ بە شتێ ئەیشارنەوە لە ڕق و لە کینەی دڵتان و بە شتێ پیلانی بۆ دروست ئەکەن لە دژی موسڵمان و کۆرو کۆمەڵتان .

﴿ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَكُمْ وَمَتاعٌ إِلى حِينٍ ﴾ وەمـن نـازانم لەوانەیـە دواخسـتنی سـزا تاقی‌کردنەوەبێ بۆ ئێوە بە بەرزبونەوەتانە پلە بە پلەو ببینرێ چ شتێ ئەکەن و ئێمە زاناترین لـە ئێوە بەو شتانەو بۆ ئەوەیش ڕابوێرن هەتا ئەو ماوەیە خوای مەزن دیاری کردووە بۆ تەمـەنتان و بژین لە جیهاندا .

﴿ قالَ رَبِّ احْكُمْ بِالْحَقِّ وَرَبُّنا الرَّحْمنُ الْمُسْتَعانُ عَلَى ما تَصِفُونَ ﴾ موحەمـەد بڵـێ: ئـەی پەروەدگاری من: تۆ فەرمان بدە بە ڕاستی و بە دادپەروەری لە نێوان مـن و نێـوان دانیشـتوانی مەکەداو یـاریدەی خـاوەن ڕاسـتی و دادپـەروەران بـدەو سـەریان بخـە بەسـەر بێ باوەڕانـاو، پەروەردگاری ئێمە خوای خاوەن بەخشندەیە داوای کۆمەکی لێ ئەکرێ لـەسەر نەمانی شتی ئێوە باسی ئەکەن وئەوەی ئەیڵێن: خوای منالی هەیـە موحەومـەد شـاعیرو هۆنـراوە بێـژەو قورئـان هۆنراوەیە و درۆشمی ئیسلام ماوەیەکەو دوای نامێنێ و موحەمەد ئەمرێ. ئەوەبوو خوای مـەزن لە ڕۆژی بەدردا بێ باوەڕانی شکان و دواتریـش بـاوەڕداران مەکـەیان داگـیرکرد، پاڕانـەوەی پێغەمەری وەرگرت .

**بە یاریدەی مەزن کۆتایی بە مانای ئەم سورەتە هات (٢٠)ی مانگی زیل حیجە سالی (١٤٢٠) کۆچی بەرانبەر بە (٢٦/٣/٢٠٠٠) زایینی ڕۆژی یەک شەمە. ئەی پەروەردگاری خاوەن بەخشندەو بە ئاواتی خۆمم بگەیەنە**

تەفسیری زمناکۆیی

# ﴿ سورەتی ئەلحەج ﴾

لە مەکە هاتۆتە خوارەوە. هەندێ لـە زانایـان ئـەڵێن: جگـە لـە لئایـەتی (١١-١٢) لای هەندێ تریان جگە لە ئایەتی (١٩) هەتا ئایەتی (٢٤)لای هەندێ تریـان لـە زانایـان جگـە لـە ئایەتی (٧٨) کە لـە مەدینە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٧٨) ئایەتن .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ

طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾

﴿ يا ايُها الناسُ اتَّقُوا رَبَكُمْ إنَ زَلْزَلَةَ السّاعَةِ شَيْءٍ عَظِيمٌ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ئێوە بترسن لە سزای پەروەردگاری خۆتان و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی ئەو. بە ڕاستی لەرزین و تەکانی سەختی ڕۆژی دوایی زۆر شتێکی گەورەو ترسناکەو تووشی زەوی ئەبێ. مەبەست لە لەرزاندنی زەوی لە ڕۆژی دوایدا: کاولبوونی زەوی وئاسمانەکان و تێکەڵاو بوونیانە لەگەڵ یەکتری و تێکەڵبوونی هەموو ئاوەکانی زەویە ب٧یَ ئەوەی پەروەدەیە لە نێوانیانابێ، ئاسمانەکان و زەوی کێش و دوربونیان لە یەکتری نامێنێ، هەموو مردوەکان بە زیندوویی لە گۆڕەکانیان دێنەدەرێ بە وێنە تابلۆی بێ گیان. ڕۆژی دوایی بۆیە ناو ئەبرێ بە (الساعه) یانێ هەموو شتێ بەپەلە ڕائەکا بۆلای ئەو ڕۆژە .

﴿ يَوْمَ تَرَوْنَها تَذْهَلُ كُلُ مُرْضِعَةٍ عمّا أرْضَعَتْ ﴾ ڕۆژێکە ئێوە بە چاویی سەری خۆتان ئەو ڕۆژە ئەبینن هەموو شیر دەرێ بێ ئاگا ئەبێ لە شتێ شیری پێ دراوەو، خۆشی ویستوە بەخۆیە خەریکە لەبەر سامناکی ئەو ڕۆژە بیری منالەکەی بە دڵدا نایە .

﴿ وَتَضَعُ كُلُ داتِ حَمْلٍ حُمْلَها ﴾ وە هەمووژنێکی خاوەن بێچوو لەبەر سەختی ئەوڕۆژە ئەو بێچووەی لە منداڵداندایە دای ئەنێ، ئەو ڕستانە هێمایە لەسەر سەختی ئەو ڕۆژە، ئەگینا لەو ڕۆژەدا نە شیردەر هەیەو نە خاوەن بێچوو، یانێ ئەگەر هەبن بەو جۆرە ئەبن .

﴿ وَتَرى الناسَ سُكارى وَماهُمْ بِسُكارى وَلكنَّ عذابَ اللهِ شَدِيدٌ ﴾ وەتۆ ئـادەمیزاد وائـەبینی سەرخۆشن لـەبەر دهشەتی ئەو ڕۆژەو ئاگایان لـە خۆیان نیـەو ئـەوان سـەرخۆش نـین و، بـەڵام سزای خوای مەزن زۆر سەختە لـەو ڕۆژەداو ئەقڵی لێ تێکداون و هۆشی لێ بڕیون.

﴿ وَمِنَ الناسِ مَنْ يَجادِلُ في اللهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ وەهەندێ لـە ئادەمیزاد هەیە گفتوگۆی نـاڕەواو بێ جێگە ئەکا لـە بارەی خوای مەزنەوەو ئایین و نامەی خوای مەزنەوە. بـەبێ ئـەوەی زانـین و ئاگاداری لـەو شتانە هەبێ و باسیان ئەکا. بە وێنەی نەزری کوڕی حەرس ئەیووت: فریشـتەکان کچی خوان، قورئان ئەفسانەیەو چیرۆکی پێشوەکانە، ڕۆژی دوایی نیەو نایەت و زیندوبوونـەوە نیە .

﴿ وَيَتَّبِع كُلَ شَيْطانٍ مَرِيدٍ ﴾ وە ئەو کەسە لـە گفوگۆی ناڕەوای خۆیـا هـەموو کاتـێ دوای هەموو شەیتانێکی خراپەکارو بێ چاکە ئەکەوێ و ڕای ئەکێشێ بۆلای خراپـە و خـوا فـەرمانی داوە دوای نەکەوێ .

﴿ كُتِبَ عَلَيْهِ أنَهُ مَنْ تَوَلاهُ فَإنَهُ يُضلُهُ وَيَهْدِيهِ إلى عَذابِ السَـعِيرِ ﴾ پێویسـت کـراوە لـەسـەر شەیتان کە بە ڕاستی هەرکەسێ دوای ئەو بکەوێ و بیکا بە دۆستی خۆی، دوایی شـەیتان ئـەو کەسە لـە ڕێگەی ڕاست لائەداو ڕانمویشی ئەکا بـۆلای سـزای ئـاگری دۆزەخ هـەتا بیسـوتێنێ بەهۆی بێ فەرمانی خوای مەزنەوە .

﴿ يا أيُها الناسُ إنْ كُنْتُمْ في رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَأنّا خَلَقْناكُمْ مِنْ تُرابِ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ئەگـەر ئێوە لـە گوماندان لـە بارەی زیندوبوونـەوەی دوای مـردن و ئـەڵێن زیندوبوونـەوە نیـەو ڕۆژی دوایی نایە دوای ئێوە تەماشای پێشووی خۆتان بکـەن کـە نـەبوون، بـە ڕاسـتی ئێمـە ئێوەمـان دروست کردبوو ڕاستەوخۆ لـە خاك وەك ئادەم یا بە هۆی دڵۆپێ ئاو کە لـە خواردەمـەنی سـەر خاك پەیدابووەو تێکەڵاوی خوێن ئەبێ و لـە مێردەوە ئەچێتـە نـاو منداڵدانـی ژنـەوەو ئـەبێ بـە ئادەمیزادێکی زیندوو.

﴿ ثُمَ مِنَ نُطْفَةٍ ثُمْ مِنَ عَلَقَةٍ ثُمَ مِنْ مُضْغَةٍ مخلّقةٍ وَغَيْرَ مُخَلَقَةٍ ﴾ لـە پاش ئەوەی ئێمـە ئادەمـان ڕاستەوخۆ لـە خاك دروست کرد منداڵەکانیان دروست ئەکەین لـە دڵۆپێ ئاوو ئەچێتە منداڵدانەوە لـە پاشا ئەو ئاوە ئەبێ بە پارچە خوێنی ڕەق و بەستراو لـە پاشا ئەو پارچە خوێنە ئەبێ بـە پارچـە گۆشتێ بە ئەندازەی تیکەیە بە جۆرێ ماوەی بونەکە تەواو ئـەبێ و لـە دایـك ئـەبێ یانابـێ بـە دروست کراوێکی تەواو بە پارچە گۆشتی لـە منداڵدان ئەکەوێتە خوارەوە .

﴿ لُنَبـِينَ لَكُـمْ ﴾ لـەبەرئـەوەی هـەتا ئێمـە بـۆ ئێـوەی ڕون بکەینـەوە توانامـان بەسـەر زیندوکردنەوەی مردوان و بەسەر جگەی زیندوبوونەوەدا هەیە، چونکە کەسی بتوانـێ پلـە بـە

پلە ئادەمیزاد دروست بکا لەوانەی پێشوو ئادەم لە خاك و منالەکانی لەوانە باسکران، زۆر بە ئاسانی تر ئەتوانێ جارێ تر بیان کاتەوە بە ئادەمیزادێکی زیندوو دوای بونیان بە خاك .

﴿ وَنُقِرُّ في الأرْحام ما نَشاءُ إلى أجَلٍ مُسمىً ﴾ وە ئێمە دائەنێن لە نـاو منالدانـەکانی ژنـاندا شتێ ئارەزۆمان وابێ منالدان فڕەی نەداتەوە دەرەوە بۆلای ماوەیەکی دیاری کراو کـەمتر نـەبێ لـە شەش مانگ و زۆرتر نەبێ لـە چوار ساڵ و بە زۆری بۆلای نۆ مانگ.

﴿ ثُمَ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَ لِتَبْلُغُوا أشُدَّكُمْ ﴾ لـە پاشا ئێمە ئێوە لـە منالدانی دایکتانا دەرئـەهێنن بە منالی بە ئەوپەڕی بێ هێزیەوەو ناتوانن کاروباری خۆتان هەڵسورێنن لـە پاشا ئێمە تەمـەنێکی وا ئەدەین بە ئێوە لەبەر ئەوەی ئێوە بگەنە کاتی ئـەقڵی تـەواو و بـەهێزو توانـا پـەیدا بکـەن و لـەشتان توندو تۆڵ بێ .

﴿ وَمِنْكُمْ مِنْ يُتَوفى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدّ إلى أرْذَلِ الْعُمُرِ لِكُيْلا يَعْلَمَ بَعْدَ الْعِلْمِ شَـيْئاً ﴾ وەهـەندێ لـە ئێوە کەسێکە ئەمرێ بە منالی و بەر لەتەواو بوونی ئـەقڵ و بـالغ بـێ و هـەندێ لـە ئێـوە کەسێکە ئەگێڕێتەوە بۆلای خرابترین تەمەن و بۆ لای ژیانێکی خراپ و تووشی خەڵەفاویی ئەبێ وەك کاتی منالی لێ دێ و پیر ئەبێ و وای لێدێ هیچ شتێ نەزانێ دوای ئەوەی خاوەنی زانیاری بووە بۆ زۆر شت. لـە پاشا خوای مەزن بەڵگەیە تـر ئەهێنێتـەوە لـەسـەر زیندوبوونـەوەی دوای مردن و ئەفەرموێ:

﴿ وَتَرى الأرْضَ هامِدَةً فأذا أنْزَلْنا عَلَيْها الْماءَ أهْتزاتْ وَرَبَتْ وَأنْبَتَـتْ مِـنْ كُـلِ زَوْجٍ بَـهِجٍ ﴾ وەتۆ زەوی ئەبینی ووشکەو بێ گیانە وەك مردوو هیچ شتێ ناروێنێ و بێ ڕووالەت، دوایی ئێمە ئەرێژین بەسەر ئەو زەویدا ئاوی باران لـە ئاسمانەوە زەوێکە ئەکەوێتە جوڵەو ئەئاوسـێ و بـەرز ئەبێتەوەو ئەبوژێتەوەو هەمو جۆرە گیایەو هەموو جۆرە ڕوەکێ بە ڕەنگی هەموو جۆرەوە سـەوز ئەکاو تەماشاکەران دڵخۆش ئەکا بۆ خواردن و بۆ شتی تر. بێگومان زەوی ئامادەیی تێدایـە بـۆ پێش وازی زیندوبونەوە. بەڵام هیچ پەیدا نابێ بەبێ دەسـتوری خـوای مـەزن، هـەموو ڕوەکـێ خاوەنی نێرو مێیە .

﴿ ذلِكَ بِأنَّ اللهَ هُوَ الْحَقُ وَأنَهُ يُحْيِي الْموتـى وَأنَـهُ عَلَـى كَـلِ شَـيْءٍ قَدِيـرٌ ﴾ ئـەو شـتانەی باسکران لـە دروست کردنی ئادەمیزاد بەو پلە جیاوازانەدا بەسەریا دێ و لە زیندوکردنـەوەی مردوان بەهۆی خوایەکی مەزنەوەیە هەر ئەوە بەردەوامە هەر ئەوە زیندو ئەکاتەوە مردوان هـەر خوای مەزنە شایستەیە بۆ پەرستن و هەر خوای مەزنە بەڕاستی مردوان زینـدو ئەکاتـەوەو هـەر خوای مەزنە دەستەلاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیەو تەنهایەو بێ هاوبەشە.

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴿١٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾

﴿ وَأَنَّ السّاعَةَ آتِيَةٌ لاَرَيْبَ فِيها وَأَنَّ اللهَ يَبْعَثُ مَنْ في القُبور ﴾ وەبەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت گومانی تێدا نیە هاتنی ئەو ڕۆژەو بە ڕاستی خوا زیندو ئەکاتەوە هەموو کەسێ لە گۆڕەکانا لەو کاتەی خوای مەزن دیاری کردووە .

﴿ وَمِنَ الناسِ مَنْ يُجادِلُ في اللهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلا هُدى وَلا كِتابٍ مُنيرٍ ﴾ وەهەندێ لە ئادەمیزاد کەسێکە گفتوگۆی پڕوپوچ و بێ جێگە ئەکەن بەبێ زانیاری و بەڵگەو بەبێ شارەزایی و بەبێ

نامەیە لەلای خوای مەزنەوە بۆی هاتبێ و ڕاستی بۆ ڕون بکاتەوە ئەو کەسەیش هەروەك ڕابورد نەزری کوڕی حەرسیو کە ئەو کەسە هیچ یەکێ لەوانەی نیە .

لەو ئایەتەدا خوای مەزن باسی سێ شتی کردووە کە هۆی زانینی ئادەمیزادە بۆ ناسینی هەموو شتێ:

١- (عِلْمٍ) کە بریتی‌یە لە تاقیکردنەوەی هەموو شتێ بەهۆی هەستەکانەوە، ئەو شتانەیش ئەبێ هەستیان پێ بکرێ بە چاوو گوێچکەو لوتو دەم و دەست، چونکە بەو شتانە تاقیکردنەوە پەیدا ئەبێ .

٢- (هُدی) کە بریتی‌یە لە زانینی شتێ بەهۆی ئەقڵە بە تەنها کە بوونی خوای مەزنی پێ ئەزانرێ بە تەماشاکردنی ئەم گەردونەو ئەم بونەوەرە سەرسوڕێنەرانە، ئەو ئەقڵەیش ئەبێ دوربێ لە دەمار زلی و بێ باوەڕی .

٣- (کِتابٍ مُنیرٍ) کە بریتیە لە سروش هەموو شتێکی نەبینراو ئەزانرێ، وەك بوونی جنۆکەو فریشتەکان و کاتی هاتنی ڕۆژی دووایی و پرسیارو وەڵامی ڕۆژی دوایی .

﴿ ثانيَ عِطْفِهِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبيلِ اللهِ لَهُ في الدُنْيا خِزيٌ وَنُذيقُهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَذابَ الْحَريقِ ﴾ ئەو کەسەی گفتوگۆی بێ جێگەی ئەکرد تەنیشت و گەردنی خۆی وەرئەچەرخان و بەدعیەو بە دەمارەوە وازی لە ڕاستی ئەهێنا لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد لابدا لە ڕێگەی ڕاست و لە ئایینی خوای مەزن وەك خۆی لایدابوو لە ڕێگەی ڕاست، بۆ ئەو کەسە هەیە ڕیسوایی لە جیهاندا بە کوشتن و بە دیل کردن و بەبێ نرخی وەك ئەوەی توشی بوو لە جەنگی بەدردا و ئێمە بەو کەسە ئەچێژین لە ڕۆژی دوایدا سزای ئاگرێکی سوتێنەر. بەو کەسە ئەبێژرێ لەو ڕۆژەدا .

﴿ ذلِكَ بِما قَدَمَتْ يَداكَ وَأَنَّ اللهَ لَيْسَ بِظَلامٍ لِلْعَبيدِ ﴾ ئەو ڕیسوایی جیهانەو ئەو سزای ڕۆژی دوایی بەهۆی ئەوەبوو تواناو دەستەکانی تۆ لەمەو پێش کردبووی لە بێ فەرمانی خوای مەزن و خوای مەزن بە ڕاستی ستەم لە بەندەی خۆی ناکا، خوای مەزن ئەقڵی داوەتێ چاکە بکا.

﴿ وَمِنَ الناسِ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ عَلَى حَرْفٍ ﴾ وەهەندی لە ئادەمیزاد هەن کەسێ خوای مەزن ئەپەرستێ لەسەر لایەنێ لە ئایین و بە مەرج و بە گومانەوەو بەردەوام نەئەبوو لەسەر ئایین ئەگەر مەرجەکەی نەهاتبایەتە جێ، وێنەی کەسێ دوای لەشکر ئەکەوێ ئەگەر سەرکەوتن خۆی ئەکا بە ناویانا خۆ ئەگەر شکان ڕائەکاو بە جێیان ئەهێنێ.

﴿ فَإِنْ أَصابَهُ خَيْرٌ أَطْمأنَ بِهِ وَإِنْ أَصابَتْهُ فِتْنَةُ إِنْقَلَبَتِ عَلَى وَجْهِهِ ﴾ دوایی ئەگەر تووشی ئەو کەسە ببوایە چاکەیە لە ساغی لەش و دارایی ئەو کەسە ئارامی ئەگرت و لەسەر ئایین ئەمایەوە ئەگەر تووشی خراپەیە ببوایە ئەو کەسە لە ئایین وەرئەگەڕاو ئەڕۆیشت بۆلای ئایینە پێشوەکەی خۆی .

﴿ خَسِرَ الدُّنيا وَالأخِرَةِ ذلِكَ هُوَ الْخُسْرانُ الْمُبينُ ﴾ ئەو کەسە زەرەری کرد لە جیهاندا بە ئاواتی خۆی نەگەیشت، تووشی هەژاری بوو، زەرەریشی کرد لە ڕۆژی دواییداو کارەکانی خۆی پوچ کردەوەو پاداشتی چاکەکانی وەرناگرێ، ئەو زەرەرانەی هەردوو جیهان زیانۆمەندی ئاشکرایە.

بەکورتی ئەو ئایەتانەی ڕابوردن هاتوەتە خوارەوە دەربارەی ئەو عەرەبە دەشتەکیانە کۆچیان ئەکرد بۆ مەدینەو باوەڕیان ئەهێنا ئەگەر تووشی نەخۆشی نەبوونایە و ئاژەڵەکانیان بەروبومی زۆر ببوایە بەو ئاینە خۆشحاڵ ئەبوون، ئەگەر نەخۆشی بکەوتنایە و بەروبومیان کەم بوایە ئەیان ووت: ئەمە هۆی ئەم ئاینەیەو لە ئایین وەرئەگەڕان و ئەچونەوە بۆلای ئایینەکەی خۆیان کە لەسەری بوون، ئەوەی ڕاستیبێ لەم سەردەمەی ئێمەیشدا کەسانی وا هەن. باوەڕداری ڕاستی ئەوەیە نیازی پاکبێ و لەهەموو کاتێکا بەردەوامبێ لەسەر ئایین و خواپەرستی .

﴿ يَدْعُو مِنْ اللهِ مالا يَضُرُوهُ وَمالا يَنْفَعَهُ ذلِكَ هُوَ الضلالُ الْبَعيدُ ﴾ ئەو کەسە شتێ ئەپەرستێ لەجگەی خوای مەزن لە بتەکانیان زیان لەو کەسە نادات و سوودی پێ ناگەیەنێ بیپەرستێ یانەیپەرستێ، چونکە ئەوان درەخت و بەردی بێ گیانن، ئەو پەرستنە گومڕایەکی زۆر دوورە لە ڕاستی .

﴿ يَدْعُو لَمَنْ ضَرُهُ أقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ لَبِئْسَ الْمَوْلى وَلَبِئْسَ الْعَشيرُ ﴾ ئەو کەسە بەڕاستی کەسێ لە گەورە تاوانبارەکان ئەپەرستێ و یارمەتیان ئەدا بە نیازی سوودی تایبەتی جیهان زیانی نزیکترە لە سوودی و سوودەکەیان بەرانبەر بە سزای خوای مەزن بە هیچ شتێ دانانرێ. بەڕاستی باری دەرو دۆستێکی خراپە ئەو کەسە و خراپ هاوڕێیەکە پاڕانەوەو پەنا بردن بۆلایان بێ سوودە .

﴿ إنَ اللهَ يُدْخِلُ الذيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ جَنّاتٍ تَجْري مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ إنَ اللهَ يَفْعَلُ ما يُريدُ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەیان کردوە ئەیان خاتە نێو چەندین بەهەشت ئەڕوا بەژێر درەخت و ئەم لاو لای کۆشکەکانیانا چەندین ڕوباری ئاوی شیرین و پاك. بەڕاستی خوای مەزن هەموو شتێ ئەکا بیەوێ. ئەوەی پیاو چاکە پاداشتی خۆی ئەداتێ، ئەوەی پیاو خراپە تۆڵەی لێ ئەستێنێ کۆمەڵی لە هۆزی غەتفان باوەڕیان نەئەهێنا ئەیان ووت: لەوانەیە ئەم کارەی موحەمەد نەچێتە سەرو سەرنەکوێ و دۆستایەتی جولەکەکان ببچڕێ و کۆمەکیمان نەکەن، خوای مەزن فەرموی:

مَن كَانَ
يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى

ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾

﴿ مَنْ كانَ يَظُنُ أنْ لَنْ يَنصُرَهُ اللهُ في الدُنيا والأخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَ إلى السَماءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنْظُرْ هَلْ يَذْهِبَنَ كَيْدُهُ ما يَغيظُ ﴾ هەرکەسێ گومان ئەبا کەخوای مەزن یاریدەی پێغەمەری خۆی نـادا لـە جیهاندا بە بەرزکردنەوەی ووشەی ئاین و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنانیدا لـە دوارِۆژیشدا بـە پلەو پایەی بەرزو ڕێزگرتنی، دوایی با ئەوکەسە بمرێ لـە خەفەتا بـەوەی گوریسـێ ببەستێ بـە داری خانوەکەی خۆیەوەو بیبەستێ بە ملی خۆیەوە هەتا ئەخنکێ لــە پاشا جێگـەی هەناسـەی خۆی ببڕی بەهۆی ئەو گوریسەوە، دوایی با تەماشا بکا، ئایا ئەو کارو پیلانەی شتێ ڕقی ئـەو پەیدا ئەکا لای ئەبا کە سەرکەوتنی ئایینی ئیسلامە؟ ئەو کارە ئەو کەسە بیکا بەخۆی ئەوپـەڕی توانای ئەوە لـەوە زیاتر هیچ شتێ تری بۆ ناکرێ .

﴿ وَكَذلِكَ أنزَلْناهُ آياتٍ بَيناتٍ وَأنَ اللهَ يَهْدي مَنْ يُريدُ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی ئێمە نامە پێشوەکانمان ڕەوانە کردووە هەروایش ئێمە قورئانمان ڕەوانەکردووە بۆسەر موحەمەد. ﴿ ﷺ ﴾ بە چەندین ئایەتی ڕوون و ئاشکرا لە فەرمودەکانی ئێمە و بە ڕاستی خوای مەزن ڕانموویی کەسێ ئەکا ئارەزوی بکا بە هۆی ئەو قورئانەوە .

﴿ إنَ الذيْنَ أمَنُوا وَالذيْنَ هادُوا وَالصّابِئِينَ وَالنصارى وَالْمَجُوسَ وَالذيْنَ أشْرَكُوا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە خواو بە موحەمەد هێناوە کەسانێکی ئەوتۆ جولەکەن پەیوەندی دارن بۆلای تاقمەکانی سەر بەموسا و ئەستێرە پەرستەکان و گاورەکانی سەر بەعیسا وئاگر پەرستەکان و کەسانێکی ئەوتۆ هاوبەش بۆ خوای دائەنێ و بت پەرستن. خوای مەزن بە بیروباوەڕی هەموویان ئەزانێ لەو شەش تاقمانە .

﴿ إنَ اللهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ إنَ اللهَ عَلَى كُلِ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن فەرمان ئەدا لە نێوان هەموویانا لە ڕۆژی دواییدا و چاك و خراپیان جوێ ئەکاتەوە، دوایی پاداشتی هەریەکەیان ئەداتەوە بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆیان، هەریەکەیان ئەخاتە جێگەیە بۆیان ئامادەکراوە، باوەڕداران بۆ بەهەشت و بێ باوەڕان بۆلای دۆزەخ. بەڕاستی خوای مەزن هەموو کارێکی ئەوان ئەزانێ و ئاگاداری هەموویانەو هیچ شتێکی لێ وون نابێ .

﴿ ألَمْ تَرَ أنَ اللهَ يَسْجِدُ لَهُ مَنْ في الْسَماواتِ وَمَنْ في الأرْضِ وَالْشَمْسُ وَالْقَمَرُ وَالْنجُومُ وَالْجِبالُ وَالشَجَرُ وَالدَوابُ وَكَثيرٌ مِنَ الناسِ وَكَثيرٌ حَقَ عَلَيْهِ الْعَذابُ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کە بە ڕاستی سوژدەو کوڕنوش ئەبەن بۆ خوای مەزن کەسێ لە ئاسمانەکاندان لە فریشتەکان بەسەربەخۆیی خۆیان وجگەی فریشتەکان و کەسێ لە زەویدان لە موسڵمانان بە خواستی خۆیان بێ باوەڕان بەسەرشۆڕیەوە سوژدەیشی بۆ ئەبەن و خۆرومانگ و ئەستێرەکان و کێوەکان و درەخت و هەموو ئەو شتانەی ئەڕۆن بەسەر زەویداو زۆر کەس لە باوەڕداران کە باوەڕیان بە خوای مەزن هەیەو زۆر کەسیش لە ئادەمیزاد کە پێویست کراوە لەسەریان خوای مەزن سزایان بدا کە ئەو کەسانەن گاڵتە بە باوەڕداران ئەکەن. ئەوانە هەموویان سەرشۆڕی خوای مەزنن و زۆربەیان خوای مەزن ڕامی کردوون و کار ئەکەن بۆ سودی ئادەمیزادو سوژدە ئەبەن.

﴿ وَمَنْ يُهِنِ اللهُ فَما لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إنَ اللهَ يَفْعَلُ ما يَشاءُ ﴾ وەهەر کەسێ خوای مەزن ڕیسواوسەرشۆڕی بکا بەهۆی بێ فەرمانی خوای مەزنەوە، دوایی هیچ کەسێ نیە ڕێزی ئەو کەسە بگرێ، هەرکەسێ خوای مەزن دای نەوێنێ کەس بەرزی ناکاتەوە، هەرکەسێ خوای مەزن بەرزی بکاتەوە کەس نی‌یە نزمی بکاتەوە. بەڕاستی خوای مەزن ئارەزوی هەرشتێ بکا ئەیکا. خودای مەزن چەند دەستورێکی داناوە لە نێو بونەوەرانی خۆیا و لادان لە دەستورانە

نەگونجاوە، ئەمەیە: هەرکەسێ بە ڕێگەی خراپا بڕوا لەناو ئەچێ و هەرکەسێ بە ڕێگەی چاکا بڕوا بێ وەی و بێ ئازارە، ڕێگەی چاك و ئاسودە لای خوا باوەڕهێنانی ڕاستیە، ڕێگەی ڕیسوایی دووڕویی و خراپە کردنە لە زەویدا .

هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾

﴿ هذانِ خَصْمانِ اخْتَصَمُوا في رَبِهِمْ ﴾ ئەوانــە دوو تـاقمن و دوژمنـی یـەكترین دوژمنایـەتی یەكتری ئەكەن لـە بارەی ئایین و پەروەردگاری خۆیانەوە،هەریەكـەیان ئـەڵێن: ئێمـە ڕاستین و شایانترین بۆ ئاینی خوای مەزن .

بۆزانین: پیتی (واو) لـە ووشەی (اخْتَصَمُوا) بە كۆیە ئەگەڕێتەوە بـۆلای ووشـەی (خَصْمـانِ) هەرچەندە بۆ دوانە. بەڵام ئەو دوو تاقمە هەر یەكێكیان چەند كەسێكی زۆرن، لـەبەر ئەوە پیتـی كویَ بۆ گەڕاوەتەوە. هەرچەندە دروستە ببێژرێ (اخْتَصَما)ئەو دوو تاقمە بریتین لـــە تـاقمی بـێ باوەڕان و تاقی باوەڕداران خوای مەزن باسی هەریەكەیان ئـەكا بەشـتێ شایسـتەیانبێ و خـوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فالذيْنَ كَفَرُوا قُطِعَتْ لَـهُمْ ثِيـابٌ مِنْ نـارٍ يُصَـبُّ مِـنْ فَـوْقِ رُؤُوسِـهِمُ الْحَمِيـمُ ﴾ دوایـی كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان بە ئاینی خوای مەزن نەهێناوەو دیاری كراوە بۆیان بەرگێ لـە ئاگر بە ئەندازە لـەشیان و ئەكرێتە بەریان ئاوی گەرم ئەڕێژرێ بە تەوقی سەریانا .

﴿ يُصْهَرُ بِهِ ما في بُطُونِهِمْ والْجُلُودُ ﴾ ئەتوێتەوە شتێ لـە سكیانا لـە گۆشت و چەوری لـەگەڵ پیسیانا بەهۆی ئەو ئاگرو ئاوە گرمەوە. بــە كورتـی لـەشـیان بـە دەرەوەیـی و بەناوییـە هـەموو ئتوێتەوە .

﴿وَلَهُمْ مَقامِعُ مِنْ حَديدٍ كُلَما أرادُوا أنْ يَخرُجُوا مِنْ غَمّ أعِيدُوا فِيها وَذُقُوا عَذابَ الْحَرِيــقِ﴾ وە هەیە بۆ سزادانی بێ باوەڕان چەند گورزێك و چەن ئەستونێ لـە ئاسنی گـەرم بـەو گورزانـە لێیان ئەدرێ، هەموو كاتێ بیانەوێ لـەو ئاگرە بچنە دەرەوەو لـەو خەفەتە سەختەی توشیان بووە ڕزگاریان ببێ ئەگێڕرێنەوە بۆ ناو ئەو ئاگرەو ئەبێژرێ بەوان: ئێوە بچێژن ئاگری زۆر سەخت و سوتێنەر .

﴿ إنَ اللهَ يُدْخِلُ الذيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ جَناتٍ تَجْرِى مِنْ تَحْتِها الأنْـهارُ ﴾ بەڕاسـتی خوای مەزن كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردووە ئەیان خاتە چەندین بەهەشت ئەڕوا بەژێر درەختەكانیانا و ئەم لاو ئـەولای كۆشـكەكانیان چـەندین ڕوبـاری ئـاوی شیرین.

﴿ يُحَلَوْنَ فِيها مِنْ أسَاوِرَ مِنْ ذَهَـبٍ وَلُؤْلُـؤاً وَلِباسُـهُمْ فِيـها مِـنْ حَرِيـرٍ ﴾ ئـەو باوەڕدارانـە ئەڕازێنرێتەوەو ئارایش ئەدرێن لـەلایەن فریشـتەكانەوە بـە چـەند بـازنێك و پامورەیـە لــە زێـڕو مرواری بەنرخ، بەرگەكانیشیان لـە ئاوریشمە لـە بەهەشتا .

﴿ وَهُدُوا إلى الطَيْبِ مِنَ الْقَوْلِ وَهُدُوا إلى صِراطِ الْحَمِيدِ ﴾ وەئەو باوەڕدارانە لـەلایەن خوای مەزنەوە شارەزا كراون بۆلای گفتوگۆیەكی پاك كــە ووشـەی (لا إلـه إلاّ الله)یـەو باوەڕهێنـانی

خۆیان ڕائەگەیەنن و بلاوی ئەکەنەوە لە جیهاندا وشارەزایی ئەکرێن بۆلای ڕێگەیە خۆی لە خۆیا ئەنجامەکەی سوپاسی لەسەر ئەکرێ کە ڕەزامەندی خوای مەزنەو چونیانە بۆ هەشت .

﴿ إنَّ الذيْنَ كَفَرُوا وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبيْلِ اللهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرامِ الذي جَعَلْناهُ لِلناسِ سَواءً الْعاكِفُ فيهِ وَالْبادِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوەو ڕێگە لە ئادەمیزاد ئەگرن بچنە ناو ئاینی خوای مەزنەوەو نایەڵن کۆچ بکەن بۆمەدینەو ڕێگەیان لێ ئەگرن و نایەڵن بچن بۆلای مزگەوتی ڕێزدار بۆ بەجێ هێنانی حەج و عەمرە ئەو مزگەوتەی ئەوتۆ ئێمە گێڕاومانە بە جێکەی پەرستنی خوای مەزن و یەکسانە چوون بۆلای ئەو مزگەوتە بۆ کەسانێ لەلای دانیشتووان و ئەوانەی لە دەشتەوە دێن و بۆ کەسێ بیانەوێ زیارەتی بکەن .

﴿ وَمَنْ يُرِدْ فيهِ بِإلحادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنَ عَذابٍ أليمٍ ﴾ وەهەر کەسێ بیەوێ لەو مزگەوتە ڕێزدارەدا لابدا لە فەرمانی خوای مەزن بەستەم کردن لەو کەسانەی دێن بۆ زیارەتی ئەو مزگەوتە ئێمە بەو کەسەی ئەچێژین سزایەکی زۆر خاوەن ئازار. هەرکەسێ بێ فەرمانی خوای مەزن بکا لەو مزگەوتە بە ستەمکار ئەژمێررێ و شایەنی سزادانە .

وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾

﴿ وَإِذْبَو أنا لأَبْراهِيمَ مَكانَ الْبَيْتِ أنَ لا تُشْرِكْ بي شَيْئاً ﴾ وە تۆ بیری ئەو كاتە بكەرەوە ئێمە ئامادەمان كرد بۆئیبراهیم جێگەی دروست كردنی ئەو خانووەی ئێمە و بنچینەو شوێنەوارەكەیمان پێ نیشاندا كە جێگەی ئەو خانووە بەر لە ئیبراهیم بە هۆی تۆفانەو خۆڵ دای پۆشیوە. ئەوەیش ئەوە ئەگەیەنێ ئەو خانووە لە كاتی نوحا هەبوەو پەرستنی تێداكراوە، دوایی ئێمە ڕامان گەیاندن بە ئیبراهیم و فەرمانمان پێدا كە تۆ هاوبەشی بۆ ئێمە دامەنێ بە هیچ شتێ .

﴿ وَطَهِرْ بَيْتي لِلطائِفينَ وَالْعاكِفينَ وَالرُّكَّعِ الْسُجُودِ ﴾ وەتۆ خانوی من پاك بكەرەوە لە بت و لە پیسایی بۆ ئەو كەسانە بەدەوریا ئەسوڕێنەوەو بۆ ئەو كەسانە لەلایا دائەنیشن بۆ نوێژ كەرانێ ڕكوع و سوژدە ئەبەن بۆخوا ی مەزن. بێژراوە جورهومەیەكان لە جێگەی خانەی خواداو لەم لاو لایا چەن بتێكیان دانابوو، بۆیە خوا فەرمانی دا بە ئیبراهیم پاكی بكاتەوە. ئەو ئایەتە هەڕەشەیە لە قوڕەیشیەكان كە لە نەوەی ئیبراهیمن كەچی ئەوان خانەی خوایان پڕكردووە لە بت وئەیان ئەكەن بە هاوبەشی خوای مەزن.

﴿ وَأذَنْ في الْناسِ بالْحَجِ يأتُوكَ رجالاً وَعَلَى كُلِّ ضامِرٍ يَأتِينَ مِنْ كُلِّ فجٍ عَمِيقٍ ﴾ وەتۆ جاربدە بە نێو ئادەمیزادا بێن بۆلای تۆ بۆ جێبەجێ كردنی حەج لەلای خانەی ئێمە بە پیادەیی و لەسەر سواربوونی هەموو هوشترێكی لاوازو ماندو بە ڕۆیشتن دێن لە هەموو ڕێگەیەكی دوورەوە.

زانایان بیروبۆچونیان جیاوازە: ئایا خوای مەزن بە ڕستەی (أذَنْ) ڕوی فەرمودەی خۆی بۆلای موحەمەد ئەكا یا بۆلای ئیبراهیم، بەگوێرەی باس كردن ئیبراهیم لێرەدا ڕوی فەرمودەی خوای مەزن بۆلای ئیبراهیمە، هەرچۆنێ بێ فەرمانی داوە بە هەردووكیان بانگی ئادەمیزاد بكەن بۆ هاتنیان بۆلای خانەی خوای مەزن بۆحەج كردن .

﴿ لِيَشْهَدُ وَآمنافِع لَهُمْ ﴾ لەبەرئەوەی ئامادەبن بۆ وەرگرتنی چەند سوودێ بۆخۆیان، سوودی ئاینی بێ وەك داواكردن لە خوای مەزن بۆ لێ بوردنی گوناهەكانیان یا جیهانی بێ وەك بازرگانی و بینینی كۆڕو كۆمەڵی باوەڕداران و ڕاوێژكردن لە نێوان خۆیاندا بۆ لەناو بردنی ناكۆكی و بۆ پەرەپێدانی ئایینی ئیسلام و چەندین سوودی تر .

﴿ وَيَذْكُرُوا إسْمَ اللهِ في أيامٍ مَعْلُوماتٍ عَلَى ما رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِمَةِ الأنْعامِ ﴾ و بۆ ئەوەیش باسی ناوی خوا بكەن لە كاتی سەربڕینی قوربانیەكانیانا لە چەند ڕۆژێكی دیاری كراودا لەسەر شتێ خوای مەزن كردویەتی بە خواردن بۆ ئەوان لە چواربێ بەسەر زمانەكان كە بریتین لە هوشترو گاو بزن و مەڕ. ئەو ڕۆژانە بریتین لە ڕۆژی قوربان و سێ ڕۆژی دووای چەژن، هەرچەندە هەندێ لە زانایان ئەڵێن: بریتین لە نۆهەمی مانكی زیل حیجە هەتا كۆتایی سێزدەی ئەو مانگە .

﴿ فَكُلُوا مِنْها وَأطْعِمُوا الْبائِسَ الْفَقيْرَ ﴾ دوایی ئێوە بخۆن لە گۆشتی ئەو بەسەزەمانانە كردونتان بە قوربانی و ئێوە بیكەن بە خواردن بۆكەسێ ئازارێكی توشببێ و هەژاربێ. زانایان

بیروبۆچونیان جیاوازە: ئایا پێویستە خاوەن قوربانیە لــە گۆشتەکەی بخوا یا نـە؟ ئەگـەر ئـەو قوربتانیە پێویست نەکرابێ یا بە ڕاسپاردەی مردو نەکرابێ بە قوربانی دروستە بیخوا، ئەگینا نابێ بیخوا. بەڵام فەرمودەی خوا کە ئەفەرموێ: بیخۆن لەبەر ئەوەیە بزانرێ خواردەمەنی قەدەغە نیە چونکە بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام قەدەغە بووە خاوەنەکانیان لە گۆشتەکەی بخۆن .

﴿ ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُم وَلْيُوفُوا نُذُ ورَهُمْ وَلْيَطَوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾ لە پاشـا چڵـك و چەپـەڵی لەشی خۆیان لابەن و خۆیان بشۆرن و بەرسمێڵ و نینۆکیان بکەن. بەڵام بەر لە فڕێدانی حـەوت بەرد لەو شتانە قەدەغەن، وە با قوربانیەکان پێویستیان کردووە لەسەر خۆیان جێبەجێیان بکەن و با ئەوان دوای سەرتاشین و بەرد فڕێدان، بگەڕێن بەم لاو لای ئەو خانوە کۆنەدا کە یەکەمین خانوە دروست کراوە بۆ جێگەی پەرستن، دوای ئەو گەڕانە هەموو شتێ ڕەوا ئـەبێ بـە چوونـە

ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ

فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ ذٰلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُماتِ اللهِ فَهُو خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِهِ ﴾ ئەو شتانەی باسکران لە کارو کردەوە حەج فەرمانی خوای مەزنن و هەرکەسی بە گەورە بگرێ فەرمانە ڕێزدارەکانی خوای مەزن لەو شتانەی پەیوەندییان بە حەجەوە هەیە، دوایی ئەو بە گەورەی گرتنە بۆ ئەو کەسە چاکتر لای پەروەردگاری خۆی، خوای مەزن پاداشتی ئەداتەوە لە ڕۆژی دواییداو هیچ شتێ شایەنتر نیە لای خوای مەزن لە پەرستنی خوای مەزن و لە مل کەچ کردن بۆی .

﴿ وَأحِلَتْ لَكُمْ الأنْعام إلاّ ما تُيلى عَلَيْكُمْ ﴾ وە ڕەوا کراوە بۆ ئێوە خواردنی گۆشتی چوارپێکان لە بزن و هۆشتر و مەڕو گاو دوای سەربڕینیان مەگەر شتێ ئەخوێنرێتەوە بەسەر ئێوەدا لە ئایەتی (٣)ی سورەتی ئەلمائیدە، وەك گۆشتی مرداربوو خواردنی خوێن و گۆشتی بەرازو ئەو شتەی بۆ ڕێزگرتن لە جگەی خوای مەزن سەر ببڕێ و گۆشتی خنکێنراوەکان و بە شۆق کوژراو و پاش ماوەی خوراوی دڕندەکان و نێچیرگرتن و خواردنی گۆشتەکەی بۆ کەسێ لە ئیحرامی حەج یان عیمرەدابن .

﴿ فأجْتَنِبُوا الرِجْسَ مَنَ الأوثانْ وَأجْتَنِبُوا الزُور ﴾ دوایی ئێوە خۆتان دورخەنەوە لە هەمووشتێ بێزی لێ کرابێ لە پەرستنی بتەکان و لە نرخ دانان بۆ خاچی گاورەکان و لە خواردنەوە مەیی و کردنی قوماروکێشانی تریاك و خۆیشتتان دورخەنەوە لە گفتوگۆی درۆو هەڵبەستن بەدەم یەکێکی بێ تاوانەوەو لە پاش ملە لە ناوبردنی مرۆڤ بە خراپە و جنێودان و شتی پڕوپوچی تر .

﴿ حنفاء للهِ غَيْرَ مُشْرِكينَ بِهِ ﴾ ئێوە کە خۆتان دور ئەخەنەوە لەو شتە پیسانە لە پەرستنی خوای مەزندا نیازتان پاکبێ و خۆتان لادەن لە هەموو ئایینە پوچەکان و مەکەن بە هاوبەشی بۆ خوای مەزن هیچ کەسێ لە دروشمەکانی حەج و عەمرە .

﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَكَأَنَما خَرَّ مِنَ السَّماءِ فَتَخْطَفَهُ الطَّيْرُ ﴾ وەهەرکەسێ هاوبەشی بۆخوا دابنێ، دوایی بەڕاستی وەك ئەوە وایە ئەو کەسە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە بۆسەر زەوی باڵندەکان ڕای کێشن بە وێنەی مردارەوە بوو پارچەکانی بکەونە نـاو چیکلدانیـەوە. بێگومان ئەو کەسە خۆی لەناوبردوە .

﴿ أو تَهْوِى بِهِ الرِيحُ فِي مَكانٍ سَحِيقٍ ﴾ یا بایەکی زۆر سەخت و تیژ ئەو کەسە فـڕێ بداتە جێگەیەکی دور لە ئاودانی و کەس نەتوانێ پێی بگاو ڕزگـاری بکـا، ئـەو ڕستانە هێمـان کـە بەڕاستی گوناهی هاوبەشی دانان بۆ خوای مەزن هیچ گوناهێ هاوتای ناکـا، دوای ئـەو سزایە سزایەکی گەورەتر نی‌یە.

﴿ ذِلِكَ وَمَنْ يُعَظِمْ شعائِرَ اللهِ فَأنها مِنْ تَقْوى الْقُلُوبِ ﴾ ئەو شـتانەی باسـکران لـە بـارەی دوربوون لە هاوبەشدانان بۆخوای مەزن و دوربوون لە بت پەرستی و بوختان،فـەرمانی خـوای مەزن و هەر بە گەورە بگرێ درۆشمەکانی ئایینی خوای مەزن و ڕێزیان بۆ دانێ، دوایی بە ڕاستی بە گەورە دانان و ڕێزگرتنی درۆشمەکانی ئایینی خـوای مـەزن هەندێکـە لـە کارەکـانی کەسێ خاوەنی دڵێکی پاکبێ و لـە خوای مەزن بترسێ. هەندێکە لە درۆشمەکانی ئاینی خوای مەزن ئەو گیاندارانەی سەر ئەبڕێن بۆ قوربانی چاکبن و نرخیان گرانبێ و عەیبەدار نەبن و ئەو مەرجانەی لە نامە یاساییەکاندا باسکراون لەواندا هەن.

﴿ لَكُمْ فِيها مَنافِعُ إلى أجَلَ مُسَمى ثُمَ مَحِلُها إلى الْبَيْـتِ الْعَتِيـقِ ﴾ بـۆ ئێـوە ڕەوایـە چـەندین سودێ لەو چوار پێیانە ئێوە داتان ناون بکرێن بە قوربانی هەتا ئەو کاتەی دیاری کراوە بۆسـەر بڕینیان و سەریان ئەبڕن ئەو سودانەیش وەك خواردنەوەی شیرەکان و سواربونیان و بارکردنیـان و بەکارهێنانی خوری و موەکانیان لـە پاشا کاتی پێویستبوونی سەربڕینیان کۆتـایی پـێ دێ هـەتا سەریان ئەبڕن لەلای خانوەکۆنەکەی خوای مەزن و لەلای شارەوانی مەکەو لە مینا.

﴿ وَلِكُـلِ أمَـةٍ جَعَلْنـا مَنسَـكاً لِيَذْكُـرُوا إسْـمَ اللهِ عَلَـى مـا رَزَقَـهُمْ مِـنْ بَهِمَـةِ الأنْعـامِ ﴾ وەئێمەگێڕاومانە بۆ هەموو تاقمێکی باوەڕدار جێگەیـە بـۆ پەرسـتنی خـوای مـەزن و سـەربڕینی قوربانیەکانیان هەر لـە کاتی ئیبراهیمەوە هەتاکاتی هاتنی ئایینی ئیسلام لەبەرئەوەی هـەر بەتەنـها باسی ناوی خوای مەزن بکەن لە کاتی سـەربڕینی قوربانیـەکانیان لەسـەر شـتێ خـوای مـەزن کردویەتی بە خواردەمەنی بۆ ئەوان لـە گۆشتی بەسەزمانەکانی چوارپێ. کەواتە قوربانی کـردن شتێکی تازە نی‌یە. هەرچەندە داواکاری خوای مەزن ئەگۆڕێ بە گوێرەی کات و جێگە .

﴿ فَأِلَهُكُمْ إلَهٌ واحِدٌ فَلَهُ أسْلِمُوا ﴾ دوایی خوای ئێوە خوایەکی تەنهایە کە ناوی ببەن ونـاوی جگەی ئەو مەبەن لـە کاتی سەربڕینی چوار پێکانتان، دوای ئێوە هەر مل کـەچی ئـەوین و هـەر ئەو بپەرستن .

﴿ وَبَشِرِ الْمُخْبِتينَ الَّذينَ إذا ذُكِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ وەتـۆ مـوژدە بـدە بـە ئەوكەسـانەی ئەوتۆ لەخوا ئەترسن و پەیڕەوی فەرمودەکانی خوای مەزن ئەکەن هەر کاتێ نـاوی خـوا بـبرێ ترسی دڵیان پەرە ئەسێنێ لەبەر گەورەیی خـوای مـەزن موژدەیـان بـدەرێ بـە بەهەشـت و بـە ڕەزامەندی خوای مەزن.

﴿ وَالصابِرِينَ عَلَى ما أصابَهُمْ وَالْمُقيمي الصَّلاةِ وَمِما رَزَقْناهُمْ يَنفِقُون ﴾ وە تۆیش موژدە بدە بە ئەوکەسانەی ئارام ئەگرن لەسەر ناخۆشی و ئاژاوە لەسەر بەجێ هێنانی فەرمانـەکانی خـوای مەزن و بەو کەسانە بە نیازی پاکەوە بەردەوامن لەسەر کردنی نوێژەکان و هەندێ لەو شتانەی ئێمە پێمان بەخشیون ئەیدەن بە هەژاران هەر لەبـەر ڕەزامـەندی خـوای مـەزن. بێگومـان ئـەو کارانە لەهەر کەسێکا کۆبێتەوە پلەو پایەی بەرزی ئەدرێتێ .

وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾

﴿ وَالْبُدْنَ جَعَلْناها لَكُمْ مِنْ شَعائِرِ اللهِ لَكُمْ فيها خَيْرٌ ﴾ وە ئێمە ناردنی ئەو هوشترانە بە دیاری بۆ کەعبە گێڕاومانە بە هەندێ لەدروشمەکانی ئایینی خوای مەزن بۆ ئێوە هەیـە لـە بـە قوربـانی کردنی ئەواندا چاکەی زۆر گەورە بۆ ئێوە لە جیهان و لە پاشەڕۆژدا. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: گایش وەکهوشتر وایە لەو چاکەیەدا.

﴿ فأذْكُرُوا اللهِ عَلَيْها صَوافَ فَأذا وَجَبَتْ جُنُوبُها فَكُلُوا مِنْها وَأطْعِمُوا الْقانِعَ وَالْمُقَرَّ ﴾ دوایـی ئێوە باسی ناوی خوا بکەن لەسەر ئەو هوشترانە لەکاتی سەبڕینیانا کە ڕێزدراون بۆ سـەربڕین و وەستاون لەسەر سێ لاقیان و لاقەی تریان بەسـتراوەتەوە بڵێـن: بـە نـاوی خـوای بەخشـندەی میهرەبان، دوایی کاتێ گیانیان دەرچوو تەنیشتیان کەوتە سەر زەوی دوای سەربڕین، دوایی ئێوە

لە گۆشتەکانیان بخۆن و ئێوە بیکەن بە خواردەمەنی کەسێ ڕازی ئەبێ بەشتێ بیدرێتێ بەبێ داواکردن و بۆ کەسێکیش خۆی دەرئەخا بۆ دانیشتوان و داوای ئەکا .

﴿ كَذلِكَ سَخَرَها لَكُمْ لَعَلَكُمْ تَشكُرُونَ ﴾ هەر بەو جۆرەی ئێمە سەربڕینەکانیمان بۆ ئێوە ڕەوا کرد ئێمە ئەو هوشترانەمان ڕەوا کردووە بۆ ئێوە سواریان ببن و بەکاریان بهێنن بۆ کاروباری خۆتان شیرەکانیان بخۆن بەو لەشە گەورەییەوە هەیانە مل کەچی ئێوەن، بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی ئێمە بکەن لەسەر ئەو چاکانەی ئێمە بۆتان.

﴿ لَنْ يَنالَ اللهَ لُحُومُها وَلا دِماؤُوها لكِنْ يَنالُهُ التَقْوى ﴾ ناگا بە خوای مەزن ئەو شتەی کە ئێوە ئەیدەن بە هەژاران بە خوای مەزنیش ناگا ئەو خوێنە ڕژاوانە لە کاتی سەربڕینیاناو بەلام ئەگاتە لای خوای مەزن و بەرز ئەبێتەوە بۆلای ترسی ئەو دلانەی ئێوە پاڵ ئەنێ بە ئێوەوە بۆ نزیکبوونەوە لە خوای مەزن .

﴿ كذلِكَ سَخَرَها لَكُمْ لِتُكَبِرُوا اللهَ عَلى ما هَداكُمْ ﴾ هەر بەو جۆرەی خوای مەزن شارەزایی ئێوەی کرد بۆلای دروشمەکانی ئایینی خۆی ئەو هوشترانەی ڕام کردووە بۆ ئێوە لەبەر ئەوەی خوای مەزن بە گەورە بگرن و بەبێ هاوبەشی دابنێن لەسەر شتێ شارەزایی ئێوەی کردووە بۆلای ڕام کردنی ئەو هوشترانەو بۆلای نزیکبوونەوە لە خوای مەزن و لە سزای بترسن و بە تەمای پاداشتی ئەوبن. دووپات کردنەوەی ڕستەی (سَخَرَها) بۆ بیرکردنەوەی ئێوەیە لەسەر چاکە زۆرەکانی خوای مەزن لەسەرتانەوە.

﴿ وَبَشِرِ الْمُحْسِنِينَ ﴾ وە تۆ موژدە بدە بە هەموو چاکەکەرانی نیاز پاك بە بەهەشت و بە ڕەزامەندی خوای مەزن ئیتر چاکەیان بۆ نزیکبوونەوەبێ بۆلای خوای مەزن بەهۆی قوربانی کردنەوەبێ یا بە جگەی قوربانی بێ.

کاتێ باوەڕداران پەرەیان سەند لە مەکەو بێ باوەڕان ئازاریان ئەدان، هەندێکیان کۆچیان ئەکرد بۆلای حەبەشە، هەندێ لە باوەڕداران کە ئازاری زۆریان ئەدان و ویستیان بە نهێنی ئەوەی بۆیان ئەرەخسێ لەبێ باوەڕان بکوژن لە تۆڵەی خۆیانا، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو کارەی بە ڕەوا نەزانی، خوای مەزن فەرموی:

إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن

يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾

﴿ إنَ اللهَ يُدافِعُ عَنْ الَّذيْنَ آمَنُوا ﴾ بە ڕاستی خوای مەزن باوەڕداران ئەپارێزێ لە ئازاری بت پەرستان و باوەڕ ئەچەسپێنێ، لە دڵیاناو ناتوانن لایاندەن لە ئاینی خۆیان و بەرگری لە خراپەیان ئەکا.

پرسیار: مێژووی کۆن و تازە پڕن کە دەست درێژی کراوەتە سەر باوەڕداران، لەم ئایەتەدا خوای مەزن ئەفەرموێ: ئێمە یاریدەی باوەڕداران ئەدەین و ئەیانپارێزین، چۆن دژی یەکتر نین؟

وەڵام: ئەو ئایەتانە کە خوای مەزن لەوانەدا ئەفەرموێ: ئێمە یاریدەی باوەڕداران ئەدەین، بە گوێرەی دارِژاندنیان تایبەتن بۆ هەندێ لە پێغەمەران وەك نوح و هودو ساڵح و لوت و موحەمەد. نەك بۆ هەموو باوەڕداران.

ئەوەتە خوای مەزن ئەفەرموی: (وَاللهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَنْ يَشاءُ) وە خوای مەزن ئەپارێزێ کەسێ ئارەزوی هەبێ بەوەی یارمەتی ئەداو ئەیپارێزێ لە ئازار .

﴿ إنَ اللهَ لا يُحِبُ كُلَ خوانٍ كَفُور ﴾ بە ڕاستی خوای مەزن هەموو کەسێ ناڕاستی بکا لە پەیماناو ناسوپاسی بکا بەرانبەر چاکە خۆشی ناوێن. وێنە کەسانێ قوربانی بۆبتەکان سەرئەبڕن و کەعبە پیس ئەکەن بە خوێنەکانیان.

باوەڕداران بەر لـە کۆچ کردنیان بۆ مەدینە ئازاری زۆریان ئەدرا لـەلایەن بـت پەرستانەوە، زۆر جاران بەسەر شکاوی و لێدراوی ئەهاتنە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾، پێغەمـەر ئامۆژگـاری ئەکردن بە ئارام گرتن، ئەیفەرموو: فەرمانی جەنگم پێ نەدراوە، بگرە لـە حەفتا ئایـەتا جـەنگی قەدەغە کردووە لـە مەکەدا. بەلاّم پاش ئەوەی کۆچیان کرد بۆ مەدینە و هێزیان پەیدا کـرد بـۆ یەکەم جار دەستوریان پێدرا بۆ جەنگ کردن لـەگەڵ بت پەرستان و خوای مەزن فەرموی:

﴿ أذِنَ لِلذيْـنَ يُقـاتَلُونَ بِأنَـهُمْ ظُلِمُـوا وَإنَّ اللهَ عَلَـى نَصْرِهِـمْ لَقَديرٌ ﴾ دەسـتور دراوە بـە باوەڕدارانێکی ئەوتۆ جەنگیان لـەگەڵ ئەکرێ کە جەنگ بکەن لـەگەڵ بـت پەرسـتان، چونکـە ستەمیان لێ کراوەو ئازاریان دراوە بە نارەوایی بـە ڕاسـتی خـوای مـەزن توانـای زۆرە لـەسـەر یاریدانی ئەو باوەڕدارانەو سەریان ئەخا .

﴿ الذيْنَ أخْرِجُوا مِنْ دِيارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍ إلاّ أنْ يَقُولُوا رَبُنا اللهُ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن بەجۆرێکی نارەوا دەرکراون لـە نیشتمانی خۆیانا، هیچ خەراپەیەکیان نەبووە مەگەر ئەوەی کە ئەوان ئەڵێن: پەروەردگاری ئێمە هەر خوای مەزنە، بۆیە دەریان ئەکەن لـە نیشتمانی خۆیـان و جـەنگیان پـێ ئەفرۆشن و ئازاریان ئەدەن .

﴿ وَلَوْ لا رَفْعُ اللهِ الناسَ بَعْضَهُمْ بِبعْضٍ لَهُدِمَتْ صَوامِعُ وَبَيعٌ وَصَلَواتٌ وَمَسـاجِدُ يَذْكَـرُ فِيـها أسْمُ اللهِ كَثيراً ﴾ وەئەگەر خوای مەزن نەی کردبایە بـە دەسـتور بـۆ پێغەمـەران و بـاوەڕداران جەنگ کردن لـەگەڵ بێ باوەڕان هەندێ لـە ئادەمیزادی بێ باوەڕ بەهەندێ باوەڕداران لــە نـاو نەبردایە. بە ڕاستی ئەڕوخێنرا بە دەستی بێ باوەڕان کلیسای گاورەکان و کەنیسەی جوەکان و جێگەی نوێژی تاقمەکانی ترومزگەوتی موسڵمانان کـە ئـەو پەرسـتاگایانە باسـی نـاوی خـوای مەزنیان تێدا ئەکرێ زۆر جاران. بەکورتی ئەگەر هێزێکی بـە توانـا نـەبێ بـۆ لابردنـی خراپـە، کوشتن و دەست بڕین و دزی و تالاّن و خوێن ڕشتن و داگیرکردن پەرەئەسێنێ بـە تایبـەتی لـە نێوان هۆزو خاوەن ئایین و بیروباوەڕە جیاوازەکانەوە، ئیـتر ئـەو هـێزە خـوا پەرسـتبن یـا لـەبێ باوەڕانبن. بۆ نموونە ڕژێمی عێراق پێنج هەزار گوندی بە مزگەوتەوە ڕوخاند.

﴿ وَلَيَنْصُرَنَ اللهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إنَ اللهَ لَقَويٌ عَزيزٌ ﴾ وە بە ڕاستی خوای مەزن یـاریدەی کەسـێ ئەدا یاریدەی ئایین و پێغەمەری خوای مەزن بدەن. بە ڕاستی خوای مـەزن زۆر بـەهێزو زۆر بـە دەسەلاّتە و کەس ناتوانێ بەرەنگاری شتێ بکا خوای مەزن بیەوێ بیکا.

﴿ الذيْنَ إنْ مَكَناهُمْ فِي الأرْضِ أقامُوا الصّلاةَ وَأتُوا الزَكاةَ وَأمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَواْ عَنْ الْمُنْكَـرْ وَللهِ عاقِبَةُ الأمورُ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن ئەو دەرکراوانە لـە نیشتمانی خۆیان ئەگەر ئێمە یاریدەی ئـەوان بدەیـن و دەسـتەلاّتیان بدەینـێ لـە هـەموو ڕوی زەویـدا ئـەوان نوێژەکانیـان ئەکـەن و

زەکاتەکانیان ئەدەن بە هەژاران و فەرمان ئەدەن بە چاکەکردن و ڕێگە ئەگرن لە خراپەو قەدەغەی ئەکەن و دادپەروەری پەرە ئەسێنێ و هەر بۆ خوای مەزنە کۆتایی کاری بونەوەران بۆلای ئەو ئەگەڕێنەوە لە پاشە ڕۆژدا .

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَابُ مَدْيَنَ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَافِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَالَّذِينَ

ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْاْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾

﴿ وَإِنْ يَكْذِبُوكَ فَقَدْ كَذَبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نوحٍ وَعادٌ وَثَمودُ وَقَوْمُ إبْراهِيمَ وَقَوْمُ لُـوطٍ وَأَصْحـابُ مَدْيَنَ وَكُذِبَ مُوسى ﴾ وە ئەگەر بت پەرستان تۆ بە درۆزبخەنەوە، دوایی بە ڕاستی تاقمی نوح و تاقمی عادو سەمود تاقمی شیبراهیم و دانیشتوانی شاری مەدیـەن هـەمویان بەرلـەبت پەرستانی مەکە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ خستۆتەوەو موسایش بەدرۆخراوەتەوە لەلایەن فیرعـەون و فبتیەکانەوە. کەواتە تۆ خەفەت مەخۆ.

﴿ فَأَمْلَيتُ لِلْكافِرِيْنَ ثُمَ أَخَذْتُهمْ فَكَيْفَ كانَ نَكِيرِ ﴾ دوایـی مـن مۆڵـەتی بێبـاوەڕان ئـەدەم وسزایان دوا ئەخەم بۆ ماوەیە لەبەر ئەوەی هۆش بکەنەوەوە و پەشیمان بنەوە لەپاشا من سـزای ئەوان ئەدەم بە سەخترین سزا، دوایی ئەبێ بێزاری من لـەوان ئـەبێ چـەندە گرانبـێ کـە چاکـە خۆمان ئەگۆڕین بەناخۆشی و لـەناویان ببەین بەهۆی لافاو گەردە لولی باو مێشولـە بۆ سەریان و ڕۆچونی زەوی و بەرد باران کردنیان .

﴿ فَكأيْنَ مِنْ قَرْيَةٍ أهْلَكْناها وَهِيَّ ظالِمةُ فَهِيَ خاوِيَةٌ عَلى عرُوشِها ﴾ دوایی ئێمە زۆر گوندمان لەناو بردوون وە لـەکاتێکا دانیشتوانی ئەو گونـدە ستەمیان لـە خۆیـان کـردوە بـە هـۆی بـێ باوەڕیانەوە، دوایی ئەو گوندە دیوارەکانی کەوتوون بەسەربانەکانیان و کۆشکەکانیان روخاون.

﴿ وَبِئْرِ مُعَطِلَةَ وَقَصْرِ مَشِيدِ ﴾ وە زۆر بیر هەن بەجێ ماون و سـودیان لێ وەرناگـیرێ دوای مردنی خاوەنەکانیان و زۆر کۆشکی بەرزوێران کراون دوای مردنی خاوەنەکانیان.

﴿ أفَلَمْ يَسِيرُوا في الأرْضِ ﴾ ئایا دوای ئەو ڕوداوانە بت پەرستانی مەکە نەڕۆیشتوون بەسەر زەویی دا ونیشتمانی ئەوانا تەماشا بکەن چۆن دانیشتوانی ئەو جێگانە لەناو چوون وشوێنەکانیان بە چۆڵـی ماونەتەوە ئەبوایە بەوکارە ساتانە تەمێ خواربوونایە؟.

﴿ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلوبٌ يَعْقِلُـونَ بِـها أوْ أذانٌ يَسْـمَعُونَ بِـها ﴾ دوایـی بـۆ ئـەوان ببـێ دڵـێ و مێشکێکی وا بیری پێ ئەکەنەوە لـەخەوی بێ هۆشی بێداریان بکاتەوە یـا گوێچکەیـەکی وایـان هەبێ هەواڵی لەناوبوونی ئەو گەلانەی پێببیسن.

﴿ فَأنها لا تَعْمى الأبْصارُ وَلَكِن تَعْمى الْقُلوبُ التي في الصُدُور ﴾ دوایی بە ڕاستی کارو فرمان ئەوەیە چاوەکانیان گوێرنابێ بەجۆرێ پشتی پێ ببسترێ و بەلاّم ئەو دلّەی ئـەوتۆ لـە سنگدایە کوێر ئەبێ و بیر لەڕاستی ناکاتـەوە وپشـتی پـێ ئەبەسـترێ و ئامۆژگـاری وەرنـاگرێ و دوای ئارەزۆی خراپ ئەکەوێ.

﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذابِ وَلَنْ يُخْلِفُ اللهُ وَعْدَهُ ﴾ وە بـت پەرسـتانی قورەیـش داوا لـە تـۆ ئەکەن پەلە بکەی لەهاتنی ئەو سزایە ئەوانی بێئەترسێنێ و ئەلّێن: ئەگەر تـۆ ڕاست ئەکـەی بالە ئاسمانە و بەردەباران بکرێین و خوای مەزن بە پێچەوانەی بەلّێنی خۆی هەلّناسێ لـە ڕۆژی بەدردا سزای نارد بۆ سەریان هەندێکیان کوژران ودیل کران.

﴿ وَإنَ يَوْماً عِنْدَ رَبِكَ كَـألْفِ سَنَةٍ مِمـا تَعُـدُونَ ﴾ وە ئێـوە لەسـەر چ شـتێ پەلـەی هاتنـە خوارەوەی سزا ئەکەن بەڕاستی سزای تەنها ڕۆژی لە خزمـەت پـەروەردگاری تـۆ لـە ڕۆژی دواییدا سەختترە لە هەزار سالّ لەو سالّە ئێوە ئەیژمێرن لـە جیـهاندا، ئـەو ڕستانە هێمایـە بـۆ گرانی و سەختی ڕۆژی دوایی.

﴿ وَكَأيْنَ مِنْ قَرْيَةٍ أمْلَمَيْتُ لَها وَهِيَ ظالِمَةٌ ثُمَ أخَذْتُها وَإلى الْمَصِيرُ ﴾ وە زۆر لە دانیشـتوانی گوندێ بوون من بە میهرەبانی خۆم مۆلّەتم داون و سزادانیانم دواخستووە لە کاتێکا دانیشتوانی ئەو گوندە ستەمیان لە خۆیان کردوە باوەڕیان بە ڕاستی من ترسێنەری ئاشکرام بۆ ئێوە لەلایەن خوای مەزنەوە.

﴿ قُلْ يائُيها الناسُ إنَمـا أنـالَكُمْ نَـذيرٌ مُبينٌ ﴾ تـۆ بلّـێ: ئـەی ئادەمیزادانـەی داوای هاتنـە خوارەوەی سزا ئەکەن بە گورجی، بەڕاستی من ترسێنەری ئاشـکرام بـۆ ئێـوە لەلایـەن خـوای مەزنەوە.

﴿ فَالذيْنَ أمَنُوا وَعَمِلُوا الصالِحـاتِ لَـهُمْ مَغْفِـرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيـمٌ ﴾ دوایـی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە گەڕاونەتەوە لە بێ باوەڕی بۆ ئەوانە لێخۆشـبون لە گوناهەکانیان کردویانە بۆیان هەیە خواردەمەنی بەنرخ لەبەهەشتا.

﴿ وَالذيْنَ سَعَوا في أياتِنا مُعاجِزينَ أوُلئِكَ أصْحابُ الْجَحِيمِ ﴾ وە کەسانێکی ئـەوتۆ کۆششـی خۆیان ئەخەنە کار بۆ پوچ کردنەوەی ئایەتەکانی نامەی ئێمـە گومـان ئەبـەن ئێمـە دەسـەلاّتمان بەسەریانانیە زیندویان ناکەینەوە ئەو کەسانە دانیشتوی دۆزەخن و سزایان ئەدرێ بە ئاگر.

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ

أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ
ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ
مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ
قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ
ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ
فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ
تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾
ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾

**﴿ وَما أرْسَلْنا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلا نبيّ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان نەکردوە هیچ فروستادەیە بەدەستورو یاساکەوە بانگی ئادەمیزاد بکا بۆ لای ئەو دەستورە وفەرمانیشی پێ درابێ ڕابگەیەنێ و ڕەوانەیشمان نەکردوە هیچ پێغەمبەرێ بانگی ئادەمیزاد بکا بۆ دەستورێ ئیتر فەرمانی پێ درابێ بەوانی ڕابگەیەنێیانە؟ هەموو فروستادە پێغەمبەریشە . بەڵام هەموو پێغەمبەرێ فروستادەنیە.**

﴿ إلاّ إذا تَمَنى الْقى الشّيْطانُ في أمْنِيَةِ ﴾ مەگەر کاتێ ئەو پێغەمەرانە ئـەو ئایەتانـەی هاتبونـە خوارەوە ئەیان خوێندنەوە بەسەر دانیشتوانا لەوکاتەدا شەیتان دوو دڵی وگومانی ئەخسـتە نـاو دەرونیانەوە هەتا بەو بۆنەوە باوەڕداران توشی گومـان بـن کۆسـپ و تەگـەرە بێتـە ڕێگـەیان. دوژمنانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ گفتوگۆی نارەوا بدەنە پاڵ پێغەمبەری‌خوای مەزن.

﴿ فَيَنْسَخُ اللهُ ما يُلْقي الشّيْطانُ وَيُحْكِمُ اللهُ آياتِهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ دوایی خوای مەزن ئـەو شتەی شەیتان فڕەی ئەدایە ناو دەرونی یاریدەرانی ئایینی خوای مەزن پوچـی ئەکاتـەوە، لەپاشـا خوای مەزن ماناو مەبەستی ئایەتەکانی نامەکەی ڕون ئەکاتەوە بە جۆرێ مەبەستەکەی گۆڕانـی بەسەردانەیە، بەڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ بەسروش ئەی نێرێ بۆلای پێغەمبەرو مەبەستی شەیتانیش ئەزانێ، هەموشتێ لـە جێگەی شـیاوی خۆیـادا ئـەنێ و چـاك ونیـازی پیسـی شـەیتان دەرئەخا.

﴿ لِيَجْعَلَ ما يُلْقي الشّيْطانُ فِتْنَةً لِلذيْنَ في قُلُوبِهِمْ مَـرَضٌ وَالْقاسِيَةِ قُلُوبُـهم ﴾ لەبـەر ئـەوەی خوای مەزن شتێ شەیتان ئەیخاتە دڵی ئادەمیزاد وە لـەو گومانە ئەی گێرێ بـە تـاقی کردنـەوەو نەگبەتی‌بۆ کەسانێکی ئەوتۆ نەخۆشی بێ باوەڕی لە دڵیانایەو بۆکەسانێ دڵیـان ڕەقـەو واز لـە ڕاستی ئەهێنن و ڕوی لێ وەرئەگێڕن.

﴿ وَإنَ الظّالِمِينَ لَفِي شِـقاقٍ بَعِيـدٍ ﴾ وە بەڕاسـتی ستەمکارانی دوو ڕوو بـت پەرسـت لـە دوژمنایـەتی و دووڕووی درێـژان لـەگـەڵ پێغەمبـەرو بـاوەڕداران، یـاخین لـەبۆ وەرگرتنـی فەرموودەکانی خوای مەزن، ئەو پڕوپاکندانە ئەدرێنە پـاڵ قورئـان وپێغەمبـەر هەرچـەندە زیـان بەخشن بەلاّم باوەڕدارو دوو ڕووانی پێ جوێ ئەکرێتەوە.

﴿ وَلِيَعْلَمَ الذيْـنَ أوُتُـوا الْعِلْـمَ أنَـهُ الْحَقُ مِـنْ رَبّـكَ فَيُؤْمِنُـوا بِـهِ فَتُخْبِـتْ لَـهُ قُلُوبُـهُمْ ﴾ وە لـەبەرئەوەیشە کەسانێکی ئەوتۆ زانین بە باوەڕ بەخواو بە ئایینی خوای مەزن بزانن ئـەو قورئانـە هاتوەتە خوارەوە لەلایەن پەروەردگاری تۆو ڕاستەو گومانی تێدا نیە، دوایی ئەو کەسـانە بـاوەڕ بە قورئان و بە پێغەمبەر ئەهێنن، دوایی دڵیان لەبۆ ئەو قورئانـە ئـارام ئـەگری و گومـانی تێـدا نامێنێ.

﴿ وَإنَ اللهَ لَهاد وَالذيْنَ آمَنُوا إلى صِـراطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ وە بەڕاسـتی خـوای مـەزن شـارەزایی کەسانێکی ئەوتۆ ئەکا باوەڕیان هێنا بۆ لای ڕێگەی ڕاسـت، گـیروگرفت لەبـەردەمیانا نایـەڵێ وگومانی شەیتان پوچ ئەکاتەوە.

﴿ وَلا يَزالُ الذيْنَ كَفَرُوا في سِرْيَةٍ حَتى تَأتِيَهُمْ السّاعَةُ بغتة أو بأياتِهِمْ عَذابُ يَـوْمَ عَقِيـمٍ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لاناچن لە بێ باوەڕی گوماندان لە قورئـانـدا هـەتا کوتوپـڕ دێت بۆلایان ڕۆژی دوایی یادێت بۆلایان سزای ڕۆژی جیاوازە لەگەل تەواوی ڕۆژانی جیـهاندا سەختیەکەی وێنەی نی‌یە، ئەوە بوو لە ڕۆژی بەدردا گەورەکانی قورەیش کـوژران، ئـەو ڕۆژە وەك بایە وایە چاکەی تێدا نەبی، ئەو ئایەتە هەوڵدانەکە خراپـەی بـێ بـاوەڕان وگومـان پـەیدا کردن لە قورئان و لەئاینی ئیسلاما بەردەوامـە بـۆ نموونـە نامـەی ئایەتـە شـەیتانیەکانی سـەلمان روشدی و بلاوکراوەی گۆڤاری (نقار) لەم سەردەمەی ئێمەدا لە دژی قورئاندان.

﴿ الْمُلْكُ يَوْمَئِـذٍ اللهِ يَحْكُـمَ بَيْنَـهُمْ فـالذيْنَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الْصالِحـاتِ في جَنّـاتِ الْنَعِيـمِ ﴾ خاوەنیەتی هەمو بونەوەران لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە ئەو کاتەی ڕۆژی دوایی دێت فەرمان ئەدا لە نێوان ئادەمیزاد بە گشتی، دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیـان هێنـاوەو کـردەوە چاکـەکانیان کردوە لە نێو بەهەشتەکاندا ڕابواردنو چاکەی هەمە جۆری تێدایە.

﴿ وَالذيْنَ كَفَرُوا وَكَذبُوا بِأياتِنا فَأوُلئِكَ لَهُمْ عَذابٌ مَـهينٌ ﴾ وە کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێناوە ئایەتەکانی نامەی ئێمە بەدرۆ ئەخەنەوە، دوایی بۆ ئەو کەسانە هەیـە سـزایە ڕسـواکەو ئابڕوبەریان.

بۆزانین: ئەگێرنەوە هۆی هاتنە خوارەوە ئەو ئایەتانەی پێشو ئەوە بوەکە ئەو کەسانەی ئاواتە خوازی هەمو شتێکی دەرەکی و ئاوارە و گومان پەیدا کەربوون کە بیخەنـە نـاو قورئانـەوە بـۆ ئەوەی گومان پەیدا بکەن لە دڵی موسڵماناندا.هەر لە کۆنەوە جولکەکان و خـاچ پەرسـتان و ڕۆژهەلات ناسەکان لەمەوبەرو ئێستاش وێنەیسـەلمان روشـدی زۆر شـتی خـراپ و ناڕەوایـان ئاراستەی پێغەمبەر کردوە خستویانەتە ناو قورئـان و ووتویانـە: کاتـێ پێغەمبـەر ﴿ ﷺ﴾ بـۆی دەرکەوت بت پەرستان ڕوی لێی وەرئەگێرن و ئازاری هاوڕێکانی ئەدەن ئاواتی خواسـت کـە خوای مەزن شتێ بنێرێتە خوارەوە ئەوانی پی دڵخۆش بکا، دوای ڕۆژێ لە جێگەی کۆبونەوەی قورەیشیەکان دانیشتبون لەگەڵ هەندێ پیاوە گەورەکانیان، پێغەمبەریش لەوێ دانیشتبو، دوایی سورەتی نەجمی بەسەردا خوێندەوە هەتا گەیشتە (أفرأيتم اللات والعزى ومنـاة الثالثـة الاخـرى) لەوکاتەدا شەیتان بەسەزمانی پێغەمبەریدا هێنا (تلك الفرانيق العلى وإن شفاعهن لترتجى) .

بەبێ ئەوەی پێغەمبەر ئاگای لـەو کـارەی شـەیتان بـێ.یـانی ئـەو پتـە جـوان و شـیرینانەی پارانەوەیان لای خوای مەزن هیوای لێ ئـەکرێ، هـەروەها پێغەمبـەری خـوای مـەزن سـورەتی

(نەجمی) خوێندنەوە هەتا گەیشتە (فاسجدوا لله واعبدوا) دانیشتوانی ئامادە بوان هەمویان بە باوەڕدارو بێ باوەڕەوە سوژدەیان برد، بت پەرستان ڕەزامەندی خۆیان لەو خوێنراوەی پێغەمبەر دەربڕی و ووتیان: ئێمەلەگەڵ تۆین، کاتێ تۆ گێڕاوتە بۆ خواکانی ئێمە بەشێ لەپاڕانەوە.بەڕاستی کاتێ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەو ڕوداوەی غرانیقی بیست زۆر لای گرانبو زۆر خەفەتی خواردو گەڕایەوە بۆلای خوای مەزن پەشیمان بویەوە لەو کارەی خۆی، دوایی خوا (ومالرسلنا من قبلك من رسول ولانبي إلا إذا تمنى ألقى الشيطان في امنيته) هەتا دوایی ناردە خوارەوە. ئەو چیرۆکە بەو جۆرە باسکرا لەبارەی غەرانیقەوە هەندێ لەماناکەرانی قورئان ومێژونوسان و ڕۆژهەڵات ناسەکان لە ڕۆژئاوا و لەڕۆژهەڵاتەوە بەو جۆرە بلاویان کردوەتەوە.

بەلام زانا ڕاست زانەکانی لە بنچینەدا ئەو ڕوداوەیان بەدرۆ خستۆتەوە فەرمویانە:بێ ئایینە تانە دەرەکان لە نامەی خواو لە پێغەمبەرا بەردۆ دایان ناوە، فەرمویان بەڵگەی ئەقڵی ونەقڵی ئەو ڕوداوە بەڕاست نازانن، چونکە پێغەمبەرێ بۆ ئەوە نێرابێ دژی بتپەرستی بێ چۆن ئەو شتە بە زمانی ئەودا دێت کەڕون کەرەوەی فەرموودەکانی خواو زمان بێژی خوای مەزنە شەیتان چۆن ڕێگەی پێ ئەدرێ ئەو جۆرە کارە نارەوایانە بکا؟ ڕاستی مانای ئەو ئایەتە ئەوەیە: بەنرخترینی ئاواتی پێغەمەرو هەموو پێغەمبەرێ ئەوە بوە کە ئادەمیزاد ڕاستی پەیامەکەی ونیشانەکانی و رانموییی پێ وەرگرن وبیانزانن بەلام ئەوانەی خاوەنی نیشانەی خراپو تانە بازن ئەیانەوێ ببن بەکۆسپ لە نێوان پێغەمبەرو ئاواتەکەیا بەبلاوکردنەوەی پروپاکندەی خراپ بەهەر جۆرێ بۆیان بلوێ، لەو بارەوە ئازاری زۆریان چێشتووە پێغەمبەر چاکە خوازە و شەیتان کاول کەرە بۆیە خوای مەزن فەرمووی: (ینسخ الله مایلقي الشیطان ثم یحکم الله آیاتە) ڕوداوی چیرۆکی غەرانیق باشتر پوچ ئەبێتەوە دەرئەکەوێ دەست هەلبەستی بێ باوەڕان و دوژمنانی پێغەمبەرن لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

١-رستەی غەرانیق بە چەند جۆری جیاواز گێڕراوەتەوە: جارێ بە (الغرانیق العلاء وإن شفاعتهن ترتجی) جارێ تر بە (إن شفاعتهن ترتجی) بەبێ ئەوە باسی (الغرانیق) بکرێ. جارێ تر بە (وإنها لهی الغرانیق العلا) یابە (إنهن لهن لفرانیق العلا) یابە (وإن شفاعتهن لهی التي ترتجی) ئەو گۆڕان کاریانە بەڵگەن لەسەر لاوازی و نا ڕاستی ئەو گەڕانەووە و دانراوی بێ ئایینەکان وبێ باوەڕانن و ووشەیەکی تەنهایان دەست نەکەوتووە بێڵێن.

٢-دارِژاندنی سورەتی (نەجم) و هەمو ئایەتەکانی ئەو چیرۆکـە بـەدرۆ ئەخەنـەوە، چونکـە هەموویان دژی بتەکان ئەلێن، ناچێتە ئەقڵەوە خوای مەزن بارِانەوەی رِۆژی دوایی بداتە پاڵ ئەو بتانە.

٣- ناوبردنی بتەکان بەغەرانیق لە هۆنراوە و پەخشانی عەرەبدا دەسـت ناکـەویێ بەسـەر زمانیشیانا نەهاتووە.

ئەوەی لە زمانی عەرەبدا هاتوە: (الغرانیق والغرانیق) بـە باڵندەیـەکی قـاچ درێـژی سـپی پارِەش، یا بە باڵندەیە ئەلێن: پێی ئەلێن: کورکی، یا بە کورێکی جوانی لەش سپی و نەرم ونۆڵ ئەلێن، وەك لە نامەی (لسان العرب) باسکراوە.

٤-پێغەمبەری‌خوای مەزن وەك تاقی‌کراوەتەوە هەرگیز درۆی نەکردوە و بەزمانیا نـەهاتووە بەتایبەتی لە قورئانی پیرۆزدا، مێژوی رِابوردوی پێغەمبەر لای دۆست و دوژمن رِون وئاشکرایە، ئیتر چۆن شتی خراپ بە زمانیدا دێت؟

٥-ئەو چیرۆکە دەست هەڵبەستە لەگەڵ رِاستی پێغەمبەردا ناگونجێ بۆ رِاگەیاندنی پـەیامی پەروەردگاری خۆی، بە پێچەوانەوەسەر ئەکێشێ بۆ لای ئەوەی پێغەمبەر ئاگـای لـەو شـتەنەبێ سروش هاتبێ بۆ لای و سەریش ئەکێشێ بـۆ لای ئـەوەی متمانـە و باوەرِبـە قورئـان نـەمێنێ، گۆرِان کاری و کەم کردنەوەو زۆرکردنی قورئان دروستبێ، ئەوانیش نەبوون و نایشبن، قورئان خوای مەزن ئەی پارێزێ لەدەست کاری کردن.

٦-ئەوباس و هەواڵانەی لەبارەی رِوداوی غەرانیقەوە لەو کەسانە و گێرِاونەتە وە جێگـەی بروانین نەخۆیان ونە خاوەنەکانیان چونکە هیچ بەڵگەیەکی رِاستیان نیـە جگـە لـە دوژمنایـەتی کردنی ئایینی خوای مەزن.

هەندێ لە هاورِکانی پێغەمبـەر ووتیـان:ئـەی پێغەمبـەری خـوای مـەزن:ئێمـە ئـەزانین ئـەو کەسانەی ئەکوژرێن خوای مەزن چاکەی زۆریان پێ ئەبەخشێ، ئێمە لە خزمەت تۆدا جـەنگ ئەکەین و ناکوژرێین ئەمرین خوا چ شتێ لەگەڵ ئێمەدا ئەکا.خوای مەزن فەرمووی:

وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ

ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾

﴿ والذيْنَ هاجَرُوا في سَبيْلِ اللهِ ثُمَ قُتِلُوا أوْماتُوا ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ کۆچیان کردووە لە مەکەوە هاتوون بۆ مەدینە نیشتمان و سامانی خۆیانیان بەجێ هێشتوە لە ڕێگەی ئایینی خوای مەزندا لە پاشا کوژراون لە جەنگدا یا مردوون لە خانەی خۆیانداو لە ناو خێزانی خۆیانا .

﴿ لَيَرْزُقَنَهمُ اللهُ رِزْقاً حَسَناً وَإنَ اللهَ لَهُوَ خَيْرُ الرازِقِينَ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن پاداشتی هەردوولایان ئەداتەوە بە پاداشتێکی زۆر شیرین و هەرگیز کۆتایی پێ نایە کە چونیانە بۆ بەهەشت و بە ڕاستی خوای مەزن چاکترین کەسێکە پاداشت بداتەوە بەبێ ژمارەو بەبێ ماندوبوون، بەجۆرێ هیچ کەسێ توانای بەخشینی پاداشتی وای نیە جگەی خوا.

﴿ لَيُدْخِلَنَهُمْ مَدْخَلاً يَرْضَوْنَهُ وَإنَ اللهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾ بە ڕاستی خوای مەزن هەردولایان ئەخاتە جێگەیە لە بەهەشتا خۆشحاڵن بەو جێگەو لێ ڕازین، جێگەیەکە نە چاو بینویەتی و نە بە

گوێچکە بیسراوەو خوای مەزن بە ڕاستی ئەزانێ بەشتێ ئەوان ڕازی بکا، خاوەن ئارامەو پەلە لە سزادانی دوژمنانێ باوەڕداران ناکا .

﴿ ذلِكَ وَمَنْ عاقَبَ بِمِثْلِ ما عُوقِبَ بِهِ ثُمَ بُغِيّ عَلَيْهِ لِيَنصَرُنَهُ اللهُ إنَ اللهَ لَعَفُوٌ غَفُورٌ ﴾ ئەو شتەی خوای باسی فەرمو کەکەسێ کۆچ بکا لە ڕێگەی ئایینی خواداو بکوژرێ یا بمرێ، دوای خوا ڕازیان ئەکا بەشتێ پێیان خۆشبێ خوای مەزن ئەو بەڵێنەی خۆی بۆ ئەوان جێبەجێ ئەکاو هەرکەسێ جەنگ بکا بۆ بەرگری کردن لە خۆی بە وێنەی شتێ دەست درێژی پێ کرا ببێتە سەری و دەقاو دەقی یەکێن زۆرتر نەبێ، لە پاشا دەست درێژی تری کرایە سەری و دەریان کرد لە نیشتمانی خۆی بەڕاستی خوای مەزن یارمەتی ئەو کەسە ئەدا دەست درێژی تری ئەکرێتە سەرو تۆڵە لە دەست درێژکەر ئەسێنێ و بەڕاستی خوای مەزن لە خراپەی باوەڕداران ئەبورێ و لە گوناهیان خۆش ئەبێ .

﴿ ذِلِكَ بِأنَ اللهَ يُولُح الَيْلَ فِي الْنَهار وَيُولِجُ النهارَ فِي الَيْلِ وَأنَ اللهَ سَميعٌ بَصيرٌ ﴾ یاری دانی ئەو کۆچ کەرانە هەندێکە لە نیشانەکانی توانای خوای مەزن لەبەرئەوەی خوای مەزن توانای بەسەر شتێکا هەیە کەسی تر توانای بەسەر ئەو شتەدا نیە، لە نیشانەکانی تری خوای مەزنە:

تواناکەی بەو بونەوەیە تاریکی شەو لە جێگەی ڕوناکی ڕۆژ دائەنێ وماوەی ڕۆژی پێ زۆر ئەبێ و ڕوناکی ڕۆژیش لە جێگەی شەوا دائەنێ و ماوەی شەو درێژ ئەبێ، هەروەها شەو ئەڕواو ڕۆژ دێتە جێگەی و ڕۆژ ئەڕواو شەو دێتە جێگەی، دوایی هەندێ لای زەوی ئەوپەڕی تاریکەو ئەولاکەی ڕوناکی تەواوە، بۆ نمونە: ئەو کاتەی لە عێراقدا شەوبێ لە ئەمەریکادا ڕۆژە. بە پێچەوانەیشەوە، ئەوەیش لەبەر ئەوەیە زەوی خڕە لەبەردەم خۆرا ئەسوڕێتەوە. ئەو کارەی خوای مەزن لە بارەی شەوو ڕۆژەوە خوای مەزن باسی کردووە زانیاری تازە لە دواییدا ڕێگەی پێ بردووە. وە بەو بۆنەیشەوەیە خوای مەزن گفتوگۆی ئادەمیزاد ئەبیسێ و ئاگای لە خشتەی مێرولە هەیە لەشەوی تاریکاو کردەوەیان ئەبینێ .

﴿ ذلِكَ بِأنَ اللهَ هُوَ الْحَق وَأنَ ما يَدْعُونَه مِنْ دُونِهِ هُوَ الْباطِلُ وَأنَ اللهَ هُوَ الْعَليُ الْكَبيرُ ﴾ ئەو یاریدان و توانایەی خوای مەزن بەو بونەیە بو کە بە ڕاستی هەر خوای مەزن ئاین و پەرستنی ئەو ڕاستەو بەڕاستی ئەو شتەی بت پەرستان ئەیپەرستن لە جگەی خوای مەزن پوچەو توانای ئەوەیان نیە لەبەردەم خوای مەزندا پایەداربن و بەڕاستی هەر خوای مەزن لە تواناندا بالاّ دەستەو هەر ئەو گەورەیەو هەموو شتێ لەبەردەم ئەودا بچوك و بێ نرخە و هەر خوا ئەبێ باسی بە گەورەیی بکرێ .

﴿ أَلَمْ تَرى أنَّ اللهَ أَنْزَلَ مِنَ السَماءِ ماءً فَتُصْبِحُ الأَرْضُ مَخْضَرَةً ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە بە ڕاستی خوای مەزن لە ئاسمانەوەو لە هەورەوە ئاوێکی زۆر ئەنێرێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، دوایی زەوی بە گیاوگوڵ و درەخت سەوز هەڵئەگەڕێ دوایی ئادەمیزاد خۆیان و ئاژەڵەکانیان لەبەروبومی زەوی ئەخۆن و بە جێگە خۆشەکانی ڕائەبوێرن.

﴿ إنَّ اللهَ لَطيفٌ خَبيرٌ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆی و هەرشتێ سودی بۆ ئەوانبێ ئەیکا، ئەزانێ بە ئەندازەی کاروباریان ئەزانێ و ئاگای لە بارینی باران هەیە.

﴿ لَهُ مافي السماواتِ وما في الأرضِ وَأنَّ اللهَ لَهُوَ الغنيّ الْحَميد ﴾ بۆخوا بەشتی لە ئاسمانەکاندایە لە فریشتەکان و شتی سروشتی لەنێو زەویدایە لە ئاو ئاگرو زێڕو بەڕاستی خوا پێویستی بە هیچ نیەو هەر ئەو سوپاسی ئەکرێ .

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ ۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾

﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ إنّ اللهِ سَخّرَ لَكُمْ ما في الأَرْضِ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کە بەڕاستی خوای مەزن ڕامی کردوە بۆ سودی ئێوە شتێ لەزەویدایە لە دەریاو ئاوو درەخت و ڕوەك و ئاگرو نەوت و زێڕو زیوو ئەڵماس و بەردی کانەکان. خواردەمەنی و بەرگ و جێگەی حەسانەوەی خۆتانی لێ فەراهەم دێنن .

﴿ وَالْفُلكَ تَجْرى في الْبَحْرِ بِأمْرِهِ ﴾ وەڕامیشی کردوە بۆ سوودی ئێوە کەشتی ئەڕوا بەناو دەریادا، خۆتان سواری ئەبن و کەل و پەلی خۆتانی تێ ئەخەن و لە شارێکەوە بۆ شارێ تر بە خێرایی ئەڕوا، بازرگانی و هۆی ژیانی خۆتانی پێ ئەسازێنن، بەهۆی کەشتیەوە ماسی تەڕو تازەی لێ دەرئەهێنن و هەندێ خشڵی جۆراوجۆری وەك لۆلۆو مەرجانی لێ دەرئەهێنن. ئەوانە هەموویان خاوەنەکانیا خوای مەزنەو ئەو ساختەی هێناوە بۆتان .

﴿ وَيُمْسِكُ السَماءُ أنْ تقعَ عَلَى الأَرْضِ إلاّ بِأذْنِهِ إنّ اللهَ بالناسِ لَرَؤُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ وە خوای مەزن ئەستێرەکانی ئاسمانی ڕاگرتوون و ئەیانپارێزێ کە بکەونەوە خوارەوە بەسەر زەویدا چونکە خوای مەزن بۆ هەریەکەیان هێزێکی وەستانی پێ بەخشیون بەو بۆنە ناکەونە خوار مەگەر بە دەستوری خوای مەز لەکاتی کۆتایی پێ هاتنی ژیانی بونەوەرا لە ڕۆژی دوایداو پەیڕەوی بونەوەران تێك ئەچێ. بەڕاستی خوای مەزن میهرەبانە دەرگای سودی کردوەتەوە بۆ بونەوەران بە ڕام کردنی زەوی و خاوەنی بەزەیە بۆیان بەڕاگرتنی ئاسمانەکان .

﴿ هُوَ الذي أحْياكُمْ ثُمَ يُمِيتِكُمْ ثُمَ يَحيكُمْ ﴾ خوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی پەیدا کردووە لە نەبونەوە گیانی کردووە بە بەرتا لە جیهاندا لە پاشان ئەتان مرێنێ کاتی تەواوبوونی تەمەنتان لە پاشا جارێ تر ئێوە زیندو ئەکاتەوە لە ڕۆژی دوایدا لەبەر ئەوە پرسیار لە ئێوە بکا لەسەر ئەو کارانەی کردوتانە لە جیهاندا لە چاك و خراپ .

﴿ إنَ الأنْسانَ لَكَفُورٌ ﴾ بەڕاستی ئادەمیزاد سوپاسی چاکە زۆرەکانی خوای مەزن ناکا لەسەر ئەو هەموە چاکانە خوای مەزن بەوانی بەخشیوە.

﴿ لِكُلِ أمَةٍ جَعَلْنا مَنْسَكاً هُمْ ناسِكُوهُ فَلا يُنازِعُنَكَ في الأمْرِ ﴾ ئێمە بۆهەموو خاوەن ئاینێ یاسا و پرۆگرامێکمان بۆدیاری کردوون ئەوان کار بەو یاساو پرۆگرامە بکەن دوایی ئەو خاوەن ئایینانە کە هەموویان دەستوروپرۆگرامی تایبەتی خۆیانیان هەیە پێویستە دژایەتی تۆ نەکەن لە کاروباری ئیسلام و دەستوری تۆدا، ئەو کەسانەی ئەوتۆ لە کاتی موسادابوون دەستورەکانیان شتێ بووە لەتەوراتا بووە، ئەوانی کاتی عیسا دەستوریان شتێ بووە لە ئینجیلدا بووە، ئەوانەی کاتی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ شتێکە لە قورئاندایە بۆ هەموئادامیزاد لە هەموو ڕوی زەوی‌دا هەتا

ڕۆژی دوایی، ئیتر ئەو خاوەن دەستورانە گومان نەبەن دەستورو یاسایان بەشتێکە لە تەوارات و ئینجیلدان، چونکە یاسای قورئان دەستوری ئەوانی پوچ کردوەتەوە، دوایی ئاوڕێ بۆلای گفتوگۆی ئەوان مەدەرەوە .

﴿ وَأدْعُ إلى رَبكَ إنَكَ لَعَلَى هُدىً مُسْتَقيمٍ ﴾ وەتۆ بانگی ئادەمیزاد بکە بۆلای خوای مەزن و باوەڕهێنان بەو گرنگی مەدە بەو کەسانە واز لە باوەڕ بە خوای مەزن ئەهێنن و کار بە دەستوری یاسای خۆت بکە. بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاست و ئایینی بێ خواروخێچی، هەرکەسێ دوای ئایینی تۆ بکەوێ توشی سزا نابێ .

﴿ وَإنْ جادَلُوكَ فَقُلِ اللهُ أعْلَمُ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ وەئەگەر ئەوان دوژمنایەتی تۆیان کردووە لە بارەی یاسای تۆو لە بارەی جێگەی سەربڕینی قوربانیەکان و وازیان هێناوە لەو بەڵگە ڕونانەی قورئان، دوای ئەوەی ڕاستیان بۆ دەرکەوتووە. دوایی تۆ بڵێ بەوان: خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ ئێوە ئەیکەن لە گۆڕینی نامەکانی خوای مەزن، دوایی خوای مەزن تۆڵەتان لێ ئەسێنێ.

﴿ اللهُ يَحْكُمُ بَيْنِكُمْ يَوْمَ الْقيامَةِ فِيما كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ خوای مەزنی جیاوازی نێوانی ئێوەو موسڵمانان ڕون ئەکاتەوە لە ڕۆژی دوایدا، دوایی پیاو چاك و پیاو خراپ دەرئەکوێ لە شتێکا ئێوە دژایەتی پێ ئەکەن و لەمن جیاوازن لە بارەی کاری ئاینەوە.

﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أنَ اللهَ يَعْلَمُ ما في السَماءِ وَالأرْضِ إنّ ذلِكَ في كِتابٍ إنَ ذلِكَ عَلَى اللهِ يَسيرٌ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ لە ئاسمان و لە زەویدان و بەشتێ لە دڵی بێ باوەڕاندا پەنهان دراوەو ئەیکەن و ئەیڵێن لە بێ باوەڕی پیلان کردن لەتۆ. بەڕاستی ئەو شتانە هەموویان لە نامەی کرداری ئێوەدا تۆمارکراوە لە چاك و لە خراپ هەریەکەیان بە گوێرەی شایەنی خۆیان پاداشتیان ئەدرێتەوە. بەڕاستی زانینی ئەوشتانە هەموویان لەسەر خوای مەزن ئاسانن بە یەکسانی. بە تایبەتی ئەزانێ بە گفتوگۆو بە دژایەتی بێ باوەڕان لە بارەی ئایینی تۆو هیچ شتێ لەخوای مەزن ون نابێ لە کەم و لە زۆر لەگەورەو لە بچوك .

وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَمَا لَيۡسَ لَهُم بِهِۦ عِلۡمٞۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٖ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ تَعۡرِفُ فِي

وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ
بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن
ذَٰلِكُمُ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ إِنَّ ٱلَّذِينَ
تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ
وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ
ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِنَّ
ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دونِ اللهِ مالَمْ يُنَزِلُ بِهِ سُلْطاناً وَما لَيْسَ لَهُمْ بِهِ عِلْمٌ وَما لِلْظالِمينَ مِنْ أنْصارٍ ﴾
وەبێ باوەڕا لەجێگەی خوای مەزن شتێ ئەپەرستن خوای مەزن نەیناردووەتە خوارەوە هیچ بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پەرستنی ئەو شتەکە بیسترابێ یا وەرگیرابێ لەلایەن ئەقڵەوەو نیە بۆ ئەوان هیچ جۆرە زانیاریە بە پەرستنی ئەو شتە. کەواتە ئەو پەرستنە لە لاسایی کردن و نەزانینەوەیەو هەرشتێ وابێ ئەبێ پوچ و ناڕەوا بێ و، ستەمکاران لە خۆیان بەو پەرستنە هیچ یاریدەرێ سزای ڕۆژی. دووایان لێ بگێڕێتەوە .

﴿ وَإِذا تُتلى عَلَيهِمْ آياتُنا بَيِّناتٍ تَعْرِفُ في وَجُوهِ الذينَ كَفَرُوا الْمُنْكَرَ ﴾ وەهەر كاتێ بخوێنرێتە بەسەر ئەو بێ باوەڕانەدا ئایەتەكانی قورئانی ئێمە بە ڕونی بەڵگەن لەسەر ڕاستی ئایینی ئیسلام و پوچی بیروباوەڕی ئەوان تۆ نیشانەی بێ باوەڕی بەڕومەتی كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ئەزانی و بۆت دەرئەكەوێ ڕق و تینی ئەوان بۆتۆ.

﴿ يُكادُونَ يَسْطُونَ بِالذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آياتِنا ﴾ ئەوبێ باوەڕانە نزیكە پەلاماری ئەو كەسانە بدەن ئایەتەكانی قورئانی ئێمە ئەخوێنێتەوە بەسەریاناو خراپەیان لەگەڵ بكەن .

﴿ قَلْ أفأنَبِئكُمْ بِشَرٍ مِنَ ذلِكُمْ النارُ وَعَدَها اللهُ الذينَ كَفَرُوا وَبِئْسَ الْمَصيرُ ﴾ تۆ بڵێ بەو بێ باوەڕانە: ئایا من هەواڵ بدەم بە ئێوە بەشتێ خراپتر بێ لەو ڕق و كینەی ئێوە بۆ كەسانێ ئایەتی قورئانی ئێمە ئەخوێننەوە بەسەرتانا ئەو شتە خراپەیش ئاگری دۆزەخە خوای مەزن بەڵێنی داوە ئەو ئاگرە تووشی كەسانێكی ئەوتۆ ئەبێ باوەڕیان نەهێناوەو ئەبێتە جێگەی ئەوان و خراپ جێگەیەكە ئەوان ئەگەڕێنەوە بۆلای. دوای ئەوەی خوای مەزن باسی بت پەرستانی كرد كە بە بێ بەڵگە ئەیان پەرستن، دوایی خوای مەزن باسی بەڵگەیەكمان بۆ ئەكا لەسەر بێ توانایی بێ باوەڕان كە گەورەو منداڵ و زانا و نەزان ڕێگەی پێ ئەبەن و ئەیزانن و ئەفەرموێ:

﴿ يا أيُها النّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَأستَمِعُوا لَهُ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ڕون كراوەتە بۆئێوە وێنەیە هەتا ئێوە بزانن چ شتێ شایستەی پەرستنە، دوایی ئێوە باش گوێ بگرن بۆ ڕونكردنەوەی ئەو وێنەیەو بیری لێ بكەنەوە، چونكە بیستن بەبێ بیركردنەوە سود نابەخشێ، وێنەكەیش ئەمەیە:

﴿ إنَ الذينَ تَدْعُونَ مِنَ دونِ اللهِ لَنْ يَخْلَقُوا ذباباً وَلَوا أجْتَمَعُوا لَهُ ﴾ بەڕاستی ئەو بتانەی ئەوتۆ ئێوە ئەیان پەرستن و هاواریان لێ ئەكەن و بریتین لە زۆرتر لە سێسەدو شەست بت بە دەوری كەعبەدا ناتوانن بێ نرخترین بونەوەرێ كەمێشە دروستی بكەن با وەكوهەموویان كۆببنەوە بۆ دروست كردنی، دوایی چۆن شایستەیە ئەو بتە لاوازانە ئێوە بیان پەرستن؟.

﴿ وَإنْ يَنسلُبْهُمْ الذُبابُ شَيْئاً لاّ يَسْتَنْقِذَهُ ضَعُفَ الطّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ ﴾ وەئەگەر ئەومێشە شتێ لەو بتانە بسێنێ ئەو بتانە ناتوانن ئەوشتە ڕزگار بكەن ئەو مێشە لێی سەندوون، ئیتر كە توانای ئەو شتەیان نەبێ چاكتر ناتوانن مێشێ دروست بكەن، ئەو بتانە زۆر لاووازن و ئەو مێشەیش زۆر لاوازە .

بۆ زانین: ئەگەر پرسیار بكرێ ببێژێ زۆر ڕاستە ئەو بتانە ناتوانن ئەو شتە لەو مێشە وەرگرتەوە، چونكە بێ گیانن، بەڵام لەوانەیە ئادەمیزادێ بپەرستن گیانی تێدابێ وەك فیرعەون و بتوانێ ئەو شتە لەو مێشە وەرگرێتەوە، لە وولامدا ئەبێژرێ ئەویش هەرناتوانێ، چونكە سروشتی مێش بەجۆرێ دروست كراوە هەر شتێكی هەڵگرت بیخوا كوتوپڕ ئەتوێتەوەو نامێنێ .

پرسیار: بەڕاستی ئەو بتانە بەڵگەیەکی وایان لەگەڵە کە بە ڕاستی خوانین، لەبەر چ شتێ خوای مەزن گرنگی داوە بە هێنانی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو بتانە خوانین؟.

وەڵام: شۆڕینەوەی خوایەتی لە وبتانە زۆر ڕونە بە گوێرەی ئەقڵ، پەرستنیان هەر لەبەر سودی تایبەتی و لاسایی کردنەوەی پێشوانە بەبێ ئەوەی ئەقڵ بخەنەکار .

﴿ ما قَدَرُوا وَاللهَ حَقَ قَدْرِهِ إنَ اللهَ لَقَويٌ عَزِيزٌ ﴾ ئەو بت پەرستانە ڕێزی خوای مەزنیان نەگرتوە بەجۆرێ شایستەی ڕێزی ئەوبێ، چونکە بەردی دروست کراوی خۆیان کردووە بە هاوبەشی خوای مەزن بەڕاستی خوای مەزن دەستەڵاتی بەسەر هەموو بونەوەراندا هەیە، زۆر گەورەیەو هیچ کەسێ ناتوانێ ڕێگەی پێ بگرێ و ئەوەی ئارەزۆی هەبێ ئەیکا .

هەڵبژاردنی موحەمەد بۆ پێغەمەرایەتی شتێکی تازە نیەو هەر تەنها ئەورەوانە کرابێ، خوای مەزن جگە لە موحەمەد نێرراوی تری هەڵبژاردوە ئەوەتە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ اللهُ يَصطْفي مِنَ الْمَلائِكَةِ رُسُلاً وَمِنَ النّاس إنَ اللهَ سَميعٌ بَصِيرٌ ﴾ خوای مەزن لە فریشتەکانی چەندین نێرراوێ هەڵئەبژێرێ وەك جبرەئیل سروش ئەهێنێ لەلایەن خوای مەزنەوە بۆلای پێغەمەران و لە ئادەمیزادیش چەندین نێرراو هەڵئەبژێرێ ئەوەی خوای مەزن ئەی نێرێ بۆلای ڕای بگەیەنێ بە ئادەمیزاد. وەك موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ بەڕاستی خوای مەزن گفتوگۆی پێغەمەران ئەبیسێ، هەر شتێ ئەوان بیکەن ئەی بینێ و هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ يَعْلَمُ مابَيْنَ أيهديهِمْ وَما خَلْفَهُمْ وَإلى اللهِ تَرْجَعُ الأُمُورُ ﴾ خوای مەزن ئەزانێ بە شتێ پێغەمەران لەمەوبەر کردویانەو لەمەودوا ئەیکەن، ڕابوردوی کاری ئەوان و دوواهاتوی کاریان ئەزانێ و هەربۆلای خوای مەزنە گەڕانەوەی هەمووکارێکی ئەوان .

بۆئاگاداری: لە قورئانی پیرۆزدا بە زۆری ئایەتەکانی قورئان دووپات کراونەتەوە بۆ بەڵگە لەسەر یەکێتی خوای مەزن، لەهەرجێگەیەکا مەبەستێکی تایبەتی هەیە بۆ دووپات کردنەوە جگە لەوەی تریان نەك تەنها دووپات کردنەوەبێ بەبێ مەبەست. بەڕاستی مەبەستی سەرەکی ئیسلام ئەوەیە کە ئادەمیزاد پەیوەستبن بە خوایەکی تەنهاوەو هاوبەشدانان بۆی تاوانێکە گەورەتر لەو تاوانە نیەو نایشبێ، مەبەستیش ئەوەیە: هەرکاتێ ئادەمیزاد هەر یەك خوای پەرست و یەك پێشەواو یەك ئایین و یەك دەستوری هەبێ ئاسایش باڵ ئەکێشێ بەسەر دانیشتوانی ڕوی زەوی و وەك برا ئەژین و ناکۆکی و ئاژاوە پەیدانابێ لە نێوانیانا. بەلام ئەگەر چەند خوایە پەرستراو چەند پێشەوایە هەبوو ڕق وکینە و ئاژاوە پەرەئەسێنێ و هۆز پەرستی و بنەماڵە پەرستی و

بازرگانی کردن بە بیروباوەڕەوە تەشەنە ئەکاو ئەبنە هـۆی بـەرپابوونی جـەنگ و سەرئەکێشـێ بۆلای سودی تایبەتی نەك ئاین و نیشتمان پەروەری .

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُواْ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

﴿ يا أيها الذينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجِدُوا وَاعْبُدُوا رَبَكُمْ ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوە: ئێوە نوێژەکانتان جێبەجێ بکەن، چونکە گەورەترین پایەی ئایینەو لە ڕکوع و سـوژددا ئارام بگرن، چونکە ئەوان جێگەی دەرکەوتنی بچوکـی و بەندایـەتین و پـەروەردگاری خۆتـان بپەرستن و پەرستنی پەروەردگار چاکترین شتێکە بۆ ئێوە.

﴿ وَأفْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ وەئێوە هەموو کردەوەیەکی چاك بکـەن، وێنـەی نوێـژ و سەردانتان لـە خزم و لـە دۆست و لـە هاوڕێ، با بۆ ئەوەی ڕزگارتان ببـێ لـە سـزاو بـەختیاری بەدەست بهێنن بە چونتان بۆ بەهەشت .

﴿ وَجاهِدُوا في اللهِ حَقَ جِهادِهِ هُوَ أجْتَباكُمْ ﴾ وەئێوە کۆشش بکەن و خۆتان ماندو بکەن بـۆ کردنی هەموو کارێکی چاك و بۆ بەرزکردنەوەی ئالای ئایینی خوای مەزن لـەبەر خۆشەویسـتی خواو خۆتان بگێڕنەوە لـە دواکـەوتنی هەوەسـی خراپی خۆتـان بـە ڕاسـترین و شایستـەترین

ماندوكردن بە نیازی پاكەوە، خوای مەزن ئێوەی هەڵبژاردووە بۆ جێبەجێ كردنی ئایینی خۆی و بەرگری لە خۆتان و لە ئایینی خۆتان. ناوەڕۆكی ئەو ڕستانەی پێشوو ئاماژە بۆ ئەوە ئەكەن بە تەنها باوەڕ سود دنابەخشێ بەڵكو پێویستە چوار شتی تریشی لەگەڵدابێ:

(١) پێویستە ئێوە نوێژەكانتان بكەن (٢) خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا لە دووڕوی و دڵ پیسی و هورو ژانی جەنگ و بوختان و بلاوكردنەوەی خراپە (٣) هەموو كارێكی چاك بكەن لە دەست گیرۆیی هەژاران و كۆمەكی كردن بە ئادەمیزادی پەك كەوتە (٤) خۆتان ماندوبكەن بە خۆتان و بە سامانتانەوە لە دژی دوژمنانی ئایینی خواو لە دژی دوژمنی مرۆڤایەتی، هەركاتێ لە ئادەمیزاد ئەو چوار شتانە كۆبونەوە ئەو كەسە خاوەنی بەختیاری و ڕەزامەندی خوای مەزنەو ڕزگاری ئەبێ لە سزای خوای مەزن .

﴿ وَما جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِينِ مَنْ حَرَجٍ ﴾ وەخوای مەزن نەیداوە بەسەر ئێوەدا هیچ جۆرە ئازارێ لە بارەی ئایینەوە، بەجۆرێ گرانبێ لەسەر ئێوە هەڵسان بۆ كردنی فەرمانەكانی ئایین. بەڵكو ئاسانی كردووە لەسەرتان كردنیان: ئەوەتە بەكارهێنانی خۆڵ دروستە لەكاتی بێ ئاوی و نەخۆشیدا. نوێژی بۆ كورت كردونەتەوەو ڕۆژو نەگرتنی بۆ ڕەواكردون لەكاتی كاروانیدا. مرداروبووی بۆ ڕەواكردوون لە كاتی گرانیدا، هەروەها چەندین شتی تریشی بۆ ئاسان كردوون.

﴿ مَلَّةَ إبْراهِيمَ ﴾ ئێوە دوای ئاینی ئیبراهیم بكەون هەموو بنچینەكانی ئایینی ئیبراهیم لە ئایینی ئیسلامان، زۆربەی یاساو دەستور ئایینی ئیبراهیم دەستوری ئیسلامە، ئیبراهیم باوكی ڕاستی زۆربەی پێغەمەرانەو باوكی گیانی هەموو ئایینە ئاسمانیەكانە، هەموو ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ پێك هاتوون لە پێغەمەرایەتی ئیبراهیم .

﴿ هُوَ الذي سَماكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ ﴾ هەر بەو جۆرە خوای مەزن ئێوەی شارەزا كردووە بۆلای ئایینی ئیسلام هەر بەو جۆرە خوای مەزن ئێوەی ناوبردووە بە ئیسلام لە نامەكانی تردا بەر لە هاتنە خوارەوەی قورئان.

﴿ وَفِي هَذا ﴾ وەهەروەها خوای مەزن لە قورئانیشا ناوی ئێوەی بردووە بە موسڵمان و ڕێزی ئێوەی داو بەسەر هەموو نەتەوەكانی تردا. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ڕاناوی (سماكم) ئەگەڕێتەوە بۆلای خوای مەزن یابۆلای ئیبراهیم، هەرچۆنێ بێ ئێوە ناوتان نراوە بە ئیسلام ومەبەستەكە ناگۆڕێ.

﴿ لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَداءَ عَلَى النّاسِ ﴾ خوای مەزن ئێوەی ناوبردوە بە ئیسلام لەبەر ئەوەی نێرراوی خوای مەزن شایەتی بدا لەسەر ئێوە لە ڕۆژی دواییدا كە

فەرمان و پەیامی خوای مەزنی ڕاگەیاندوە بە ئێوەوە ئێوەیش شایەتی بدەن لەسەر گەلانی پێشوو کە پێغەمەرەکانی ئەوان فەرمانی خوای مەزنیان بەوان ڕاگەیاندوە لەبەر ئەوەی خوای مەزن فەرمویەتی لە قورئاندا:

ئەبێ بزانرێ شایەتی یەکەم پێغەمەری خوای مەزنە. شایەتی دووهەم زانایانی ئایین: ئەگەر زانایانی ئایین کەمتەرخەمی بکەن لە ڕاگەیاندی فەرمانی خوا بەرپرسیارن لای خوای مەزن لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەر شایەتی لەسەر دراوەکان فەرمانی خوایان بەجێ نەهێنا سزایان ئەدرێ لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ ﴾ دوایی ئێوە نویژەکان بکەن و بەردەوامبن لەسەر کردنیان و، زەکاتەکانتان بدەن بە هەژاران تاپاکتان بکاتەوە لە گوناهو پەنا هەر بۆلای خوا مەزن ببەن لە هەموو کارێکی خۆتان.

﴿ هُوَ مَوْلاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴾ هەر خوای مەزن خاوەن و یاریدەرو پارێزەری ئێوە، دوایی خوای مەزن یاریدەرو پارێزەری چاکە بۆ ئێوە، بێ وێنەیە لەسەرداری کردنا بۆ هەموو بونەوەران .

بۆ ئاگاداری: زانایان بیروبۆچونیان جیاوازە لە بارەی سوژدە بردنی خوێندن لەم سورەتەی حەجدا. زۆربەی زۆری زانایان لایان وایە ئەم سورەتە دوو سوژدەی تێدایە: سوژدەیە لە کاتی خوێندنی ئایەتی (١٨) سوژدەیە بۆ خوێندنی ئایەتی (٧٧)ی ئەم سورەتە. هەندێ لە زنایان ئەڵێن: هەر بۆ ئایەتی (١٨)ی ئەم سورەتە سوژدە ئەبرێ. ژمارەی سوژدەی خوێندنی قورئان (١٤) سوژدەن سورەتی (ص) سوژدەی تێدا نیە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ژمارەی سوژدەکان (١٥)بە سوژدەی (سادیشەوە. هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: سورەتە درێژەکان سوژدەیان تێدا نابرێ. کەواتە لای ئەو زانایانە سوژدەی خوێندنی قورئان ژمارەیان (١١) سوژدەن. بۆ زانیاری تەواو تەماشای نامە یاساییەکان بکەن .

**بە یاریدەی خوای مەزن ماناکردنی جزمی (١٧) کۆتایی پێ هات لە ڕۆژی چوارشەممە، بە ڕێکەوتی ڕۆژی یەکەمی مانگی موحەڕەم ساڵی (١٤٢١) ی کۆچی بەرانبەر بە (٥/٤/٢٠٠٠)ی زایینی. لەخوا ئەپاڕێمەوە خوای مەزن یارمەتی دەرم بێ بۆ چاپ کردنی ئەم تەفسیرە، خوای مەزن خێزانەکانم یارمەتی بدە لەسەر بەجێ هێنانی فەرمانەکانی تۆو پەرستنی خۆت**

## ﴿ سورەتی ئەلمؤمنون ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١٨) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾

(بسم الله الرحمن الرحيم)

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ قَدَ أفْلَحُ الْمؤمِنُونَ الذيْنَ هُمْ في صَلاتِهمْ خاشِعُونَ ﴾ بەڕاستی ڕزگاریان بووەو بەئاواتی خۆیان گەیشتوون کەسانێکی ئەوتۆ ڕوی دڵیان بەلای نوێژەکانیانەوەیە و چاویان دائەخەن بۆ جگەی جێگەی سوژدەوکانیان ناڕوانن و لە خوا ئەترسن و ملکەچی خوای مەزنن. نوێژی بێ ترسان وەك لەشی بێ گیان وایە.

﴿ وَالذيْنَ هُمْ عَنِ للغْوِ مُعْرِضُون ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن وازئەهێنن لەهەموو گفتوگۆیەکی ناشرین کەخەریکیان بکا بەجگەی پەرستنی خوای مەزنەوەو لەشتێ بێ سوودبێ .

﴿ وَالذيْنَ هُمْ للزَكاةِ فاعِلُون ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن بە ڕەزامەندی دەرونی خۆیان زەکاتی داراییەکانیان ئەدەن کەپێویست کراوەلەسەریان، هەتا پاك ببنەوە لەگوناهوپیسی دەرونیان .

﴿ وَالذيْنَ هُمْ لِفُروجِهِمْ حافِظُونَ إلاّ عَلَى أزْواجِهِمْ أوْما مَلَكَتْ أيْمانَهُمْ فَأنَهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن خۆیان دور ئەخەنەوە لە داوێن پیسی و ژێر داوێنی خۆیان ئەپارێزن مەگەر لەسەر ژنەکانیاو لەسەر ئەو کارەکەرانەی خۆیان پەیدایان کردوون بە تواناو ماندوبوونی دەستەکانیان، دوایی بۆ ئەوانە لۆمەیان ناکرێ بە چوونە لایان .

﴿ فَمِنَ أتْبَغي وراءَ ذلِكَ فَأوُلئِكَ هُمْ الْعادُونَ ﴾ دوایی کەسێ چوبێتە لای جگەی ژنەکانیان و کارەکەرەکانیان ئیتر ئەوانە پیاوبن یا ژن، دوایی ئەو کەسانە لایان داوە لە سنووری خوای مەزن. خۆڕزگارکردن بەدەست یان بەهۆی ئاژەڵەوە لادانە لە سنوری خوای مەزن. بەڵام لای حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان و هەندێ لە شافعیەکان خۆڕزگارکردن بەدەست دروستە ئەگەر ترسی داوێن پیسی هەبێ، چونە لای ژنی خۆتان بە جگەی شوێنی دیاریکراو لادانە لە سنوور. داوێن پیسی یەکێکە لە گوناهە گەورەکانە .

﴿ وَالذيْنَ هُمْ لأماناتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ راعُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن ئاگاداری ئەو شتانەن لایان دانراوەو ئەو بەڵێنانەی داویانە ئەیان کەن و دەست کاری خراپیان ناکەن و بە دژی پەیمانی خۆیان هەڵناسن. ئیتر پەیمانی نێوان خۆیان و خوای مەزنبێ وەك نوێژ و ڕۆژو وحەج. یا پەیمانی نێوان خۆیان و ئادەمیزادبێ کە دابێتیان بە یەکتری، هەر لەو بەشەیە هەڵسانی کاربەدەستان لەبۆ ئەوشتەی پێویستە لەسەریان بیکەن بۆ ژێر دەستەکانیان .

﴿ وَالذيْنَ هُمْ عَلَى صَلَواتِهِمْ يُحافِظُونَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن بەردەوامن لەسەر کردنی نوێژەکان لەکاتی دیاری کراوی خۆیانا بە تەواوی و بە هەموو مەرجەکانیانەوە بەبێ کەم و کوڕی بەو جۆرەی جبرەئیل فێری پێغەمەری کرد ﴿ﷺ﴾.

﴿ أوْلئِكَ هُمُ الْوارِثُونَ الذيْنَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسِ هُمْ فِيها خالِدونَ ﴾ ئەو شەش تاقمە بەو جۆرەی باسیان کرا هەر ئەو کەسانەن میرات گرێکی ئەوتۆن بەهەشت ئەکەن بە میرات بۆخۆیان لە ڕۆژی دواییدا، بەردەوامن لە نێو بەهەشتا، بەبۆنەی کرداری خۆیانەوە، ئەو میراتە لە کوێ و میراتی جیهانی لە کوێ؟.

خوای مەزن لـە زۆربـەی ئایەتـەکانی قورئـانی پیرۆزدا ئامـاژەی بـۆلای دروسـت کردنـی ئادەمیزاد فەرموە، بۆئەوە نیە ئێمە بزانین ئێمـەی ئـادەمیزاد لـە چ لایەکـەوە هـاتووبن و چـۆن دروست بووین. بەڵکو بۆ ئەوەیە ئێمە باوەڕ بەخوای مەزن بهێنین و بە گوێـرەی فـەرمودەکانی کار بکەین و بەتەمای پاداشتی بین و لـە سزای بترسین. هەرچەندە ئـەو ئـادەمیزادە بونەوەرێکـە خوای مەزن هێزو توانایەکی وای داوەتێ بە هیـچ بونـەوەرێکی تـری نـەداوە، بـۆ زانینـی ئـەو بونـەوەرە سـەر سوڕێنە زانایـانی ئـادەمیزاد داوا لـە خـوای مـەزن ئەکـەن ئـادەمیزاد لــە چ جێگەیەکەوە هاتووەو چۆن دروست بووەو لـە چ شتێ دروست کراوە، خوای مـەزن وەڵامیـان ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَـٰفِلِينَ ﴿١٧﴾

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنا الأنسانَ مِنْ سلالَةٍ مِنْ طِينٍ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە بـۆ یەکەم جار لـە شتێ دەرئەهێنرێ لـە خاك: چونکە تۆوی مـرۆڤ پـەیدا ئـەبێ لـە خواردەمـەنی، خواردەمەنیش یا ڕووەکە یا دانەوێڵەیە یا گۆشتی گیاندارە، ئەوانەیش هەموویان لـە خـاك پـەیدا ئەبن. کەواتە مرۆڤ لـە بنچینەدا لـە خاك دروست کراوە ڕاستەوخۆ لـە ئادەم یا بەشتێ لـە خـاك پەیدا ئەبن بەهۆی خواردەمەنییەوە وەك ئادەمیزاد بە گشتی، ئـەو خواردەمەنییـە زۆر گۆڕانـی

بەسەردا دێت هەتا ئەبێ بە تۆیی نێرینەو ئەیپارێزێ لە جێگەیەکی ندۆراوی خۆیا کە منداڵدانی ژنە، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرارِ مكينٍ ﴾ لەپاشا ئێمە ئەو خاکە ئەگێڕین بە تۆوێکی شل و تەڕ بە چونە لای پیاو بۆلای ژن و دای ئەنێن لە جێگەی پارێزراوی خۆیا کە منالّدانی ژنە .

﴿ ثُمَ خَلَقْنا النُطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنا الْعَلَقَةَ مَضْغَةً ﴾ لە پاشا ئێمە ئەو تۆوە ئەکەین بە پارچەیە خوێنی ڕەقی بێ گیان دوایی ئەو خوێنە ئەکەین بە پارچە گۆشتێکی بێ ئێسك هەتا ماوەی چل ڕۆژ .

﴿ فَخَلَقْنا المُضْغَةَ عِظاماً ﴾ دوایی هەندێ لەو گۆشتە ئەکەین بە ئێسك و دەمار، هەندێ لەو ئێسکانە نەرمن و شایستەی ڕاکێشانن و چەندین ئەندامی جیاوازی لێ دروست ئەکەین .

﴿ فَكَسَوْنا الْعِظامَ لَحْماً ثُمَ أنْشَأنا خَلْقاً آخَرَ ﴾ دوایی ئێمە ئەو ئێسکانە دائەپۆشین بە گۆشت، لە پاشا ائێمە دروست ئەکەین لەو شتانە باسکران بونەوەرێکی تری ڕێك و پێك و لەش و شێواز شیرین، ئەبێتە خاوەنی ئەقڵ و چاوو گوێچکەو هەست و خاوەنی گفتوگۆکردن، بە هەموو ئەندامێکی کاری تایبەتی ئەدەینێ، بەجۆرێ بتوانێ پێویستی ژیانی ڕۆژانەی خۆی پەیدا بکاو پلەە پایەی بەرزو بەنرخ بۆ خۆی فەراهەم بێنێ.

﴿ فَتَبارَكَ اللهُ أحْسَنُ الْخالِقِينَ ﴾ دوایی خوای مەزن بەرزو بڵندەو بێ هاوتایە لە تواناداچاکترین و شیرینترین نەخشە کێشەکە بەو جۆرە ئادەمیزادی دروست کردووە و کەس ناتوانێ شتێ بەو جۆرە نەخشە بکێشێ.

﴿ ثُمَ إنَكُمْ بَعْدَ ذلِكَ لَمَيِتُونَ ﴾ لە پاشا بەڕاستی دوایی کۆتایی پێ هاتنی تەمەنتان و دوای دروست کردنتان بەو تەرزەی پێشوو ئێوە لە جیهاندا ئەمرن و ئەچنەوە بۆلای پەروەردگاری خۆتان .

﴿ ثُمَ إنَكُمْ يَوْمَ الْقيامَةِ تُبْعَثُونَ﴾ لە پاشا بەڕاستی ئێوە زیندو ئەکرێنەوە لە ڕۆژی دوایدا دوای ئەوەی لەجیهاندا مردن و پرسیاری کردەوەکانتان لێ ئەکرێ لە چاك و لە خراپ، هەریەکەتان بە گوێرەی خۆتان پاداشت وەرئەگرن.

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرائِقَ وَما كُنا عَنِ الْخَلْقِ غافِلِينَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە دروستمان کردووە لە ژوری ئێوەوە حەوت جێگەی سوڕانەوە بۆ حەوت ئەستێرە: کە هەندێکیان لەسەرووەی هەندێکی تریانەوەن. لەسەرەوەی هەمویانەوە زوحەل دوایی موشتەری، دوایی مەریخ، دواتر خۆر، ئەنجا زوهرە، دوای ئەو عوتارید، دوای هەموویان مانگ. بە هۆی توانای

خوای مەزنەوە هەریەکە لــەو ئەستێرانە هــێزی وەستان و ڕاکێشـانی تایبــەتی خۆیـان هەیــەو ئەیانپارێزێ نەکەونە خوارەوەو پرۆگرامی بونەوەران تێك بچــێ، خـوای مــەزن لــە نێـوان ئــەو ئەستێراننەدا بۆشایی دروست کردووەو نادەن لە یەکتری و ئێمە لە بـەڕێوەبردن و سـوڕانەوەی ئەو ئەستیێرانە بێ ئاگانین و هەموویان کاری تایبەتی خۆیانمان پێ سپاردون .

بۆ ئاگاداری: ووشەی (سبع) لـە ئایەتی (٢٩)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا و ئایەتەکانی تردا ئەوە ناگەیەنێ کە ئاسمانەکان حەتبن و ئاسمانی تر نەبن، لـەوانەیە باسـکردنی ووشـەی حـەوت لەبـەر هۆیەکی تایبەتی بێ و ئێمە نایزانین، چونکە ئێمە زانایی تایبەتی بە ناسینی ئاسمانەوەنین، بۆیە لـەوە زۆرتر گفتوگۆی لـەسەر ناکەین .

بەڵام ڕۆژنامەی (الأخبار) میسری (١٧)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٩)ی زانینی بەسـەردێڕی (اللّٰهُ والأنسانُ والْقَمَرُ) ئەم بیروبۆچونەی خوارەوەی بڵاوکردۆتەوەو ئەڵێ:

(زانست دەری خستوە کە بەڕاستی لـە بۆشاییدا چەندین ئاسمان هەن لـە جگەی ئــەم ئاسمانــە ئێمە لـەناویدا ئەژین ئەو ئاسمانانە ئێمە نایــان بینــین بــەڵام بــەهۆی ئــامێری شــت گەورەکــەرەوە ئەبینرێن، هەموو ئاسمانێ لـەو ئاسمانانە خۆرێکی بەهێزتری لـەم خۆرەی ئێمەیان هەیە، ئەگەڕێن بە دەوری ئەو خۆرەدا چەندین ئەستێرەو خاوەنی کێش و ڕاکێشانی تایبەتی خۆیانن، ئێمە بــە هیــچ جۆرێ ناگەینە یەکێ لـەو ئەستێرانە هەرگیز. بەڵام زانست دەری خستوە بە ئامێری تایبەتی ئــەو ئەستێرانە هەن، هۆی نەگەیشتنی ئێمە بەو ئەستێرانە ئەوەیە ئەوان بە مەلاین ساڵی ڕونـاکی لــە ئێمە و دورن، ئەگەر بمانەوێ بگەینە لای نزیکترینی ئەو ئەستێرانە ئێمە پێویســتیمان بــە تەمــەنی مەلاین ساڵ ئەبێ، ئەوەیش ڕاستی‌یە کە زانســتی تـازە دەری خســتووە) کەواتــە مەبەســت لــە حەوت ئاسمان حەوت بۆشایەو مەبەست حەوت ئەستێرە نیە، هەریەکە لـەو بۆشاییانەی ســەرەوە کۆمەڵێ ئەستێرەیان نایەنە ژمارەو ئێمە ناگەین بەوان و بەمەلاین ساڵ ناژین. بەڵام ئــەو حــەوت زەویانە لـە ئایەتی (١٢)ی سورەتی تەلاقدا ئاماژەی بۆ کراوە حەوت زەویە. یانێ لـەناو هەریەکە لـەو کۆمەڵە ئەستێرانە زەوییەکی تایبەتێ خۆیان هەیە. وەخوای مەزن فەرموی: ئێمە بێ ئاگــانین لـە بونەوەران و ئەیش فەرموی:

وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ

لَكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾

﴿ وَأنزَلْنا مِنَ السَماءِ مـاءً بِقَدَرٍ ﴾ وە ئێمە لە هەوری ئاسمانەوە ئاوێکمان ناردووەتە خوارەوە بە ئەندازەیەکی دیاری کراو بۆ سودەی ئێوە، نەئەوەندە زۆربێ بەروبومتان لە ئاو ببا نە ئەوەندی کەمبێ ببێتە هۆی نەڕواندن یا گەشە نەکردنی کشتوکاڵ. ببێتە هۆی زیان گەیاندن بە سەوزبوونی کشتوکاڵ و کەم شیری ئاژەڵ. هەور پەیدا ئەبێ لە تەم کە بەرز ئەبێتەوە لە دەریاو زەریاو کێوەکان و ئەگاتە ساردی لە هەواداو ئەبێ بە باران و ئەڕژێتە سەر زەوی .

﴿ فَأسْكَناهُ في الأرْضِ ﴾ دوایی ئێمە ئەو ئاوە دائەنێین لە ناو زەویداو لەنێو سەرچاوەی ئاوی کانیەکان و لەناو چاڵ و گۆل و درزو کێوەکان و زەریاو دەریا و ڕوبارەکاندا بۆ ئەوەی سودی لێ وەربگرن، بە تایبەتی لە جگەی وزەی زستاناو لە کاتی پێویست درەختەکانی خۆتانیان پێ ئاو بدەن، هەتا هەرزانی و خۆشی باڵ بکێشێ بەسەرتانا.

﴿ وَإنا عَلَى ذَهابٍ بِهِ لَقادِرُونَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە توانامان هەیە نەهێڵین ئەو ئاوە بێتە خوارەوە لە هەوری ئاسمان یا ببیەنەخوار بە ناو زەویدا و ئێوە سودی لێ وەرنەگرن و تووشی گرانی و برسێتیناهەموار بین، ئاشکرایە کەسێ بتوانێ بە ئەندازی دیاری کراو ئاوی بڕێژێ بەسەر زەویدا ئەتوانێ قەدەغەیشی بکا. خوای مەزن میهرەبانەو ئەو شتە ناکا لەگەڵ بەندەکانی خۆیا .

﴿ فَأنْشَأنا لَكُمْ بِهِ جَناتٍ مِنْ نَخيلٍ وَأعْنابٍ لَكُمْ فِيها فَواكِهُ كَثيرَةٌ ومِنْها تَأكُلُونَ ﴾ دوایی ئەسازێین بۆ سودتان بە هۆی ئەو ئاوەوە چەندین باخ و بۆستان لە خورماو لە ترێ، بۆئێوە پەیدا ئەبێ لەو بۆستانەدا میوەو شەو چێژەی زۆرو جۆراوجۆر لە فریکە خورماو لە خورمای ووشك و لە ترێ و لە مێژو لە دۆشاوو باسوق و شتی ترو هەر لە بەروبوومی ئەو بۆستانانەیش ئەخۆن لە گەنم و برنج و جۆو دانەوێڵەی ترو هەندێکیشیان ئەفرۆشن بۆ پێویستی ترتان.

﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلآكِلِينَ ﴾ وە ئێمە ئەسازێنین بۆسوودی ئێوە درەختی زەیتوون کە خوای مەزن لە کێوی توری سینادا دروستی کردووە یەکەم جارو لەوێوە بلاّوبۆتەوە بە زوربەی ڕوی زەویدا، کێوی توری سەینا ئەو کێوەیە موسا گفتوگۆی تێدا کرد لە خزمەت خوای مەزندا، ئەو درەختی زەیتونە سەوز ئەبێ ئەڕوێو ئێوە ڕۆنی لیّ دەرەهێنن بۆ پێویستی خۆتان و بۆ ڕون کردنەوەی چراکانتان و شەو چێژەو پێ خۆریشی لیّ دەرئەهێنن ونانی لیّ هەلّئەکێشن و ئەیخۆن و ئەیکەن بە خۆرشت بۆ خۆتان، خوای مەزن لە ناو هەموو درەختەکانا باسی درەختی خورماو ترێ و زەیتونی کردووە چونکە باشترین درەخت و بەسودترینی هەموو درەختێکن بۆ ئادەمیزاد .

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهَا ﴾ وە بە ڕاستی هەیە بۆئێوە ئامۆژگاری کردن و تەمێ خواری لە چوار پێکانا کە بزن و مەڕو گاو هوشترن هەتا ئێوە بیانکەن بە بەلّگە لەسەر بەخشندەی خوای مەزن، ئێمە دەرخواردی ئێوەی ئەدەین لە هەندێ شت ئێوە دەری ئەهێنن لەو ڕگیانا لە شیرو ڕۆن و کەرەو ماست و پەنیر و شتی تر، ئەو چوار پێانە سوودی زۆریان تێدایە، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ وە بۆ سودی ئێوە هەیە لەو چوار پێیانەدا چەندین سودی زۆر. لە خوری و موو کورگ و موو. ئەیانکەن بە ژێرخەرو سەرخەر بۆ خۆتان و چۆغە و ڕانك و بەرگی تریان لیّ دروست ئەکەن، وە ئێوە لە هەندێ لەشی ئەو چوارپێیانە ئەخۆن، وەك گۆشتەکانیان.

﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾ وە ئێوە هەلّئەگیرن لەسەر پشتی ئەو چوارپێیانە و لەسەر کەشتی خۆتان و کەل و پەلتان لە جێگەیەکەوە ئەڕۆن بۆ بازرگانی وشتی تر زۆر بە ئاسانی و ڕێگەی دورتان بۆ نزیك ئەکەنەوە.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ

مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾

﴿ وَلَقَدْ أرْسَلْنا نُوحاً إلى قَوْمِهِ فَقالَ يا قَـوْمَ أعْبُدُوا اللهَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە نوحمان ڕەوانە کردبوو بۆلای تاقمەکەی خۆی کە بتیان ئەپەرست، ناویان نابوون بـە: وەد، سـواع، یـەغوس، نەسر. دوای نوح فەرموی: ئەی تاقمی من: ئێوە خوایەکی تەنها بپەرستن. نەك چەند خوایێ.

﴿ ما لَكُمْ مِنْ إلَهٍ غَيْرُهُ أفَلا تَتقُونَ ﴾ بۆئێوە نیە هیچ خوایە شایەنی پەرستنبێ جگـەی خـوای مەزن، ئایا ئێوە بۆ لـە سزای خوای مەزن ناترسن و خۆتان ناپارێزن لـەبێ فەرمانی و سزای ئـەو، واز لـە بت پەرستی بهێنن. کەچی دژی نوح وەستان و بوختان و درۆی زۆریان بڵاوکردەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

﴿ فَقالَ الْمَلاءُ الذيْنَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ ما هذا إلاّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ ﴾ دوایی پیاو ماقوڵانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو لـە تاقمەکەی نوح ووتیان. بە دانیشتوان و پەیرەوانی خۆیان: ئەو پیاوە هیـچ

شتێ نیە مەگەر ئادەمیزادێکە بە وێنەی ئێوە بەبێ جیاوازی گوێی لێ مەگرن و بڕوای پێ مەکەن هەر شتێ ئەڵێ .

﴿ يُرِيدُ أنْ يُتَفضَلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شاءَ اللهُ لأنْزَلَ مَلائِكَةً ﴾ ئەیەوێ خۆی بەرز بکاتەوە بەسەر ئێوەداو ئێوە بکا بەژێر دەستەی خۆی، هیچ شتێکی نیە بیکا بە چەکی خۆی جگە لەوەی داوای پێغەمەرایەتی ئەکاو ئەگەر خوای مەزن بیویستایە پێغەمەرێ بنێرێ بە ڕاستی خوای مەزن نێراوێکی خۆی ئەنارد لە فریشتەکان وئەوان فەرمودەی خوای مەزنیان بە ئێمە ڕائەگەیاند لە جیاتی نوح .

﴿ ما سَمِعْنا بِهذا في أبائِنا الأوَلِيْنَ إنْ هُوَ إلا رَجُلٌ بِهِ جِنَةٌ فَتَربَصُوا حتى حِيْنٍ ﴾ ئێمە لبە باوك و باپیرمانەوە ئەو گفتوگۆیەی نوحمان نەبیستوە خوای مەزن لە ئادەمیزاد پێغەمەر بنێرێ نوح هیچ شتێکی پێ نەسپێرراوە ئێمە نەیزانین جگە لەوەی شێتی توشبوبێ هیچ تر نیە، دوایی ئێوە چاوەڕوان بکەن هەتا ماوەیەکە نوح بمرێ یا واز لەم کارەی خۆی ئەهێنێ، یا بیکوژن و ڕزگارتان ئەبێ، قورەیشیەکان بە وێنەی ئەوان ئەو شتانەیان ئەدایە پاڵ پێغەمەرو ئەو گفتوگۆیانەیان ئاڕاستەی پێغەمەر ئەکرد.

﴿ قالَ رَبي أنْصُرُوني بِما كَذبُونِ ﴾ نوح فەرموی: پەروەردگاری من: تۆ من سەربخە بەسەر ئەم تاقمەداو ئەو بەڵێنەی کە داوتە بنەبڕیان بفەرموی جێبەجێ بکە بە هۆی ئەو شتەی باوەڕ بە من ناهێنن و من بەدرۆ ئەخەنەوە.

﴿ فَاوْحِيْنا إلَيْهِ أنَ أصْنَعِ الْفُلْكَ بِأعْيُننا وَوَحَيْنا ﴾ دوایی پاڕانەوەکەی نوحمان وەرگرت و ئێمە سورشمان نارد بۆ لای نوح و فەرمانمان پێدا کە تۆ بەهۆی چاودێری و پاراستنی ئێمەوەو بە هۆی سروشی ئێمەوە کەشتیە دروست بکە هەتا هەڵەی تێدا نەکەی .

﴿ فَأذا جاءَ أمْرُنا وَفارَ الْنُورُ ﴾ دوایی کە کاتێ سزاو لەناوبردن هات بۆلای بێ باوەڕان و ئاو لە ڕوی زەویەو هەڵقولا نیشانەی لەناوبردنی هەموو بێ باوەڕانە. ووشەی (النور) بەم مانایە هاتووە: نیشانەی ڕۆژ بونەوەی. ڕوی زەوی. بەرزترین جێگەی زەوی. زانایان بیروبۆچونیان جیاوازە لە دیاری کردنی ئەو جێگەیە ئاوی لێ هەڵقولا یەکەم جار، هەروەها ئەو تەنورە چ شتێ بووە، هەر جێگەیە بێ و ئەو تەنورە چۆنبێ گرنگ نیە، ئەوەی پێویست بێ ئەو ڕووداوە پەیدا بووە بە بێ گومان .

﴿ فَأسْلُكْ فِيها مِنْ كُلِ زَوْجَيْنِ أثْنَيْنِ وَأهْلَكَ إلاّ مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ ﴾ دوای هەڵقولانی ئاو لە ڕوی زەوی تۆ بخەرە نێو ئەو کەشتیە لە هەموو تاقم و ڕەگەزێ لە گیانداران دوو تاکی

هاوجوت یانێ نێرینەیەك ومێینەیە. بخەرە ناو کەشتیەکەوە خێزانەکانی خۆت هەموویان مەگەر کەسێکیان لە پێشەوە فەرمانی ئێمە دەرچوبێ کە ئەو کەسە ئەخنکێنن لەخێزانەکانی تۆ، وەك کەنعانی کوڕی خۆت کە باوەڕی نەهێناوەو ژنە دڵ پیسەکەیشت .

﴿ وَلا تُخاطِبي في الذيْنَ ظَلَمُوا إنَهُمْ مُغْرَقُونَ ﴾ وە تۆ گفتوگۆ مەکە لەگەڵ من و مەپاڕێرەوە لەبۆ ڕزگارکردنی کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لە خۆیان کردووەو باوەڕیان نەهێناوە بە ڕاستی ئەو کەسانە ئەخنکێنرێ بەلافاو.

﴿ فَأذا أسْتَوَيْتَ أنْتَ وَمَنْ مَعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلِ الْحَمْدُ للهِ الذي نجانا مِنَ الْقَومِ الظّالِمينَ ﴾ دوای ئەوەی تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆن لە باوەڕداران و ئارامتان گرت لەسەر ئەو کەشتیە، دوایی تۆ سوپاسی خوای مەزن بکە لەسەر ئەو چاکانە بەخشی بە تۆو پاڕانەوەکەی لێ وەرگرتی و سەری خستی بەسەر دوژمنانی خۆتاناو بڵێ: هەموو سوپاس و ستایش بۆ کەسێکی ئەوتۆیە ئێمەی ڕزگار کرد لە تاقمی ستەمکاران .

﴿ وَقُلْ رَبي أنْزِلِني مُنْزَلاً مُبارَكاً وَأنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ ﴾ وەتۆ کاتی هاتنە دەرەوەت لەسەر کەشتیەکە بڵێ: ئەی پەروەردگاری من: تۆ من دابنێ لە جێگەیەکی پیرۆزو خاوەن پیت و فەڕ کە تۆ من بپارێزی لەو جێگەیەدا لە هەموو خراپەیە لە خۆم خێزانەکانم و ئەو کەسانەی باوەڕیان بەتۆ هێناوەو تۆ چاکترین کەسێکی بەندەکانی خۆت دابنێ لە شیرینترین جێگەدا.

﴿ إنَ في ذلِكَ لأياتٍ ﴾ بەڕاستی لەناو ئەو شتەی خوای مەزن کردی لەگەڵ نوحو تاقمەکەی چەند بەڵگە لەسەر ئەوەی زانایانی ژێر تەمێ خوار بکا لە قوڕەیشیەکان و جگەی ئەوان و بیان کەن بە بەڵگە لەسەر یەکێتی و توانای خوای مەزن.

﴿ وَإنْ كُنا لِمُبْتَلِينَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە بەندەکانی خۆمان تاقی ئەکەینەوە بە ناردنی پێغەمەران و نامەکان هەتا پیاو چاکان و پیاو خراپان لەیەك جوێ ببنەوە، ڕون ببێتەوە نیازو کرداری هەموویان، دوایی پاداشتیان بدرێتەوە بە گوێرەی شایەنی خۆیان .

ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يَأۡكُلُ مِمَّا تَأۡكُلُونَ مِنۡهُ وَيَشۡرَبُ مِمَّا تَشۡرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنۡ أَطَعۡتُم بَشَرٗا مِّثۡلَكُمۡ إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمۡ أَنَّكُمۡ إِذَا مِتُّمۡ وَكُنتُمۡ تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخۡرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيۡهَاتَ هَيۡهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا وَمَا نَحۡنُ لَهُۥ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٖ لَّيُصۡبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ بِٱلۡحَقِّ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ غُثَآءٗۚ فَبُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾

﴿ ثُمَّ أَنْشَأنا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْناً آخَرِيْنَ ﴾ لە پاشا ئێمە دروستمان کردووە لە دوای تاقمی نوح تاقمێ تری سەردەمێ تر، وەك تاقمی عادو سەمود، جێگەکانیان لە حیجرادان لە نێوان شام و حیجاز، ئێستا ئەناسرێ بە فەجولناقە .

﴿ فَأَرْسَلْنا فِيهِمْ رَسُولاً مِنهُمْ أنِ أعْبُدُوا اللهَ ما لَكُمْ مِنْ إلَهٍ غَيرْ أفَلا تَتَقُونَ ﴾ دوایی ئێمە ڕەوانە کردبوو پێغەمەرێ لە ناوخۆیانا و لە ڕەگەزی خۆیان، وێنەی سالّح بەوانی فەرموو: کە ئێوە خوایەکی تەنها بپەرستن، بۆ ئێوە نیە هیچ خوایە جگەی خوای مەزن کە هەموو بونەوەرانی دروست کردووە، ئایا دوایی ئێوە بۆ لەو خوایە ناترسن؟.

﴿ وَقالَ المَلاءُ مِنْ قَوْمِهِ الذيْنَ كَفَرُوا وَكَذَبُوا بِلِقاءِ الآخِرَةِ ﴾ وە پیاوە بەرێزەکان لە تاقمی ئەو پێغەمەرە کەسانێکی ئەوتۆبوون باوەڕیان نەهێنابوو بە درۆیان ئەخستەوە گەیشتن بە ڕۆژی دوایی و زیندوبوونەوەوپاداشت .

﴿ وَأتْرَفناهُمْ في الْحَياةِ الدُنيا ﴾ وە ئێمە خۆشی و چاکەمان پێ بەخشیون لە ژیانی جیهاندا بە منالی زۆرو سامانی فراوان و بەروبومی زۆری زەوی و کۆشکی بەنرخیان دروست کردبوو لە دەشتاو خانویان ئەتاشی لەبەرد بەو تاقمەی خۆیان ووت:

﴿ ماهذا إلاّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يَأكُلُ مِما تأكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِما تَشْرَبُونَ ﴾ ئەو کەسەی ئەوتۆ ئەڵێ: من پێغەمەرێکم ڕەوانە کراوم لەلای خوای مەزنەوە بۆلای ئێوە وا نیە مەگەر ئادەمیزادێکە وێنەی ئێوە ئەخوا ئەو شتەی ئێوە ئەیخۆن و ئەخواتەوە لەشتێ ئێوە ئەیخۆنەوەو پێویستی بە خواردن هەیە بە وێنەی بچوکتر پیاوێ لە ئێوە .

﴿ وَلَئِنْ أطَعْتُمْ بَشَرَاً مِثْلَكُمْ إنَكُمْ إذاً الخاسِرُونَ ﴾ وەئەگەر ئێوەپەیرەویی پیاوێ بکەن بە وێنەی خۆتان و واز لە بت پەرستی بهێنن بەڕاستی ئێوە ئەو کاتە ئەگەڕێن بە کەسانێ زیانیان لە خۆیان دابێ، بەو بۆنەوە بچوکی کەسێ ئەکەن بەرێزتر نیە لە ئێوە. ئەو کەسانە لە ڕاستی ناگەن ئەگینا خۆیان زیانیان پێ گەیشتووە .

﴿ أيَعِدُكُمْ أنَكُمْ إذا مِتُمْ وَكُنْتُمْ تُراباً وَعِظاماً أنَكُمْ تَخْرَجُونَ ﴾ ئایا ئەو کەسەی ئەڵێ: من پێغەمەرم بەڵێن ئەدا بە ئێوە بەڕاستی ئێوە مردن و بوون بە خاك و ئێسکی بێ گۆشت بەڕاستی ئێوە بە زیندویی وەك ئێستا لە گۆڕەکانتان ئەهێنرێنە دەرەوە؟ ئەو بەڵێنە شتێکی زۆر سەرسوڕێنەرەو شتی وانابێ.

﴿ هَيْهاتَ هَيْهاتَ لِما تُوعَدُونَ ﴾ بەڕاستی زۆر دوورە کە ئێوە بڕواتان بە پەیدابوونی بەڵێنی ئەو کەسە هەبێ لە زیندوبونەوەو پرسیار لە ڕۆژی دووایدا بە گوێرەی ئەو گومانەی ئەو .

﴿ إنَ هِيَ إلاّ حَياتُنا الدُنيا نَمُوتَ وَنَحْيا وَما نَحْنُ بِمَبْعُوثِين ﴾ ژیان و زیندویەتی نیە مەگەر ئەم ژیانەی جیهانەی ئەوتۆ هەندێکیمان ئەمرین دوای کۆتایی پێ هاتنی تەمەنمان، هەندێ ترمان ئەژین هەتا ماوەی تەمەنمان کۆتایی پێ دێ و ئێمەزیندو ناکرێینەوە دوای مردن، ئەوەی مرد لە ناوچوو نایەتەوە .

﴿ إنْ هُوَ إلاّ رَجُلٌ أفْتَرى عَلَى اللهِ كَذِباً وَما نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەو کەسە هیچ شتێ نیە مەگەر پیاوێکە درۆی هەڵبەستووەو ئەیداتە پاڵ خوای مەزن و ئەڵێ: من پێغەمەرم و ئێمە بڕوا بەو پیاوە نایەرین ئەڵێ: من پێغەمەرم و زیندوبونەوە هەیە و ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ .

﴿ قالَ رَبِ أنصُرْني بما كَذَبُونِ ﴾ سالْح پێغەمەر دوای ئـەوە ئومێـدی بـە باوەڕهێنـانی ئـەو تاقمە نەماوە بە هەموو جۆرێ بانگی کردن بۆلای باوەڕهێنان ووتـی: ئـەی پـەروەردگاری مـن: تۆیاریدەی من بدەو تۆڵەی منیان لێ بکەرەوەو بەڵێنی بنەبڕکردنی ئـەو تاقمـە بهێنـەرەدی، بـەو بۆنەوە من بـەدرۆ ئەخەنـەوە و بـەردەوامن لەسـەر بـێ بـاوەڕی. خـوای مـەزن پاڕانەوەکـەی وەرگرت:

﴿ قالَ عَما قَلِيلٍ لَيُصْبِحُنَ نادِمِينَ فَأخَذَتْهُمُ الصَيْحَةُ بِالْحَقِ ﴾ خوای مەزن فـەرموی: کـاتێکی کەم لەمەودوا ئەو تاقمە بەشیمان ئەبنەوە لەبێ باوەڕی خۆیان و لەبە درۆخستنەوەی تۆ، دوایی توشی ئەوان ئەبێ سزایەکی زۆر سەخت بە دەنگێکی وا دڵیان ئەبچڕێنێ لەلایەن خوای مەزنەوە دێتە خوار، جێبەجێ ئەکرێ بە ڕاستی و بەبێ گومان. مەبەست لە (الصیحـە) ئاگرێکـە پـەیدا ئەبێ لەبەیەکادانی دوو کارەبا یەکێکیان گەرم و ئەوی تریـان سـارد ئـەدا لـە زەوی هەرشـتێ ڕەقبێ ئەی توێنێتەوەو ئادەمیزادو درەخت ئەسوتێنێ .

﴿ فَجَعَلْناهُمْ غثاءً فَبُعْداً لِلْقَومِ الظالِمينَ ﴾ دوایی ئێمە ئەو بێ باوەڕانەمان گێڕا بە وێنەی شتێ سەری ئاو ئەکەوێ لە پوش و گەڵای و وشکی سەرئاو، دوایی نەمان و دوری لەبەرزەیی خوا بۆ تاقمێکە ستەمیان لە خۆیان کردوەو باوەڕیان نەهێناوەو پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ خستۆتەوە

ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَـٰرُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَـٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ

﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾

﴿ ثُمَّ أنْشَأنا مِنْ بَعْدِهِمْ قُروناً آخَرينَ ﴾ لە پاشا ئێمە پەیدامان کرد دوای تاقمی عاد چەند تاقمێ تر، وەك تاقمی سالح و لوت و شوعەیب و جگەی ئەوان، هەموویان پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوەو، دوایی ئێمە بنەبڕمان کردن.

﴿ ما تَسْبِقُ مِنْ أمَةٍ أجَلَها وَما يَسْتَأخِرُونَ ﴾ هیچ نەتەوەیە پێشی ئەو کاتە ناکەون دیاری کراوە بۆ لەناو بردنیان و دوایشی ناکەون. هەموو شتێ جگە لە خوای مەزن ماوەیەك و تەمەنێکی دیاری کراوی بۆ هەیە بۆ لەناوبردنی. لەو کەسانەیە لەناوچون بەبێ پاش و پێش ئەو کەسانەی پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە.

﴿ ثُمَ أرْسَلْنا رُسُلَنا تترا كُلَما جاءَ أمَةً رَسُولُها كَذَبُوهُ ﴾ پاشا ئێمە ڕەوانەمان کردبوو نێرراوەکانی خۆمان یەك لە دوای یەك هەریەکەیان بۆلای نەتەوەیە کە پەیدا ئەبوون و ئەهاتن بە دوای یەکتریدا. هەمووکاتێ ئەچوو بۆلای هەر نەتەوەیە پێغەمەرەکەی خۆیان کاتێ بەوانی ڕائەگەیاند پەیامەکەی خۆی ئەو نەتەوەیە پێغەمەرەکەی خۆیان بەدرۆئەخستەوەو باوەڕیان پێ نەئەهێنا .

﴿ فَأتْبَعْنا بَعْضَهُمْ بَعْضاً وَجَعَلْناهُمْ أحادِيثَ ﴾ دوایی ئێمە هەندێ لەو نەتەوانەمان بە دوای هەندێ تریانا ئەهێناو لەناومان ئەبردن یەك لە دوای یەك و ئێمە ئەمان گێڕان بە دەنگ و باسی دانیشتوان و لە کۆڕو کۆمەڵی خۆیانا باسیان ئەکردن و کردمان بەتەمێ کردن بۆ گەلانی دوای خۆیان .

﴿ فَبُعْداً لِقَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ دوایی بنە بڕکردن و دوری لە میهربانی و بەزەیی خوای مەزن بۆ تاقمێ بی باوەڕ بەخوای مەزن ناهێنن وبێ فەرمانی ئەو ئەکەن وپێغەمبەرەکانی خۆیان بەدرۆ ئەخەنەوە.

﴿ ثُمَ أرْسَلْنا مُوسى وَأخاهُ هارُونَ بِأياتِنا وَسُلْطانٍ مُبينٍ ﴾ لەپاشا ئێمە ڕەوانەمان کردبو موسا وهارونی برای موسا بە چەندین نیشانەی ئاشکرا وکاری پەك خەرو بەدەستەڵاتوو هێزێکی ئاشکرا بۆ لای دانیشتوانی میسر.

﴿ إلى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فاُستَكْبَرُوا وَكانُوا قَوْماً عالِينَ ﴾ بۆلای فیرعەون وتاقمەکەی فیرعەون هەتا فەرمودەی خوا بەوان ڕابگەیەنن، دوایی ئەوان خۆیان بەگەورە دانا لە ئاستی موسا وهارون باوەڕیان بە خوای مەزن نەهێناو دوایان نەکەوتن وخۆیانیان بەتاقمێ دائەنا کە بالآترو بەرزترت لەبەنوئیسرائیلیەکان.

﴿ فَقالُوا أنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنا وَقَوْمُهُما لَنا عابِدُونَ ﴾ دوایی فیرعەون و تاقمەکەی ووتیان: ئایا ئێمە چۆن باوەڕئەهێنین بە دوو ئادەمیزادی وێنەی ئێمە وتاقمەکانیان ئێمە ئەپەرستن، ئەوە بۆ فیرعەون داوای خوایەتی ئەکردوکاری زۆر گرانی بەبەنوئیسرائیلی ئەکرد و ئەی چەوساندنەوەو کۆشك و پەرستگای پێ دروست ئەکردن.. لەم سەردەمەی ئێمەیشدا زۆر کەس هەن ئەگەر بۆیان بلوێ داوای خوایەتی ئەکەن و نمونەیان ئاشکران.

﴿ فَكَذَّبُوهُما فَكانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ ﴾ دوایی فیرعەون وتاقمەکەی موساو هارونیان بەدرۆخستەوەو باوەڕیان بەوان نەهێناو دوایی لەناو چون بە ئاوی دەریای سور خنکان.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنا مُوسى الْكِتابَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە بەخشیبومان بە موسا نامەیەکە تەوراتە دوای لەناوبردنی فیرعەون وتاقمەکەی لەبەر ئەوەی تاقمی موسا وهارون ئامۆژگاری وەرگرن بەونامەیە بیکەن بەدەستور یاسا بۆ خۆیان.

﴿ وَجَعَلْنا اُبْنَ مرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنا هُما إلى رَبْوَةٍ ذاتِ قَرارٍ وَمَعِينٍ ﴾وە ئێمە گێڕابومان عیسای کوڕی مەریەم ودایکی عیسا بە کارێکی زۆر سەرسوڕێنەر ونیشانەیەکی یەك خەر بۆ هەمو ئادەمیزاد کە بەڵگەیە لەسەرتوانای خوای مەزن بەبێ ئەوەی ئادەمیزادی دەست بدا لەمەریەم عیسامان پێبەخشی و ئێمە بەخشیمان بەعیساو مەریەم جێگەو گەڕاندمانەوە بۆلای تەپۆلکەیەی بەرزی زەوی وجێگەیە ئادەمیزاد ئارامی تێدا بگری وخاوەنیئاوێکی ئاشکرا بڕوا بەلایاو خاوەنی سەوزایی ومیوەی زۆربێ.

لەئایەتی (١٧٢) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا خوای مەزن فەرمانی دا بەباوەڕداران خورادەمەنی پاك و ڕەوا بخۆن، لەم ئایەتەی دواییدا خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پێغەمبەران خواردەمەنی پاك و بەتام بخۆن و ئەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ

فَاتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾

﴿ يا أيُها الرُسُلُ كُلُوا مِنَ الطَيباتِ وَأعْمَلُوا صالِحاً إني بما تَعْلَمُونَ عَلِيمٌ ﴾ ئەی نێرراوەکــان و پێغەمبەران: ئێوە بخۆن لە هەمو خواردەمەنیەکی پاك و ڕەواو لــە خۆتـانی قەدەغـە مەکـەن و ئێوەکردەوەی چاك بکەن بەڕاستی من بە هەمووشتێ ئەزانم ئێوە ئەیکەن، ئاگام لـەکاری نهێنی و ئاشـکرای ئێـوە هەیـە. ئـایینی ئیسـلام و لــە خواترسـان کـردەوەی ئـەوبێ نـەك نـەخواردنی خواردەمەنی پاك و بەتام، هەرشتێ دەرونی مرۆڤ لای خوشبێ پاك و خاوێنە، بەو مەرجەی لای خوای مەزن قەدەغە نەبێ لە خواردندا زۆر خۆری نەکرێ. پێغەمبەری خوا بــەرگ وخـۆراك و پۆشاکی چاکی کاتی خۆی بەکارهێناون لـە خوری و لۆکەو پارچەی یەمانی، گۆشـتی مریشـك وحوشتری خورادووە، گۆشت و جگەری بەنانەوە خواردووە، هــەنگوین وشـیرینی لاخۆشـبوە، کالـەك وخەیار و خورمای بەکەرەوە وگۆشتی برژاوو تریتـی ڕۆن بەسـەرا کـراوی خـواردوە. ئەبێ ئەوەیش بزانین چاکترین خواردەمەنی لای ئایینی ئیسـلام و پێغەمبـەری خـوای مـەزن ئـەو خواردەمەنییە یە بە ئارەقی ناو چاوان وماندوبون پەیداکرابێ.

﴿ وَإنْ هذِهِ أمَتُكُمْ أمَةً واحِدَةً وَأنا رَبُكُمْ فَأتَقُونِ ﴾ وە بەڕاستی ئایینی هەمو بـاوەڕداران یـەك ئایینە تاقمی ئێوە وموسڵمان وتاقمی پێغەمبەرەکانی پێشویش یەك تاقمن هەموتان بەندەی خـوای مەزنن.

بنچینەی ئایینی هەموتان یەکەو جیاوازی لـەناویانا نیەو ومن پەروەردگاری ئێوەم بـە گشـتی، دوایی ئێوە پێویستە لـە من بترسن و بێ فەرمانی من نەکەن.پێغەمبەران هەمویان لـەسەر یەك ئایین بوون.

﴿ فَتَقَطَعُوا أمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زَبُوراً ﴾ دوایی پەیڕەوانی پێغەمبەرەکان بێ فەرمانی خـوای مـەزنیان کـردو کاروبـاری ئـایینی خۆیانیـان لــە نێـو خۆیانـا پارچـە پارچـە کـردو گـەڕان بـە چــەند

تاقمێکی جیاواز لە یەکتری دوای ئەوەی ئەزانراکە ئایینی ڕاست هەریەك ئایینە. هەریەکە لەوتاقمانە دوای نامەیە کەوتن و باوەڕیان پێ هێناو باوەڕیان بە جگەی ئەو ئایینە نەبو، جولەکەکان باوەڕیان بە تەورات هێنا دوای دەست کاری کردنی و باوەڕیان بە ئینجیل وقورئان نەبو، گاورەکان باوەڕیان بە ئینیجل و تەورات هەبو بڕوایان بە قورئان نەبو، جگە لەوانیش چەند ئایینی تر پەیدابون وەك ئاگر وبت پەرست وگاوگۆ تاڵ پەرست.

﴿ كُلُ حِزْبِ بِما لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ هەموو تاقمێ خوشحاڵن بەشتێ لای خۆیانەو باوەڕیان پێ هێناوە، هەر یەکەیان ئەوەی خۆیان بە ڕاست ئەزانن وجگەی نامەکەی خۆیان بە پوچ ئەزانن.

﴿ فَذَرْهُمْ في غَمْرَتِهِمْ حتى حِينٍ ﴾ دوایی تۆ وازیان لێبهێنە بالەناو نەزانین وگومڕایی خۆیانا سەر گەردانبن هەتا کاتی مردنیان وکاتی جوێ بونەوەی ڕاستی وپوچی، تۆ کوڵ مەدە پەیامی خۆتیان پێ ڕابگەیەنە.

﴿ أَيَحْسَبُونَ إنَما نُمِدُهُمْ بِهِ مِنْ مالٍ وَبَنِينَ ﴾ ئایا ئەو کەسانەی ئەوتۆ ئایینی خۆیانیان گۆڕیوە گومان ئەبەن کە بەڕاستی ئێمە بەوانمان بەخشیوە لەدارایی و لەکوڕ بەردەوام ئەبێ سودیان پێ ئەبەخشێ لەپاشە ڕۆژدا، بەو جۆرەی گومانی ئەوان نیەو لەهەڵەی زۆر گەورەدان، ئەو شتانە بەزوی ئەڕۆن و خۆیان بێ ئەقڵ ئەکەن. ئەگەر وابزانن.

﴿ نُسارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْراتِ بَلْ لا يَشْعُرُونَ ﴾ ئێمە پەلە ئەکەین بۆ ئەوان و بەوانی ئەبەخشین لە جیهاندا ئەو چاکانەو ئەودارایی وکوڕانە لەبەر ئەوەیە ئێمە ڕێزی ئەوان ئەگرین و لەوان ڕازین ئەو گومانەی ئەوان ڕاست نیە.

بەڵکوئەو شتانەئەبنە هۆی سزای بۆ ئەوان پلە بەپلە سەریان لێ تێك ئەداو ئەوان هەستی پێ ناکەن دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەوکەسانەی فەرمو لە گومڕایی نەزانینا ئەژین و گومان ئەبەن کە خوای مەزن پەلە ئەکا بەبەخشینی چاکەی جیهان بۆ ئەوان، باسی باوەڕدارانیش ئەفەرمووێ کە ئەم کارە چاکانە ئەکەن وپەلە ئەکەن لە کردنی هەمو کارە چاکەکانا، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴿٦٠﴾

أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾

١-﴿ إنَ الذيْنَ هُمْ مِنَ خَشيَةِ رَبِهِمْ مُشْفِقُونَ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆن ئەترسن لە سزای پەردوەرگاری خۆیان، خۆیان لە سزا ئەپارێزن، دوای شتێ ناکەون ببێتە هۆی سزادانیان.

٢-﴿ وَالذيْنَ هُمْ بأياتِ رَبِهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕ ئەهێنن بەو شتانەی بەڵگەن لەسەربون و گەورەیی پەروەردکاریان و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکان وبەڕاستی نامەکانی خوای مەزن.

٣-﴿ وَالذيْنَ هُمْ بِرَبِهِمْ لا يُشْرِكُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن هاوبەش بۆ پەروەردگاریخۆیان دانانێن، بە نیازی پاکەوە پەرستن هەربۆ ئەو ئەکەن بەتەنها، ڕو ئەکەنە سەرپەرستنی خوای مەزن هەر لەبەر ڕەزامەندی ئەو.

٤-﴿ وَالذيْنَ يُؤْتُونَ ما آتواوَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةً إلى رَبِهِمْ راجِعُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن ئەیبەخشن بە هەژاران هەندێ لەوشتانەی خوای مەزن بەخشیوە بەوان، مافی خوای مەزن و مافی ئادەمیزاد جێبەجێ ئەکەن بە تەواوی و لەگەڵ ئەوانەیشدا ترسیان هەیە لەوەی خوای مەزن لەوانی وەرنەگرێ ودڵیان ئەترسێ بە ڕاستی ئەوان ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا بۆلای پەروەردگار ی خۆیان کە ئەوەی ئەی بەخشێ جێگەیشایستەی خوی نەگرتبێ.

﴿ أُوْلَئِكَ يُسارِعُونَ فِي الْخَيْراتِ وَهُمْ لَها سابِقُونَ ﴾ ئەوکەسانە هەمویان پەلە ئەکەن بۆ لای هەمو چاکەیەکیجیهانی، کۆشش و ماندوبونیان ئەخەنە کارە وە کە پێشی جگەی خۆیان بکەون لە کردنیئەو چاکانەدا وکاتی خۆیان بە فیرۆ نەدەن.

﴿ لا نُكَلِفُ نَفْساً إلاّ وَسِعْها ﴾ وە ئێمە داوا لە هیچ کەسێ ناکەین بۆکردنی شتێ مەگەر شتێ لە تواناى ئەو کەسەدابێ، هەر کەسێ نەیتوانی بە پێوەنوێژ بکا بە دانیشتنەوە بەهەر جۆرێ ئەتوانێ بیکا،هەر کەسێ نەیتوانی ڕۆژ وبگرێ ئێمە بۆمان ڕەوا کردوەڕۆژو بشکێنێ و گوناهی ناگا.

﴿ وَلَدَيْنا كِتابٌ يَنْطِقُ بِالْحَق وَهُمْ لا يُظْلِمُونَ ﴾ وە لەلای ئێمە نامەیە هەیە هەمو موشتێکی تێدا تۆمار کراوە بەڕاستی گفتوگۆ ئەکا، خوای مەزن پاداشتی کردەوەی ئادەمیزاد ئەداتەوە چاکبێ یا خراپ و ئەوان ستەمیان لێناکرێ بە کەمکردنەوەی پاداشتەکانیان بە زۆر کردنی سزادانیان.

بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾

﴿ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِنْ هذا ﴾ باوەڕداران خاوەنی ئەو ڕەوشتە بەرزانن. بەلام بت پەرستان و هاوبەشدانەرەکان بۆخوای مەزن دڵیان لەناو نەزانین وسەرگەردانی و گومڕایی دان بەرانبەر بەوکردە وچاکانەو ئەو نامە دروستانە کە هەموشتێکی بۆ ئەوان ڕون کردوەتەوە.

﴿ وَلَهُمْ أَعْمالٌ مِنْ دونِ ذلِكَ هُمْ لَها عامِلُونَ ﴾ وە بۆ بێ باوەڕان هەیە زۆر کاری خراپ لە جگەی ئەو ڕەوشتە بەرزو بە نرخانەی باوەڕداران کە ئەوان کارە خراپانە ئەکەن. زۆر بەبێ شەرمانە ئەڵێن: موحەمەد جادوگەرە و شێتە، گاڵتە بەفەرمودەکانی قورئان ئەکەن .

﴿ حَتَى إذا أخَذْنا مُتْرَفِيهِمْ بِالْعَذابِ إذاهُمْ يَجئرون ﴾ هەتا کاتێ ئێمە سەرۆك و ئەو کەسانەی خۆشیان ڕائەبوارد لەبێ باوەڕان ئەیان گرین بە سزایەکی زۆر سەخت و بە برسێتی و بە کوشتن ئەو کاتە ئەوان هاواریان پێ ئەکەوێ و خەفەت ئەخۆن. ئەو سزا سەختەیان کاتێ توشبوو پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نوێژی ئەکرد لە کەعبەدا بێ باوەڕان ویلاشیان فڕێدایە سەر لەشی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، دوایی پێغەمەر فەرموی: ئەی خوای مەزن قورسایی سزای خۆت بخەرە سەر هۆزی (مضر)، ئەی خوای مەزن دانێ لەسەریان سالانێ وەك سالانی یوسف لە گرانی، دوایی خوای مەزن گرانی سالێکی توش کردن لە برسانا پیس و خوێن و ئێسکیان تێکەلاو ئەکرد بە کورگی هوشترو بە ئاگر ئەیان برژان و ئەیان خواردن.

﴿ لا تَجْئَرُوا الْيَوْمَ إنَكُمْ مِنا لا تُنصِرُونَ ﴾ ئەو کاتە بە بێ باوەڕان ئەبێژرا: ئێوە هاوار مەکن و مەپارێنەوە لەم ڕۆژەدا توشی ئێوە بووە ئەوسزایە. بە ڕاستی ئێوە شایستەی ئەوە نین لەلایەن ئێمەوە یارمەتیان بدرێ هاوارو سزای ئێوە سودێ بە ئێوە ناگەیەنن.

﴿ قَدْ كانَتْ آياتي تُتْلى عَلَيْكُمْ عَلَى أعْقابِكُمْ تَنْكِصُونَ ﴾ بەڕاستی ئایەتەکانی قوەرئانی ئێمە ئەخوێنرایەوە بەسەر ئێوەدا دوایی ئێوە بەرەو دوا بە پەلە ئەگەڕانەوە لەکاتی خوێندنی ئایەتی قورئانداو پشتتان تێ ئەکردو گوێتان لێ ئەگرت .

﴿ مُسْتَبْكِرِينَ بِهِ سامِراً تَهْجُرُونَ ﴾ ئێوە قورئانتان بە درۆئەخستەوەو خۆتان بە گەورە دائەناو ئەتان ووت: ئێمە دانیشتووی لای کەعبەین و شانازیتان بە خۆتانەوە ئەکرد، ئێوە شەوانە لە دەرەوەی کەعبەدا کۆئەبوونەوە گفتوگۆی خراپ و بێز لێ کراوەتان ئەکردو تانەتان لە قورئان ئەداو ئەتان ووت: جادوو هۆنراوەیە، جنێوی خراپتان بە پێغەمەر ئەدا زۆر بەبێ شەرمانە.

﴿ أفَلَمْ يَدَبَرُوا الْقَوْلَ أمْ جاءَهُمْ مالَمْ يَأتِ آباءَهُمْ الأولِينَ ﴾ ئایا دوای بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان کە بەلگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمەر، دوایی بزانن پێغەمەر ڕاست ئەکا و قورئان کاری پەك خەرە بۆ هەموو ئادەمیزاد، دوایی ئایا موحەمەد چوە بۆلای بت پەرستان بەشتێ نەچوبێ بۆلای باوپاپیرانی پێشوانی ئەوان. بێگومان پێغەمەران چوبوونە لای باو باپیری ئەوان و بروایان پێ نەهێنان و پشتیان تێ کردن، دوایی ئەوان تووشی ئەو سزایە بوون کە تووشیان بوە، ئایا بێ باوەڕان نەیانزانیوە هاتنە خوارەوەی نامەکان بۆ سەر پێغەمەران دەستوری خوای مەزنە و ناردنی قورئان بۆسەر موحەمەد شتێکی تازە نیە، دوایی بۆ باوەڕی پێ ناکەن؟ ئەوەبوو بت پەرستانی عەرەب ئەیانزانی ئیبراهیم و هودو سالح وشوعەیب پێغەمەربوون. بە تایبەتی ئەو سیانەی دوایی عەرەب بوون .

﴿ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ ﴾ ئایا بت پەرستانی قورەیش لەمەوبەر پێغەمەرەکەی خۆیانیان نەناسیوەو ناوبانگی دەرنەکردبوو بە ڕاست گۆیی و دەست پاکی و ڕەوشتی بەرز، موحەمەد لە ڕەگەزی خۆیانەو لەناو خۆیانا بووە، دوایی بۆ ئەوان باوەڕ بە داواکارێکەی ناهێنن؟ بەڕاستی چاکی ئەناسن. بەڵام لەبەر دڵ پیسی خۆیان باوەڕ بە داواکارێکەی ناهێنن .

﴿ أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جاءَ هُمُ الْحَقُّ ﴾ ئایا ئەڵێن: موحەمەد شێتەو ئێوە هیچ نرخێ بەگفتوگۆکەی مەدەن، کەچی ئەیانزانی لە هەموویان ئاقڵترە، بێگومان بە گوێرەی گومانی ئەوان نیە. بەڵکو موحەمەد چووە بۆلای ئەوان بە ئایینێکی ڕاستەوە کە داوای یەکێتی خوای مەزن و دەستوری خوای مەزن ئەکا .

﴿ وَأَكْثَرَهُمْ لِلْحَقِّ كارِهُونَ ﴾ وەزۆرتر لەو بێ باوەڕانە ڕاستیان پێ ناخۆشە، چونکە بە گوێرەی ئارەزۆی ناپەسەندی ئەوان نیە. کەمێکیان بە وێنەی ئەبو تالیبی مامی پێغەمەر ئەیزانی داواکاری موحەمەد ڕاستە. پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ جگەی لەوەش داوای یەکێتی خوای مەزنی ئەکرد ئەیەویست ژیانی کۆمەڵایەتی دابەزێنێ لەسەر بنچینەی دادپەروەری و یەکسانی نێوان ئادەمیزاد، ستەمکارو ستەم لێ کراو باوی نەمێنێ و ڕێزو گەورەیی بۆ هیچ کەسێ نەبێ بە جگەی لە خواترسان و چاکەکردن .

﴿ وَلَوْ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْواءَ هُمْ لَفَسَدِنِ السَّماواتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ ﴾ وەئەگەر ئەو قورئانە ڕاستەی ئەوتۆ بە موحەمەد دراوە دوای ئارەزۆی ناپەسەندی بێ باوەڕان بکەوتایە، بە جۆرێ بتەکان دەسەڵاتیان هەبوایە. بە ڕاستی ئاسمانەکان و زەوی لەناو ئەچون بەو شتانەوە لە ناویاندابوون و لە پەیڕەوی دیاری کراوی خۆیان دەرئەچوون، چونکە ئەو بتانە ئەگەر خوابوونایە دژایەتی ئەکەوتە ناویانەوە هەریەکەیان بۆ چەسپاندنی دەستەڵاتی خۆیان .

﴿ بَلْ أَتَيْناهُمْ بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَنْ ذِكْرِهِمْ مُعْرِضُونَ ﴾ بەڵکو موحەمەد چوو بۆلای عەرەبەکان بە گشتی و بۆلای قورەیشەکان بە تایبەتی بەو قورئانە نێررابوو بۆلایان بە زمانی خۆیان و بوو بە هۆی ڕێزو دەستەڵاتیان و ناوبردنیان لەناو مێژوودا، دوایی ئەوان لەو قورئانە ڕوویان وەرگێڕاو باوەڕیان پێ نەهێنا، ئەگەر ئەو قورئانە نەبوایە باسیان نەئەکرا بە هیچ جۆرە ڕێزو نرخێ و خاوەنی مێژووی خۆیان نەئەبوون.

﴿ أَمْ تَسْأَلُهُمْ خَرجاً فَخَراجُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَهُوَ خَيْرُ الرازقِينَ ﴾ ئایا بت پەرستان گومان ئەبەن کە تۆ داوای کرێ و پاداشت لەوان بکەی لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خۆت بەوان، دوایی لەبەر

ئەوەی باوەڕ بە تۆ نایەرن، بەڕاستی کرێ پەروەردگاری تۆ لە جیهاندا و پاداشتی ئەو لە پاشە ڕۆژدا زۆر چاکترە لەوەی ئەوان لەبەر فراوانی و بەردەوام بوونی، خوا چاکترین کەسێکە شت ببەخشێ و کەس توانای نیە بە وێنەی ئەو بەخشندە بێ. ئەو ڕستەیە لەوەوە هاتوە ووتیان بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: تۆ واز لەم داوایەی خۆت بهێنە ئەوەندە دارایت ئەدەینێ ببی بە خاوەنی سامان.

وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾

﴿ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلى صِراطٍ مُسْتَقِيمْ ﴾ وە بەڕاستی تۆ بەبێ کرێ بە خۆڕایی بانگی بت پەرستان ئەکەی بۆلای ڕێگەیەکی ڕاست کە ئایینی ئیسلامە، ئەو ئایینەی ئەوتۆیە ئەقڵی تەواو شایەتی ڕاستەو خوارو خێچی تێدا نییە.

﴿ وَإنَ الذيْنَ لا يُؤْمِنُونَ بِالأخِرَةِ لَنا كَبُونَ ﴾ وەبەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بـاوەڕ نـاهێنن بـە ڕۆژی دوای لایانداوە لـە ڕێگەی ڕاست مەیلییان هەیە بـۆلای ڕێگـەی خـوارو خێـچ و بـۆلای چۆلایی بێ سودو بۆلای گومڕایی .

کاتێ پێغەمەر لـەمەکەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دەستی کـرد بـە ئـازاردانی بت پەرستانی مەکە، ئەوە بوو چەند کەسێکی لـە هاوڕێکانی خۆی ئەنارد ڕێگەبگرن لـە کاروانی بت پەرستان، هەندێ جاریش خۆی پێشەوایی ئەکردن لـەو ڕێگە گرتنەدا، فەرمانی دا بە هەموو باوەڕداران پەیوەندی لـەگەڵ بێ باوەڕاندا ببچڕێنن، بەو بۆنەوە بـێ بـاوەڕان تووشـی گرانـی و تەنگانە بوون. بەڵام ئەو بێ باوەڕانە هەر لـەسەر خراپەی خۆیان بەردەوام بوون، ئەگـەر خـوای مەزن ئەو ئازارەیشی لـەسەر لابردنایە ئەوان تەمێ خوار نەئەبون، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَلَو{ رَحِمْناهُمْ وَكَشَفْنا ما بِـهِمْ مِـنْ خَـيرٍ لَلَجُـوافي طُغْيانِـهِمْ يَعْمَـهُونَ ﴾ وەئەگـەر ئێمـە میهرەبانیمان بکردایە لـەگەڵ بێ باوەڕانی قوڕەیشیداو ئێمە ئەو گرانی و ناخۆشیە تووشی ئـەوان بوبو لامان بیردایە لـەسەریان ئەوان هەر لـەسەر گومڕایی خۆیانا ئەبوون و درێژەیان ئەدا بە یاخی بوونی خۆیان و سەرگەردان بوون لـە گومڕایی خۆیانا .

﴿ وَلَقَدْ أخَذناهُمْ بِالْعَذابِ فَما أسْتكانُوا لِرَبِـهِمْ وَمـا يَتَضَرَعُـونَ ﴾ وەبەڕاسـتی ئێمـە سـزای ئەواغان دا بە گرانی لـە جەنگی بەدردا توشی کوشتن و دیل کردن بوون و برسێتی و بێ نرخـی یەخەی پێ گرتن، دوای ئەوانەیش سەریان بۆ پەروەردگاری خۆیان دانەنەواندو پـەنایان بـۆلای خوا نەبرد بە کزۆڵی و بچوکیەوەو لـە ئێمە نەپاڕانەوە .

﴿ حَتَى إذا فَتَحْنا عَلَيْهِمْ باباً ذا عَذابٍ شَدِيدٍ إذا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾ هەتا کاتێ ئێمە دەرگـای سزایەکی زۆر سەختی دۆزەخیان لـەسەر ئەکەینەوە لـە ڕۆژی دواییدا و تووشی ئەو سزایە ئەبن، دوایی ئەو بێ باوەڕانە لـە ناو ئەو سزایەدا بێ ئومێد ئەبن لـە هەموو چاکەیەو سەرگەردان ئەبن و ڕزگاریان نابێ.

﴿ وَهُوَ الذي أنْشَأَ لَكُمْ السَمْعَ وَالأبْصارَ وَالأفئِـدَةَ قَلِيـلاً مـا تَشْـكُرُونَ ﴾ وەخـوا کەسـێکی ئەوتۆیە دروستی کردووە بۆئێـوە گوێچکـەو چاوەکانتـان لـەبـەر ئـەوەی ئێـوە هەسـت بکـەن بەتوانایەکی ئەوتۆی خوای مەزن کە ئادەمیزاد وێنەی ئەو توانایەیان نیەو دروستی کردووە بۆتان دڵ و ئەقڵتان هەتا بەکاریان بهێنن لـە نیشانەکانی خوای مەزندا ئێوە کەمێ سوپاسی خوای مەزن ئەکەن یا هەر سوپاسی ناکەن. دوایی گوێچکە و چاوو دڵتان هیچ سودێکی بە ئێوە نەبەخشی .

﴿ وَهُوَ الـذي ذَرَأَكُـمْ في الأَرْضِ وَإِلَيْـهِ تُحْشَـرُونَ ﴾ وەخـوا کەسـێکی ئەوتۆیـە ئێـوەی بڵاوکردوەتەوە بە ناو زەویدا ومناڵی زۆری لە ئێوە پەیدا کردوەو ئێوە هەربۆلای خوا لە ڕۆژی دواییدا کۆئەکرێنەوە هەر خوای مەزن دادوەرە لەو ڕۆژەدا.

بۆ زانین: خوای مەزن لە ئایەتی (٧٨)ی پێشوودا گوێچکەی پێش خست، چونکە مناڵ هەر لە دایك بووە ئەبیسێ و هیچ نابینێ، مەگەر لە چوارەم ڕۆژی دایکبوونیدا. بـەلاّم بـەکارهێنانی دڵ و ئەقڵ زۆر ماوەی پێ ئەچێ.

﴿ وَهُوَ الذي يُحْيي وَيُميتُ وَلَهُ اَخْتِلافُ الَّيْلِ وَالنَّـهار ﴾ وەخـوا کەسـێکی ئەوتۆیـە هـەموو گیاندارانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بونەوە، گیانی کردووە بە بـەریاناو لـە دوای کۆتـایی هـاتنی تەمەنیان ئەیان مرێنێ، دوای مردنیان زیندو ئەکاتەوە لە پاشەڕۆژدا بۆ پرسیارو وەڵام و هەر بـۆ خوای مەزنە گۆڕاندنـی شـەووڕۆژ بەکـەم کردنـەوەی ماوەیـان و بـە زۆرکردنیـان بـە هـۆی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا .

﴿ أفَلا تَعْقِلُونَ ﴾ ئایا دوایی بۆ ئێوە بیرناکەنەوە لە گەورەیی خوای مەزن. بە ڕاسـتی ئێـوە لەناو دەریای بەخشندەی خوای مەزندان، کەسێ ئێوەی لە نـەبوون دروسـت کردبـێ ئاسـانتر ئەتوانێ دوای مردن زیندوتان بکاتەوە، کەسێ بەو جۆرەبێ چۆن دروستە هاوبەشی بۆ دابنرێ و زۆر نەگونجاوە .

بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ

سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِالْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٩٠﴾

﴿ بَلْ قالُوا مِثْلَ ما قالَ الأوَلُونَ ﴾ بەڵكو بێ باوەڕانی مەكە ئەو شتەی باسكران نەیان ئەزانی، وێنەی شتێكیان ئەووت: پێشوەكان ئەیان ووت لەمەوبەر كە باوەڕیان بە زیندوبونەوە نەبوو، لاسایی ئەوانیان ئەكردەوەو زیندوبونەوەیان بە درۆ ئەزانی .

﴿ قالُوا إذا مِتْناوَكُنا تُراباً وَعِظاماً أ إنا لَمَبْعُثُونَ ﴾ ئەیان ووت: ئایا كاتێ كە ئێمە مردین و بوین بە خۆڵ و ئێسكی ڕزاو ئێمە زیندو ئەبینەوە؟ شتێ وا چۆن ئەبێ و زۆر دوورە؟ ئەوەیان لە بیرچۆتەوە لەمەو بەریش خاكبوون و خوای مەزن كردونی بەم ئادەمیزادەی ئێستا .

﴿ لَقَدْ وَعِدْنا نَحْنُ وَآباؤُنا هذا مِنْ قَبْلُ إنْ هذا إلاّ أساطِيرُ الأوَلِينَ ﴾ بەڕاستی ئێمەو باپیرانمان بەڵێنمان پێدراوە بەو زیندوبونەوە لە پێش تۆو، وەك تۆ بە ئێمەی ئەڵێی بیستومانە لە باو باپیرمانەوە كە پێغەمەرانی ئەوانیش بەوانیان ووتوە: زیندوبوونەوە هەیە، دوایی ئێمە هیچ شوێنەوارێكی زیندوبونەوەمان نەبینیوە، ئەو زیندوبونەوەیە قورئانە ئەیلێ. ڕاست نیە مەگەر درۆی پێشوانەو تۆماریان كردووە لای خۆیان و ئێمە ئەی خوێنینەوە .

خوای مەزن بە جۆرێكی شیرین گفتوگۆ ئەفەرموێ لەگەڵ بت پەرستان لەبارەی زیندوبونەوە بە جۆرێكی زانیاری ئەیخاتە بەردەمیان هەتا بیانویان نەمێنێ و فەرمان ئەدا بە پێغەمەر بەم جۆرەی خوارەوە:

﴿ قُلْ لِمَنِ الأرْضُ وَمَنْ فِيها إنْ كُنْتُمْ تَعْلَمونَ ﴾ تۆ بلێ بەو بت پەرستانە زیندوبوونەوە بە دوور ئەزانن: بۆ چ كەسێكە زەوی و كەسێ لەنێو زەوی دان و چ كەسێ دروستی كردون ئەگەر ئێوە خاوەنی زانست و زانیارین و ئەزانن چ كەسێ ئەوانەی دروست كردووە؟

﴿ سَيَقُولُونَ لِلهِ قُلْ أفَلا تَذَكَرُونَ ﴾ كوتوپڕ ئەو بت پەرستانە ئەڵێن لە وەڵامدا: هەموو بونەوەران و دروست كردنیان بە زەوی و كەسێ لە ڕوی زەویدایە بۆ ئەوخوا مەزنەیە دروستی

کردوون، ئایا دوایی ئێوە بۆ ئامۆژگاری وەرناگرن. کە خۆتان ئـەزانن خـوا دروسـتی کـردون. کەواتە ئێوە ئەوەیش بزانن کەسێ لـە نەبونەوە ئـەو بونەوەرانـە دروسـت بکـا خـاوەنی توانایـە مردوانیش زیندو بکاتەوە، بگرە ئاسان تریشە لای خوای مەزن، شیاوی ئەوەیە ئێوە هاوبەشی بۆ دانێن و باوەڕی ڕاستی بهێنن، بۆ جارێ تر نۆ پرسیاریان لێ بکە.

﴿ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّماواتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظيمِ ﴾ تۆ بڵێ بە بت پەرستان: چ کەسێکە پەروەردگاری ئەو حەوت ئەستێرانەیە ئەسوڕێنەوە هەریەکەیان لـە ئاسمانی خۆیان و چ کەسـێکە خاوەنی دەستەڵاتی گەورە بەسەر هەموو بونەوەرانداو خاوەنی هەموویانبێ .

﴿ سَيَقُولُونَ للهِ قُلْ أفَلاَ تَتَقُونَ ﴾ ئەو بت پەرستانە بەبێ دامان ئەڵێن: پـەروەردگاری ئەوانـە هەموو هەر خوای مەزنە بە تەنها، تۆ بڵێ بەوان: ئایا دوایی بۆ لـە سزای خوای مەزن ناترسـن و هاوبەشی بۆ دانانێن؟.

﴿ قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتَ كُلِ شَيْءٍ وَهُوَ يُجيرُ وَلا يُجارُ عَلَيْهِ إنْ كُمْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ تـۆ بڵـی بـە بت پەرستان چ کەسێکەی خاوەنێتی هەموو شتێ لەم بونەوەرە فراوانەو، بەدەستی توانای ئەوبێ و بگاتە فریای هەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ و بیپارێزێ لـە خراپە و کەس نەتوانێ تووشی خراپـەی بکاو هیچ کەسێ نەتوانێ هیچ کەسێ ڕزگار بکا لـە توانای خوای مـەزن ئەگـەر بیـەوێ زیـانی توش بکا، ئەگەر ئێوە خاوەنی زانیاری و زانستن.

﴿ سَيَقُولُونَ للهِ قُلْ فَأنى تُسْحَرُونَ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە بەبێ چەن و چـوون ئـەڵێن: پاشـایەتی خاوەنی هەموو شتێ هەر بـۆ خـوای مەزنـە بـە تەنـها، تـۆ بڵـێ بـەوان: ئایـا دوایـی ئێـوە بـۆ خەڵەتێنراون و فریودراون و دوای شەیتان کەوتوون و ئەیشـزانن خـاوەنی ئەوانـە هـەر خـوای مەزنەو بڕواتان بە زیندوبونەوە نیە .

﴿ بَل أتَيْناهُمْ بِالْحَقِ وَإنَهُمْ لَكاذِبُونَ ﴾ بەڵکو ئێمە چووین بۆلای ئەو بت پەرستانە بە چـەند بەڵگەی ئاشکراو تەواو لـەسەر ڕاستی زیندوبونەوەو بێ هاوبەشی خوای مەزنـەوە، جبرەئیلمـان نارد بۆلای پێغەمەرەکەیان بە قورئانەوە کە خوا لـە کەس نەبووەو منداڵیشی نیەو بە ڕاسـتی ئـەو بت پەرستانە درۆئەکەن کە ئەڵێن: زیندوبونەوە نیەو خوای مەزن منداڵی هەیەو بێ بەڵگەن .

مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ

وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا

بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ ما أتَخَذَ اللهُ مِنْ وَلَدٍ وَماكانَ مَعَهُ مِنْ إلَهٍ ﴾ خوای مەزن هیچ منالێکی بۆخۆی وەرنەگرتووە بە وێنەی ئەو گومانەی ئەوان ئەیبەن و خوای مەزن دورە لەوەی منالی هەبێ و لەگەڵ خوای مەزندا هیچ خوایە تر نیە هاوبەشی بێ .

﴿ إذا لذهب كلّ إله بما خَلَق ﴾ ئەو کاتە ئەگەر چەند خوایە هەبێ بە گوێرەی گومانی ئێوەی بت پەرست هەریەکە لەو دوو خوایانە تایبەت مەند ئەبن بە بەشێ لەم جیهانە، هەریەکەیان سنورێکی تایبەتی و پەیڕەوێکی تایبەتیان ئەبێ بۆ ئەو بەشە جیهانەی خۆیان .

﴿ وَلَعَلاَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ ﴾ وە دووبارە ئەگەر چەند خوایێ هەبێ هەریەکەیان داوای ئەوە ئەکا بالادەست تربێ لەوەکەی تریان و بە دەسەلات تربێ و ئەوتریان ژێر دەستەی ئەوبێ، لەئەنجامدا پەلاماری یەکتری ئەدەن و ئەبێ بە جەنگیان هەتا خۆی سەرکەوێ و خواکەی تریان

نەمێنێ بە و ێنەی پاشاو سەرۆکەکانی جیهان، بەو بۆنــەوە کـاول کـاری خـراپ ڕوئـەداو ئـەم بونەوەرانە لـەناو ئەچن.

﴿ سُبْحانَ اللهِ عَما يَصِفُونَ ﴾ پاك و دوری بۆ خوای مەزن لـە شتێ ئەو بت پەرستانە باســی ئەکەن کە خوای مەزن منالْ و هاوبەشی هەیە لە خوایەتیدا.

﴿ عالِمُ الْغَيبِ وَالشَهادَةِ فَتَعالى عَمّا يُشْرِكُونَ ﴾ خوایە ئەزانێ بە شـتێ نـابینرێن و لــە ئێمـە وونن وئەزانێ بەشتێ ئێمە ئەی بینین، دوایی خوا بالاْترو گەورەترو دورترە لـە شتێ بت پەرستان ئەیکەن بە هاوبەش بۆ ئەو.

﴿ قُلْ رَبِ إما تُرِيني مايُوعَدونَ رب فَلا تَجْعَلْني في الْقَــوْمِ الظّـالِمينَ ﴾ تـۆ بەندایـەتی خـۆت دەربخە بلێ: ئەی پەروەردگاری من: ئەگەر ویستوتە سزای ئەو تاقمــە بـێ باوەڕانـەی لای مـن بدەی لـەبەرئەوەی بەردەوام ئەبن لـەسەر بێ بـاوەڕی، پێویـستبو شـتێ بـەلێنی پـێ درابـوو لــە سزادانیان نیشانی منی بدەی، ئەی پەروەردگاری من: دوایی تۆ من مەگێڕە بە هـاوڕێی ئـەوان کاتێ ئەو سزایە دێتە خوار بۆیان و منیش تووشی سزای ئەو تاقمـە سـتەمکارانە بکـەی. خـوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەر بەو پاڕانەوەیە هەرچەندە خوای مەزن سـزای پێغەمـەر نـادا. بـەلاْم ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو سزایە زۆر سەخت و نالـەبارە .

﴿ وَإنا عَلَى أنْ نُرِيكَ ما نِعَدُهُمْ لَقادِرُونَ ﴾ وەبەڕاستی توانامان هەیــە لـەسـەر ئـەوەی ئێمـە نیشانی تۆی بدەین شتێ ئێمە بەلێنمان داوە بیکەن بــە سـتەمکاران لـە سـزادانیان لـەبەرئـەوەی قوڕەیشیەکان باوەڕت پێ ناهێنن و بە درۆت ئەخەنــەوە. بـەلاْم ئـەو سـزایە دوائـەخرێ لـەبـەر سودی ئیسلام. کەواتە تۆ خەفەت مەخۆ.

﴿ أدْفَعْ بالتي هِيَ أحْسَنُ السَيِّئَةَ نَحْنُ أعْلَمُ بما يَصِفُونَ ﴾ تۆ بەرگری بکــە لــە خراپـەی بـێ باوەڕان بەبەرگرییەکی ئەوتۆ چاك و شیرینبێ لێ بوردن و ئارام گرتن بۆتــۆ چاکـترین ڕەوشـتە ئێمە زاناترین بە شتێ ئەوان باسی ئەکەن .

بۆ زانین: بەرگری لـەخۆکردن ئەگۆڕێ بە گوێرەی کات و شوێن: هەندێ جار بــەکارهێنانی هێز بەرامبەر ستەمکاران چاکترە ئەگەر چـــەك بەکاربـهێنن و سـتەم لێ کراویـش بتوانـێ چـەك بەکاربهێنێ و ئەگەر بێ ستەمی زۆرتر بکات، هەندێ جـاریش بـەرگری بـە لێ بـوردن و ئـارام گرتن و چاوپۆشی چاکترە بەرانبەر بە ستەمکار ئەگەر ئومێدی پەشیمان بوونەوەی لێ بکـرێ یـا ستەم لێ کراوان خاوەن چەك و هێزنەبن، بە وێنەی چــاو پۆشـی کردنـی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ لــە مەکە، هەر لـەبەر ئەوەیشبوو کۆچی کرد بۆ مەدینە، دوایی کە هێزی پـەیداکرد چـەکی بـەکار

هێنا بەرانبەر بەستەمکاران، ئێمە زاناترین بەشتێ بت پەرستان باسی ئەکـەن و ئەیدەنـە پـاڵ تـۆ بەدرۆ بە بوختان ئەڵێن: تۆ جادوگەری وشێتی یا ئەیدەنە پاڵ ئێمە و ئەڵێن: چەند خوایە هەن و هاوبەشی خوان وەك بتەکانیان.

﴿ وَقُلْ رَبِّ أعُوذُ بِكَ مِنْ هَمراتِ الشّياطِينِ ﴾ وەتۆ بڵێ: ئەی پەروەردگاری مـن: مـن پـەنا ئەگرم بە یاریدەی تۆڵە دوودڵی پەیدا کردنی شەیتان کە ئادەمیزاد فریو ئەداو پاڵی پێوە ئەنێ بێ فەرمانی تۆ بکەن. هەرچەندە پێغەمەران دورن لەوەی شەیتان فریویان بـدا. بـەڵام لەبەرئەوەیـە ئادەمیزاد هەرچەندە پیاو چاك و خوا پەرستیشبن پێویستە زۆرتر لە خوای مەزن بپارێنەوە .

﴿ وَأعُوذُ بِكَ رَبِّ أنْ يَحْضُرُونِ ﴾ وەمن پەنا ئەگرم بە تۆ ئەی پـەروەردگاری مـن: لـەوەی کە ئەو شەیتانانە ئامادەی لای من بن لە کـاتی پەرسـتنی تـۆداو بـەم لاولامـدا بێـن و بـڕۆن و لەکاتی نوێژکردنم و قورئان خوێندندا سەرم لێ تێك بدەن و ئاگـام لـە خـۆم نـەمێنێ، مـن وەك ئەوبێ باوەڕانە بم شەیتان کاریان تێ بکا. ئاشکرایە شەیتان دەسـەڵاتی بەسـەر پێغەمـەراندا نیـە. بەڵام پەنا گرتن و پاڕانەوەو نزای پێغەمەران سزا ئەگێڕنەوە. بێ بـاوەڕان بـەردەوامن لەسـەربێ باوەڕی بەدرۆخستنەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی .

﴿ حَتى إذا جاءَ أحَدَهُمْ الْمَوْتُ قـالَ رَبِّ أرْجِعُـونِ ﴾ هـەتا کـاتی کۆتـایی تەمـەنیان نزیـك ئەبێتەوە لـەیەکێ لـەو بێ باوەڕانە کۆتایی تەمەنیان، هەست ئەکا بە نیشانەکانی مـردن، جێگـەی خۆیئەبینێ لە دۆزەخدا، ڕاست وخراپی بۆ دەرئەکەوێ، ئەو کاتە ئاوات ئەخوازێ کە تەمـەنی درێژ ببێ لە جیهاندا وپەشیمان– ئەبێتەوە لە کردنی کارە خراپەکانی لەکاتی ژیانی جیهاندا، ئەو کەسە ئەیووت: ئەی پەرورەدگاری من: تۆ من بێگێڕەوە بۆلای جیـهان، گفتوگۆیـەکی ڕوتـە و سودی بۆ ئەو نابێ.

﴿ لَعَلَى أعْمَلُ صالِحاً فِيما تَرَكْتُ ﴾ لەبەر ئەوەیکاری چاك بـکەم ئـەو شـتەی لـە کیسـی خۆمم داوە بەسەری بیگرمەوە،، پەرستنی تۆ بەجێبهێنم، لـەووڵامدا بـەو کەسـە ئـەبێژرێ تـۆ ناگەڕێیتەوە بۆ لایجیهان.

﴿ كُلاّ إنَها كَلِمَة هُوَ قائِلُها ﴾ تۆ ناگەڕێیتەوە، داوای گەڕانەوە بۆ لای جیهان ووشـەیە کـە ئەو کەسە ئەیڵێ، لەبەر ئازاری زۆریەتی سودێ بەو نابەخشـێ، جـارێ تـر گەڕانـەوە بـۆ لای جیهان نابێ.

﴿ وَمِنْ وَرائِهِمْ بَرْزَخٌ إلى يَـوْمِ يُبْعَثُـونَ ﴾ لەبـەردەم بـێ باوەڕانـەوە پەردەیـە هەیـە نایـەڵێ بگەڕێنەوە وە بۆ لای جیهان، ئەوپەردەیە بەرەوامـە هـەتا ڕۆژی زینـدو ئەکرێنـەوە، ئـەو کاتـە پەردەکە لا ئەبرێ، ژیانی تر دەست پێ ئەکا، نۆرەی پرسیارو ووڵام و پاداشت وەرگرتنە.

فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿١١١﴾

﴿ فَاذا نُفخ في الْصُور فَلا أنْساب بَيْنَهُم يَوْمَئِذٍ وَلا يَتَسائلونَ ﴾ دوایی کاتێ فۆکریا بە سوردا و رۆژی دوایی دەستی پێ کـردو ئـادەمیزاد هـەمویان زیندوکرانـەوە دوای ئـەوە خزمایـەتی و

بنەماڵە نامێنیّ، خۆ هەڵکێشانبە باوك وباپیرە وە باوی نامێنیّ، دۆستایەتی وگەورە و بچوکی هەڵئەگیرێ لەو ڕۆژەدا، ووشەی سور هێمایە لە زیندوبونەوە، خوای مەزن وێنەیان بۆ ئەهێنێتەوە بەسور یانێ بونەوەران، زیندوئەکرێنەوە، لە گۆرەکانیان دێنە دەرێ و ڕائەوەستن، ئامادەبن بۆ پرسیارو وەڵامی کردەوەکانیان، بە وێنەی سەرباز هەر بەفوکردن بە کەڕەنادا خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ چونی لای گۆڕەپانی مەشق کردن، ئەو کەسانە پرسیار لەیەکتری ناکەن هەریەکەیان خەریکی خۆیانن وگیرۆدەی دەردی خۆیانن.

﴿ فَمَنْ ثَقُلَتْ موازِينُهُ فَأُولئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُون ﴾ دوایی هەرکەسێ کردەوەکانی کێشراو و چاکەکانی قورستر بو لە خراپەکانی دوایی ئەو کەسانە ڕزگاریان ئەبێ سەرئەکەون بەپلەی بەرزو ئەچنە بەهەشت و بەرێزن لای خوای مەزن.

﴿ وَمَنْ خَفَتْ مَوازِينُهُ فأُولئِكَ الذيْنَ خَسِرُوا وَأَنْفُسَهُمْ في جَهَنَمَ خالِدونَ ﴾ وەهەر کەسێ خراپەکانی قورستر بێ لە چاکەکانی، دوایی ئەوانە کەسانێکی ئەوتۆن زیانیان لە خۆیان داو، بەردەوامن لە نێو دۆزەخدا.

﴿ تَلْفَحُ وَجُوهَهُمُ النّارُ وَهُمْ فِيها كالِحُونَ ﴾ ئاگری دۆزەخ ڕومەتیان ئەسوتێنێ و ئەو کەسانە ڕویان گرژە لەناو ئاگری دۆزەخدا، لێوەکانیان قرچ هەڵگەڕاوەکانە دەرکەوتووە، دوایی خوای مەزن بەبیرمان ئەخاتەوە لەبەر ئەوەی شایانی سزان گوێیان لەفەرمانەکانی خوای مەزن نەگرتووە.

﴿ أَلَمْ تَكُنْ آياتي تُتْلى عَلَيْكُمْ فَكُنْتُمْ بِها تُكَذِبُونَ ﴾ ئایا ئایەتەکانی قورئانی ناخوێنرێتەوە بەسەر ئێوەی بت پەرستا، ڕێگەی ڕاستیان پیشان ئەدان، دوایی ئێوە ئەو ئایەتانە بەدرۆ ئەخەنەوە باوەریان پێ ناهێنن، ڕویان لێ وەرئەگێرن

﴿ قالُوا رَبَنا غَلَبَتْ عَلَيْنا شَقْوَتنا وَكُنا قَوْماً ضالِينَ ﴾ بێ باوەڕان لە وەڵامی فەرموودەی خوای مەزندا ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: بەدبەختی ئێمەو خراپەی ئێمە زاڵ بوە بەسەر ئێمەدا ئێمە تاقمێ بووین لە ڕێگەی ڕاست لاماندا وە ڕێگەی ڕاستمان ون کردوە، کاتێ پەشیمان بونەوە دەر ئەخەن دەرگای پەشیمان بونەوە دائەخرێ، کاتێ چاك و خراب ڕاستمان ون کردوە، کاتێ پەشیمان بونەوەو دەرئەخەن دەرگای پەشیمان بونەوە دائەخرێ، کاتێ چاك و خراپ لەیەك جوێ ئەبنەوە ئەڵێن:

﴿ رَبَنا أَخْرِجْنا مِنْها فَإنْ عُدْنا فأنا ظالِمونَ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ ئێمە لە ئاگری دۆزەخ دەربهێنە، بمان گێڕەوە بۆ لای جیهان هەتا کاریچاك بكەن و بەسەریان بگرینەوە، دوایی ئەو كاتە ئەگەر ڕوومان كردەوە بۆلای بێ باوەڕی و بێ فەرمانی خوای مەزن، دوایی بەڕاستی ئەو تاقمەین ستەمان لە خۆمان كردوەو شایستەی سزاین وبیانومان نامێنێ.

﴿ قالَ أخسَؤا فیها وَلا تُكَلِمُونِ ﴾ خوای مەزنی بەدەستەلات لەسەر زمانی جبرەئیلەوە ئەفەرموێ:ئێوەی تاوانبار بكەون لەناو دۆزەخدا بە وێنەیسەگ و گفتوگۆ لەگەڵ من مەكەن بۆ لابردنیسزا لەسەرتان، ئەم كاتەكاتی پرسیار ووەرگرتنی پاداشتە، لەجیهاندا پێتان ڕاگەیاندراوە ئێوە توشی ئەم ڕۆژە ئەبن، كاتی كردنیچاكە بەسەرچو.

دوای ئەوەیخوای مەزن باسی تاوانبارانی فەرموو كە گاڵتەیان بە باوەڕداران ئەكرد.باسی پیاو چاكانمان بۆ ئەكاو بۆمانی ڕون ئەكاتەوە، ئەفەرموێ.

﴿ إنَهُ كانَ فَریقٌ مِنْ عِبادِی یَقُولُونَ رَبَنا آمَنا فأغْفِرْ لَنا وأرْحَمْنا وَأنْتَ خَیْرُ الرّاحِمِینَ ﴾ بەڕاستی تاقمێ لەبەندەكانی من هەن پیاوچاكن ئەڵێن. ئەی پەروەردگاری ئێمە باوەڕمان هێنابو بە تۆو بە ئایینی تۆ، دوایی تۆ لە ئێمە خۆشببەو ئێمە ببەخشە بەهۆی میهرەبانی خۆتەوە تۆ چاكترینی هەمو میهرەبانانی لەهەموان بەرزەیی تری.

﴿ فأتَخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِیاً حَتی أنْسَوْكُمْ ذِكْری وَكُنْتُمْ مِنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴾ دوایی ئێوەی بێ باوەڕگاڵتەتان ئەكرد بەو بەندانەی من، بەخراپترین شت لە گەڵیان هەڵئەسان هەتا ئێوە وازتان لە قورئانی ئێمە هێناو ڕۆژی دوایتان لەبیر چوەبوە كالتەتان بەوان ئەكرد بەوان پێ ئەكەنین، دوایی ئێوە بەبونەی ئەو كارانتانەوەسزای ئێمە بچێژن.

﴿ إنِي جَزَیْتُهُمْ الْیَوْمَ بِما صَبَرُوا أنَهُمْ هُمْ الْفائِزونَ ﴾ بەڕاستی من پاداشتی ئەو بەندانەی خۆمم دایەوە بەبەهەشت بەهۆی باوەڕهێنان و ئارام گرتنیان لەسەر ئازاری بێ باوەڕان كەبەراستی ئێوە سەرئەكەون وئەچنە بەهەشت.

قَـٰلَ

كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ

يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَـٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ

كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

﴿ قالَ كَمْ لَبِثْتُمْ في الأرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴾ خوای مەزن لەسەر زمانی فریشتەکانی سزادانەوە ئەفەرموی: چەند ماوەیە بە ئێوەی بێ باوەڕکە بڕواتان بەزیندووبونەوە نەبو بە ژمارەی ساڵ چەندە لەزەویدا ژیاون لە جیهانداکە ئەتانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای وکاری چاك بکەن. ئەو ڕۆژە ئەوەندە بە سامە سەرگەردان بوون.

﴿ قالُوا يَوْماً أوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْألِ الْعابِدينَ ﴾ ئەڵێن: ماوەیەکی کەم لەزەویدا ژیاوین، ڕۆژێك بوە یا هەندی لەڕۆژ دوایی، تۆ بپرسە لەو فریشتانە تەمەنی ئێمە ئەژمێرن وکردەوەکانی ئێمە تۆمار ئەکەن، ئەو کەسانە ئەزانن ئێمە چەندە لەزەویدا ژیاوین و چ شتێکمان کردووە لە جیهاندا، ئێمە ئاگامان لە هیچ شتێ نیە.

﴿ قالَ إنْ لَبِثْتُمْ إلاّ قَليلاً ﴾ فریشتەیە بەدەستوری خوا ئەڵێن: ئێوە لە زەویدا نەژیاون مەگەرماوەیەکی زۆرکەم، وەك خۆتان ئەیلێین، ئەو ماوەیە هەر هەرچەندە زۆر بێ هەر کۆتایی پێ دێ.

﴿ لَوْ إنَكُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەگەر ئێوە خاوەنی زانست و بیر کردنەوە بونایە ئەتانزانی ڕۆژانی جیهان کورتن ومانەوە لە زەویدا زۆر کەمە بەرانبەر بە درێژ بوونەوەتان لە دۆزەخدا، ئەبوایە تۆێشوتان هەڵگرتایە بۆ ئەم ڕۆژەتان.

﴿ أفَحَسِبْتُمْ أنما خَلَقْناكُمْ عَبَثاً وَأنَكُمْ إلَيْنا لا تُرْجَعُونَ ﴾ ئایا ئێوەی‌بێ باوەڕ دوایی گومانتان بردوە کە ئێمە بە ڕاستی ئێوەمان بەبێ سوود دروست کردووە، واز لە ئێوە ئەهێنین ولێ پرسینەوەتان نیە و بە گومانی ئێوە، ئێوە بە ڕاستی ناگەڕێنەوە بۆلای ئێمە بۆ پرسیارو وەڵام و پاداشت وسزا.

﴿ فَتَعالَى اللهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ﴾ دوایی خوایێ کە پاشای هەمو بونەوەرانە هەر ئەوە بەراستی شایستەی پاشایەتیە، دورەو بالآیە پاکە لەوەی بونەوەران بەبێ سوود دروست بکـا،ئەو شتانە شایانی خوای مەزن نیە، هەمو شتێ لەوەهاتوە بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە، کەسێ بەو جۆرە بێ چۆن واز لەبونەوەران ئەهێنێ بەبێ پرسیارو پاداشت وتۆڵە.

﴿ لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴾ هیچ خوایێ نیە شایانی پەرستنبێ مەگەر خوایە پەروەردگاری هەمو بونەوەرانە، بێ هاوبەشەلە دروست کردنیاناو لـەڕێوە بردنیانـا، خوایـەکی ئەوتۆ بەهەموو بونـەوەرانی سـەرەوە و خـوارەوە ئـەزانێ، هـەر لـەوەوە فـەرو پیت و چاکـە دەرئەچێ، خوایە بەو جۆرە بێ چۆن شتی بێ سود دروست ئەکا؟

﴿ وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللهِ إِلهاً أخَرَ لا بُرْهانَ لَهُ ﴾ وە هەرکەسێ خوایە تر بپەرستێ لەگـەڵ خـوای مەزندا، ئەوکەسە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوەنیە کە ئەو خوایێ جگەی خوای مـەزنبێ شـایانی پەرستنبێ، ئیتر چۆن ئەیکا بە هاوبەش بۆ خوای مەزن بەسـە بـۆ توانـای خـوای مـەزن پـەیرەو وپرۆگرامی بونەوەران تێك نەچوە وتێکیش ناچێ.

﴿ فَإنَّما حِسابَهُ عِنْدَ رَبِهِ إنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكافِرُونَ ﴾ دوایی بەراستی پرسیارکردن لـەو کەسـەی لەگەڵ خوای مەزندا خوایە تر بپەرستێ لای پەروەردگاری خۆیەتی ، سزادان بەشتێ شایسـتەی ئەوبێ، جێگەی گەڕانەوەی ئاگری دۆزەخە.بەراستی بێ باوەران بی بەشن لـە چاکـەی خـوای مەزن و رزگاریان نابێ لە ئاگری دۆزەخ.

﴿ وَقُلْ رَبِ أغْفِرُوا وَأرْحَمْ وَأنْتَ خَيْرَ الراحِمِينَ ﴾ وە تۆ بڵـێ: ئـەی پـەروەردگار مـن: تـۆ خۆشببە لە بەندەکانی خۆت و میهرەبانی وچاکەیان لەگـەڵ بفـەرموو تـۆ چاکـترین کەسـێکی خاوەنی میهرەبانی و بەزیی بیت، میهرەبانی و چاکەی تۆ هەمو موشتێکی گرتوەتەوە.

**خوای خاوەن بەزەیی من لە چاکەی تۆ بێ ئومێد نیم**

**یاریدەی خۆم و خێزانم بدە**

**لەسەر بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خۆت چاپ کردنی ئەم تەفسیرە**

# ﴿ سـورەتـی نـور ﴾

لـە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٦٤) ئایەتن.. خوای مەزن لـەم سـورەتەداو لـە سورەتەکانی تردا چەند یاساو دەستورێکی داناوە بۆ ئـادەمیزادی دیـاری کـردووە، پێویسـتە هەموو ئادەمیزادێکی ژیرو تەمەن گەورە کاریان پێ بکەن، ئەو یاسـایانە دانـراون بـۆ دروسـت کردنی کۆمەڵێکی ماف پەروەر لـەسەر بنچینەی سـوودی هـەمویان و مرۆڤایـەتی ئـەپارێزن لـە خراپەو گومڕایی، بۆیە ئەم سورەتە ناوبراوە بە سورەتی نورو ڕوناکی .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾

﴿ سُورَةٌ أَنْزَلْناها وَفَرَضْناها وَأَنْزَلْنا فِيها آياتٍ بَيناتٍ لَعَلَكُمْ تَذَكَرُونَ ﴾ ئەمـە سـورەتێکە لـە سورەتەکانی قورئـان ئێمـە بـەهۆی جبرەئیلـەوە ناردومانەتـە خـوارەوە وە بۆسـەر موحەمـەدو پێویستمان کردووە لەناو ئەم سورەتەدا چەند فەرمان و یاسایەکی ڕەوا کە پێویستە کاریـان پـێ بکرێ و، ئێمە ناردومانەتە خوارەوە چەند ئایەتێکی ئاشکرا لە بـۆ دیـاری کردنـی هـەندێ لـە سنورو یاسای ئێمە، بۆ ئەوەی ئێوە بیربکەنەوە خۆتان بپارێزن لـە کـردەوە قەدەغـەکراوەکان.. ووشەی (سورة) بە مانای دیواری بەرزو مەحکەمی کۆشك و شتی ترە .

﴿ الزانِيَةُ وَالزاني فَاجْلِدُوا كُلَ واحِدٍ مِنْهُما مِأةَ جَلْدَةٍ ﴾ ژنێ داوێن پیسی بکاو پیاوێ داوێـن پیسی بکا، دوایی ئێوەی کاربەدەست و پێشەوایی موسڵمانان هەریەکە لـەوان سـەد داریـان لێ بدەن و دارەکان مام ناوەندی بن نە ڕەقبن و نە نەرمبن، لە ڕومە تو جێگەیـەکیان مـەدەن سـەر بشکێنێ بۆ لەناوچونیان، چاك وایە ئەو دارانە لە پشتیان بدرێ و گرێی دارنەبن لەشیان برینداربێ. بەو مەرجەی ژنەکە شوی نەکردبێ و پیاوەکەیش ژنـی نـەهێنابێ و چوبنـە لای یـەکتری، سەربەست و ئاقڵ و باڵغ بن. بەڵام ئەگەر مێردی کردبێ ژنی هێنابێ بەردەباران ئەکرێن، ئەگەر بەندە بن پەنچا داریان لێ ئەدرێ... لەو ئایەتەدا ژن پێش خراوە، چونکە داوێن پیسـی بـەزۆری بەهۆی خۆ پیشاندانی ژنەوە پەیدا ئەبێ، بە خۆشل کردن بۆ پیاوان و ڕانواندن و درخستنی خۆی بۆ پیاوان .

بۆ زانین: زینا بریتیيە لە چونە خوارەوەی شەرمگەی پیاو بەناو شەرمگەی ژندا بـە شـایەتی دانی چوار پیاو یا بە هۆی گفتوگۆی خۆیانەوە، ئەو ژنە قەدەغەبێ لەو پیاوە چوەتەلای، گومانی ڕەوایی چونەلای ئەو ژنە نەبرێ و ئارەزۆی لێ بکرێ، لە پێشەوەی بێ یـا لـە پاشـەوە ژنبـێ و پیاوبێ، ئاگایان لە خۆیان بێ و زۆریان لێ نەکرێ و سەرخۆش نەبن. بەلای هەموو زانایانەوە ئەو کارە بێز لێ کراوە قەدەغەیە. ژنێ بەبێ شایەت یا بەبێ باوك و سەرداری تر مارە کرابـێ یـا بـۆ ماوەیە مارە بکرێ داریان لێ نادرێ، چوونە لای مردوو بابەر لە مردنی قەدەغـەبێ نابێتـە هـۆی دار لێدان، چونکە بە گوێرەی سروشت بێزی لێ ئەکرێتەوە، وەك خواردنی میز نابێتە هـۆی دار لێدان وەك مەی خواردنەوە بەڵکو ئەو کەسانە تەمێ ئەکرێن بە جگەی دارلێدانیان. ئەبێ ژن و پیاو دوربخرێنەوە لە نیشتمانی خۆیان بەلای شافعیەوە سەر بەستەکان بۆ ماوەی ساڵێ و بەندە بۆ ماوەی شەش مانگ. بەڵام ژن بە تەنها بەبێ کەسێ ڕەوابێ هاورێتی بکا دورناخرێتەوە.

﴿ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِما رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللهِ إنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُـونَ بِـاللهِ وَالْيَـوْمِ الأَخـرِ ﴾ وەئێـوەی کـار بەدەست بەزەیتان بەو ژن و پیاوە داوێن پیسانەدا نەیەتەوە لەکاتی دار لێدان و جێبەجێ کردنی

یاسای ئایینی خوای مەزن، ئەو یاسایە دوامەخەن یا لەبەر پاڕانەوە بۆیان یا لەبەر پایەی بەرزیان چاوپۆشیان لێ بکەن و هەرگیز نەرمی لەگەڵیان بەکار مەیەرن ئەگەر ئێوە باوەڕ بە خوای مەزن و بە ڕۆژی دوایی ئەهێنن .

﴿ وَلْيَشْهَدْ عذابَهُما طائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنينَ ﴾ دەبا ئامادەی سزادان و دارلێدان و بەردە باران کردنی ئەو داوێن پیسانەبن. کۆمەڵێ لە باوەڕداران و کەمتر نەبن لە دوو کەس لە پیاو چاکان هەتا باشتر ڕیسوایی و بێ ئابڕویان بڵاوبێتەوە .

﴿ الزّاني لا يَنكِحُ إلاّ زانِيَةً أوْ مُشركَةً ﴾ پیاوی داوێن پیس مارە ناکا هیچ ژنێ مەگەر ژنێ مارە ئەکا وەك خۆی داوێن پیسبێ یا ئەو ژنە بت پەرستبێ. یانێ پیاوی داوێن پیسی ئارەزۆی لەوە نیە ژنی داوێن پاك مارە بکا و ئارەزۆی مارەکردنی ژنێ ئەکا وەك خۆی داوێن پیسبێ، زۆر ڕونە هەموو کەسێ هاوپیشەی خۆی خۆش ئەوێ، داوێن پیسی هاوتای بت پەرستیە لە خراپیدا، بۆیە ژنێ بت پەرستی لەگەڵدا فەرموە، ئەگینا ژنی بت پەرست بە هیچ جۆرێ دروست نیە باوەڕداران مارەی بکەن. لەم ئایەتەدا بە پێچەوانەی ئایەتی پێشوو پیاوی داوێن پیسی پێش خستوە، چونکە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لە بارەی پیاوانیهەژاری موسوڵمانانەوە هاتوەتە خوار کە داوایان لە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەکرد ژنی داوێن پیس مارە بکەن و بە پارەی داوێن پیسی ئەوان گوزەرانیان بڕوا بەڕیوە، دوایی خوای مەزن ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

﴿ وَالزانِيَةُ لا يَنْكِحِها إلاّ زانٍ أوْ مُشْرِكٌ ﴾ وەژنی داوێن پیس مارە ناکا مەگەر پیاوی داوێن پیس یا پیاوی بت پەرست. ئاشکرایە ژنی داوێن پیس پیاوی داوێن پیسی خۆش ئەوێ و هەتا ئەو پیاوە داوێن پیسە ڕێگەی خراپەی بۆ بەرەڵاکا.

بە کورتی داوێن پیسی بێز لێ کراوەترین خراپەیەو هیچ کەسێ بەکاری نایەرێ مەگەر خراپێکی بێ شەرم، ئەگەر بیەوێ بێ بەهاوجوتی کەسێ، هیچ کەسێ وولامی ناداتەوە مەگەر کەسێکی خراپی وەك خۆی، ئیتر ژنبێ یا پیاو، چونکە مارە کردنی ژنی داوێن پیس سەر ئەکێشێ بۆلای ناوبردنی مرۆڤ بە خراپەو تانەدان لە خانەدانی و بنەماڵەی .

﴿ وَحُرِمَ ذلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنينَ ﴾ وە داوێن پیسی قەدەغەیە لەسەر باوەڕداران بە تایبەتی و لەسەر ئادەمیزاد بە گشتی بەڵام مارەکردنی ژنانی داوێن پیس دروستە ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە گۆڕاوە بە ئایەتی (٣٢)ی ئەم سورەتە. بەڵام نەك بە نیازی بە دەست هێنانی دارای بە هۆی داوێن پیسی ژنانەوە .

﴿ وَالْذينَ يَرْمُونَ الْمُحْصِناتِ ثُمَ لَمْ يَأتُوا بِأرْبَعَةِ شُهَداءِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ بوختان ئەکەن بە ژنانی داوێن پاکا، ئیتر ئەو ژنە مێرداربێ یا کچ بێ، لە پاشا چوار شایەت نایەرن لەسەر

کردنی ئەو داوێن پیسیە. وە پیاوی داوێن پاکیش بوختانی داوێن پیسی پێدا بکرێ هەروەك ژنـی داوێن پاکە، ئیتر ژنی هەبێ یانە.

﴿ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمانِينَ جَلْدَةً ﴾ دوایی ئەگەر شایەتیان نەهێنا کە شایەتی بـدەن هـەرچواریان بـەبێ جیاوازی شایەتیەکانیان ئێوە سەد دار بدەن لـەو کەسانە ئەو بوختانەیان کـردووە. ئـەبێ بلێـن ئـەو چوار شایەتانە ئێمە چاومان کەوت بە شەرمگەی ئەم پیاوە لـەناو شەرمگەی ئەم ژنەدا، خوای مەزن چوار شایەتی دیاری کردووە بۆ داوێن پیسی بۆ ئەوەی قورسبێ لەسەریان شـایەتی دانەکـەیان و بـە گۆترە ناموسی دانیشتوانە ڕوشێنن، لەبـەر پاراسـتنی نـاموس و ڕێـزی ئـادەمیزادو ئابڕونـەچونیان، پارێزگاری بنەماڵەی دانیشتوان لـەتێك چوون و نەمان .

﴿ وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهادَةً أَبَداً أولئِكَ هُمُ الْفاسِقُونَ إلاّ الذينَ تابُوا مِنْ بَعْدِ ذلِكَ وَأَصْلَحُوا فَـأَنَ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ وە ئێوەی کاربەدەست لە دوای دارلێدان شایەتی دانی ئـەو کەسـە بوختـان چیانـە وەرمەگرن بۆ شتی تر هەرگیزو ئەو کەسانە لایانداو لە سنوری پەرستنی خوای مەزن بە ڕوشـاندنی ناموسی ژنان و پیاوانی داوێن پاك مەگەر کەسـانێکی ئـەوتۆ لـە دوای بوختـان کردنیـان پەشیمان بنەوەو داوای لێ بوردن بکەن لە خوای مەزن و، ئەو کەسانە کردەوەکانی خۆیان چاك بکـەن بـە جۆرێ نیازیان وابێ جارێ تر نەگەڕێنەوە بۆلای بوختان بەیەکێ تردا، دوایی بە ڕاستی خوای مەزن لـەوان خۆش ئەبێ، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ ئەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە لە گوناهی خۆیان و خۆیانیان داوە بە دەستەوە بۆجێبەجێ کردنی یاسای خوای مەزن. ئەو کەسانەی بوختـان بـە ژنـی خۆیانا ئەکەن بەم جۆرەی خوارەوە، خوای مەزن یاسای بۆ دیاری کردوون و ئەفەرموێ:

وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٦﴾ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٨﴾ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾

﴿ والذِيْنَ يَرْمُونَ أزْواجِهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شُهَداءُ إلاّ أنْفُسـهُمْ ﴾ وەكەسـانێكی ئـەوتۆ گومـانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ ژنەكانیان و جگە لـە خۆیان شایەتی تریـان نیـە، بێگومـان پێویسـتە بـۆ داوێن پیسی چوار شایەت هەبێ، بەم جۆرەی خوارەوە خوای مەزن یاسای دیاری كراو بـۆ ئـەو كەسانە ڕون ئەكاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ فَشَهادَةُ أحَدِهِمْ أرْبَعُ شَهاداتٍ بِاللهِ إنَهُ لَمِنَ الصّادِقِينَ ﴾ دوای ئەوەی ئەو كەسانە شایەتیان نەبوو، شایەتی یەكێ لـەو كەسانە هەتا سنوری بوختانەكەی لـەسەر لاچێ كە هەشتا دارە چـوار شایەتە بە خوای مەزن كە ڕاست ئەكا، بەم جۆرە بڵێ: مـن شـایەتی ئـەدەم بـەهۆی ئاگـاداری خوای مەزنەوە كە بە ڕاستی من ڕاست ئەكەم لـەو داوێن پیسیە ئەیدەمە پاڵ ئـەم ژنـەی خـۆم. چوار جار ئەوشایەتیە دووپات بكاتەوە .

﴿ وَالْخامِسَةُ أنْ لَعْنَةُ اللهِ عَلَيْهِ إنْ كانَ مِنَ الْكاذِبِيْنَ ﴾ وە شایەتی دانی پێنچەم بۆ پیاوەكە بەم جۆرە بێ: بەڕاستی دوربون لـە میـهرەبانی و بـەزەیی خـوای مـەزن لـەسـەری بـێ ئەگـەر لـەو كەسانەبم درۆبكەم لـەم داوێن پیسیە ئەیدەمە پاڵ ئەم ژنە .

﴿ وَيَدْرَ أعَنْها الْعَذابَ أنْ تَشْهَدَ أرْبَعَ شَهاداتٍ إنَهُ لَمِنَ الْكاذِبِيْنَ ﴾ وەلائەبا لـەو ژنە سـنوری داوێن پیسی كە ئەو ژنە چوار شایەتی بداو بڵێ بە ئاگاداری خـوا بـە ڕاسـتی ئـەو پیـاوە لـەو كەسانەیە درۆئەكا لـەو بوختان كردنە بە مندا.

﴿ وَالْخامِسَةُ أنْ غَضَبَ اللهِ عَلَيْها إنْ كانَ مِنَ الصّادِقِينَ﴾ وەشایەتی دانی پێنچەم ژنەكە بڵێ: بەڕاستی خەشمی خوای مەزنی لـەسەربێ ئەگەر ئەو مێردەی ڕاست كا لــەو بوختانـەی بـە مندا ئەیكا .

﴿ وَلَوْ لا فَضَلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَإنَ اللهَ تَوابٌ رَحِيمٌ ﴾ وەئەگەر گەورەی خوای مـەزن و بەزەیی ئەو نەبوایە ئێوە ئابڕوتان ئەچوو لـە جیهاندا بەجێبـەجێ كردنـی سـنوری خـوای مـەزن بەسەر ئێوەدا. بەڵام خوای مەزن ئەو سنورەی لـەسەر ئێوە هەڵگرت بەهۆی ئەو یاسایە بۆئێوەی داناو بۆتانی دیاری كردو بەڕاستی خوای مەزن پەشـیمان بونـەوە وەرئـەگرێ لــە گوناهبـاران، خاوەنی میهرەبانی و بەزەییـە بـۆ بـەندەكانی و سـنوری دارلێدانـی لـەسـەر ئێـوەی مـێردو ژن هەڵگرت .

بۆ زانین: بە گوێرەی یاسا بوختان كردنی مێرد بەژنی خۆیا بە داوێن پیسی ، بەرگری كردنی ژن ومێرد بۆ لابردنی سنوری دیاری كراو بەو جۆرەی باس كرا پێی ئەوترێ (لعان) یا (ملاغنـە) یانی نەفرەت كردن لـەیەكتریو ئەبێتە هۆی ئەمانە: ئەو ژن و پیاوە لـەیەك جوێ ئەكرێنەوە. ئەو

ژنە قەدەغەیە لەو پیاوە هەتا هەتایە. سنوری دیاری کراو کـە هەشتا دارە لەسـەریان لائـەچیَ، ئەگەر منالّیان بووبیَ لـە دوای ئەبوختانــە منـالّی پیاوەکـە نیـە پێویسـت نیـە ئـەو ژن و منالّـە بەخێوبکا لـە ماوەی عیدەدا. ئەوبو منالّ و پیاوە میرات لـەیەکتری ناگرن. بەلاّم ئەو منالّـە منـالّی یاسایی ئەوژنەیەو میرات لـەیەکتری ئەگرن .

مەرجە بۆ نەفرەت کردنی ژن و مێرد لـەیەکتری دادوەر فەرمانی پیَ بدا، ڕستەکان فێری ژن و مێرد بکا، نەفرەت کردنی ژن دوای نەفرەتی مێردبیَ، ئەگــەر مێردەکـە لاڵ بـوو بـە جـۆریَ ئاماژە بکا بۆ نەفرەت کردن ئامادەبوان لـە مەبەستەکەی بگەن. شایەتی دانەکــەیان تونـدو تـۆڵ بکەن بەهۆی ناوی خــوای مەزنـەوە، وا چاکـە ئـەو نـەفرەت کردنـە لـە پـیرۆزترین کـات و جێگەدابیَ، بۆ موسڵمانان لە مزگــەوتابیَ، بـۆ جولـەکـەو گاورەکـان و ئـاگر پەرستەکان لــە پەرست گاکانی خۆیانا بیَ، لەدوای نوێژی عەسر بیَ.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی نەفرەتی ژن و مێرد لــە یـەکتری ئـەوەبوو: عـوەی مـیری ئامۆزای عاسی ئەلئەنساری کوڕی عەدی ژنێکی هەبوو بە ناوی خەولـەی کچــی قـەیس، هاتـە لای عاسمی ئامۆزای ووتی: شورەیکی کوڕی سەمحا کە ناوی دایکێتی چاوی پێی کەوت بەســەر خەولـەی ژنەوەبوو، عوەی مـیرو شـورەیك خەولـە ئـامۆزایی یـەکتریی بـوون، عاسم چووبـۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو هەواڵـەی بە پێغەمەر ڕاگەیاند، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ عوەی میری بــانگ کردو فەرموی: تۆ لـە خوا بترسە لە بارەی ئەوشــتەی باســت کــردووە لــە نێـوان شـورەیك و خەولـەی ژنتاو بوختانی پێدا مەکە، عوەی میر ووتی: ئەی فروستادەی خوا: سـوێندم بـە خـوای مەزن شورەیکم بەسەر خەولـەوە دیوە، چـوار مانگـە نەچوومەتـە لای و ژن و مـێردیم لـەگـەڵ نەکردووە، ئێستا ئاوسەو سکی پڕە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕوی وەرچەرخان بۆلای خەولـە فــەرموی: تۆ لـە خوا بترسەو جگەی ڕاستی شتی تر مەڵیَ، خەولـە ووتی: ئەی فروستادەی خــوای مـەزن: عوەمیر مرۆڤێکی خانە گومانە چاوی لیَ بووە کە شورەیك تەماشای منــی کـردووەو گفتوگـۆی لـەگەڵ کردوم، بۆیە ئەو شتە ئەداتە پاڵی من.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا بە کۆبوونەوەی دانیشتوانی مەدینە، دوای نوێژی عەسر عوەمیرو خەولـە نەفرەتیان لـە یەکتری کرد بە گوێرەی یاسا، دوای نەفرەت کردنەکەیان لـەیــەکی جـویَ کردنەوە. باسی نەفرەت کۆتایی پیَ هات .

پێغەمــەر ﴿ﷺ﴾ هــەر کاتیَ بچوایەتـە دەرەوە بـۆ هـەر جـەنگیَ، پشـکی ڕائەکێشــا لــە ناوژنەکانیان، ناوی هەرکامێکیان دەربچوایە، ئەو ژنـەی لـەگـەڵ خـۆی ئـەبردە دەرەوە، کاتیَ

جەنگی ئەلموستەلیق ڕوی دا لـە سالّی شەشەمی کۆچیدا پشك بەری عائیشـە کـەوت، پێغەمـەر لـەگەڵ خۆی بردی، ئەو کاتە عائیشە هێشتا منالّ و بچوك و لاوازبوو، لە پاشا پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بەسەرکەوتووی بەسەر دوژمناندا گەڕایـەوە، بـەو بۆنـەوە لـەو ڕێگـە دوورودرێـژو شـاخاویەدا تووشی ماندوویی بوبوون کاتێ گەیشتنە نزیکی مەدینە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئۆردوەکەی دابـەزاندن هەتا ئەو شەوە پشوێ بدەن. پاشان دەستوری بارکردن دەرکرا. بەڕێکەوت عائیشە لەو کاتـەدا لـە چادرەکـەی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ چوبـووە دەرەوە بـۆ هـەندێ کـاری پێویسـت لـە دەرەوەی سەربازخانەکە، گەردانەی مورووی زەفاری ملی کـەوتبووە خـوارەوەو هەسـتی پـێ نـەکردبوو، کاتـێ بـیری کەوتـەوە چـوە دەرەوەی چادرەکـە لـە تـاریکیدا گـەڕاو هـاتوچۆی کـرد هـەتا ملوانکەکەی دۆزیەوەو ماوەیەکی پێ چوو، کاتێ گەڕایەوە بۆ لای سـەربازخانەکە ئۆردوەکـەی بـاری کردبـوو، ئـەو کەسـانەی کەژاوەکـەی عائیشـەیان بـارکردبوو نـەیانزانی عائیشـە لـە ناوکەژاوەکەدا نیە، دوایی کە عائیشە هاتەوە تەماشای کـرد ئۆردوەکـە بـاری کـردووە، هیـچ شتێکی بۆنەمایەوەو دانیشت، بڕوای وابوو کاتێ زانرا لـە کەژاوەکـەدا نیـە دێنـەوە بەشـوێنیا، دوای خەو زۆری لێ سەند، سەرپۆش و بەرماڵەی دا بەخۆیا و خەوی پێداکەوت، کاتێ ئەو لـە پەرخەی خەودابوو، چاوەڕوانی ئـەوەبوو، کەسـێ هـەواڵی بزانـێ، سـەفوانی کـوڕی موعتـەلی سولـەمی بە سواری هەشترەکەی بەلای عائیشەدا تێپەڕی و ئەو کاتە ڕۆژ بوبوە، سەفوان بـەجێ مابوو هەندێ لە کەل و پەلی ئەو ئۆردە بەجێ مابوو کۆیان بکاتەوە، ڕەشایی و تابۆیەکی بینی بە خەوتویی، بۆی دەرکەوت عائیشەیە ئەوکاتە بەر لـە هاتنـە خـوارەوەی داپۆشـینی ژنـان بـوو، عائیشەی ناسیوەو ووتی: (إنا للهِ وَإنا إلَيْهِ راجِعُونَ) عائیشە لە بیستنی ئـەو ڕسـتانە بێداربۆیـەوە، سەفوان پێی ووت: بۆچی بەجێ ماوی، وەڵامی نەدایەوە ڕومەتی خۆی داپۆشی بەسەرپۆشەکەی خۆی، سەفوان هوشترەکەی بۆبردە پێشـەوە بـەجێی هێشـت هـەتا سـواری بـوو، هیـچ جـۆرە گفتوگۆیە لـە نێوانیاندا ڕوی نەدا، سەفوان هوشترەکەی ڕاکێشا، بـە لـە شـکرەکە نەگەیشـت هەتا چونەوە مەدینە، دانیشتوانی مەدینە سەفوانیان بینی و عائیشەیش لە ڕۆژی ڕوناکا بە سواری هوشترەکەی لـەگەڵیایەتی، عائیشە دابەزی و لـەو کاتەدا هیـچ جـۆرە گومـانێکی خـراپ نـەبرا بۆژنی پێغەمەر وکچی ئەبو بەکر، هەروەها بۆسەفوانیش.

کاتێ چفەو ورتەورت لە ناو دانیشتوانی مەدینەدا پـەیدا بـوو، حەمنـە کچـی جـەحش ئـەو دەنگ و باسە خراپەی درابووە پاڵ عائیشەو هاتنـەوەی لـەگـەڵ سـەفوان یەکـەم جـار بـڵاوی کردەوە بەبێ تاقی کردنەوە لەبەر ئەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ عائیشەی بەسەر زەینەبی خوشـکی و

هەویەی عائیشەدا هەڵبژاردوە بۆ بردنە دەرەوە، حەسانی کوڕی سابیتیش دەستی باڵای هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئەو دەنگ و باسە. عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئەو دەنگ و باسەی بیست بەبێ دەنگی وەستاو بەرگری لە عائیشە نەکرد. عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ئەو هەلەی بۆ سازدا، بۆ ئەوەی ناموسی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بڕوشێنێ، کۆڕوکۆمەوڵێکی کۆکردەوە، بەوانی ووت: سوێندم بە خوای مەزن: عائیشە ڕزگاری نەبووە لەدەستی سەفوان، میستەحی برازای ئەبو بەکریش لەو بارەوە زمانی درێژکردبوو بە خراپە بۆ عائیشە، ئەو ڕوداوە نزیکبوبێتە هۆی تێك چوونی موسڵمانان و خراپەی لێ پەیدا ببێ.ئەو چفە نارەوایە گەیشتە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆری لا گرانبوو، سەرگەدان لەو بارەوە، نەی ئەزانی ئایا ڕاستە یا درۆیە، کەسیش نەیئەتوانی ئەو کارە ناپەسەندە بە عائیشە ڕابگەیەنێ، هەرچەندە خوێ لوتفی پێغەمەری بۆخۆی بەدی ئەکرد. بە ڕێکەوت عائیشە لەو سەردەمەدا نەخۆش کەوتبوو، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بچوایە بۆلای عائیشەو دایکی لایانبوو، ئەیفەرموو ئەو کچەتان چۆنە؟ جارێ لە جاران پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چوبۆلای عائیشە داوای لە پێغەمەر کرد دەستوری پێ بدا بگوازرێتەوە بۆخانەی باوکی هەتا خزمەتی بکەن، پێغەمەر دەستوری پێدا، نەخۆشی عائیشە بیست ڕۆژی خایاند،کاتێك ڕزگاری بوو چوە دەرەوە بۆجێبەجێ کردنی پێویستی خۆی، عەرەبەکان ئەوکاتە جێگەی خۆپاکردنەوەیان لە خانوودا نەبووە دایکی میستەحی پورزای عائیشە لەگەڵ عائیشەدا هەل خلیسکاو ووتی: یاخوا میستەح لەناوچێ، عائیشە ووتی: بەخوا شتێکی خراپت ووت، ئەو پیاوە لە کۆچ کەرانەو ئامادەی جەنگی بەدریشبووە. دایکی میستەح ووتی: ئەی کچی ئەبو بەکر: هیچ هەواڵێ بە تۆ نەگەیشتوە. عائیشە ووتی: دەنگ و باسی چی؟ ئەویش هەواڵی ئەو بوختان و درۆیەی بە عائیشە ڕاگەیاند، هەر ئەو گفتوگۆیەی بیست عائیشە کەوتوو بێ هۆشبوو، لە خەفەتا نەیتوانی پێویستیەکەی خۆی جێبەجێ بکا، فرمێسکی نەئەوەستاو پێڵوی چاوی دانەئەخستن بۆ خەوتن، سەرزەنشتی دایکی کرد لە شاردنەوەی ئەو دەنگ و باسە، دایکی ووتی: کچی خۆم لەسەر خۆبە: کەم جاران ژنی جوانی قۆزی وەك تۆ ڕزگاری بووە لە دەست هەوێکانی، بگرە گفتوگۆی ناڕوایی زۆریان پێدا هەڵداوە.

پێغەمەر﴿ﷺ﴾ پرسی بە عەلی و ئوسامەی کوڕی زەید کرد، عەلی ووتی: ئەی فروستادەی خوا، تەنگەتاو مەبە ژن لە جگەی ئەو زۆرن، ئەگەر پرس بەکارەکەی عائیشە بکەی ڕاستیت پێ ئەڵێ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بورەیرەی کارەکەی عائیشەی بانگ کرد ئەویش ووتی: جگە لە چاکە هیچ شتێکم لێ نەدیوە، جگە لەوەی کە هەویرم ئەشێلا داوام لێ ئەکرد ئاگاداری ئەو هەویرە بکا کەچی ئەخەوت و کاوڕەکەی ئەهات و هەویرەکەی ئەخوارد.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هیچ شتێکی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی چوو بۆلای عائیشە، ئەو کاتە دایك و باوکی وژنێکی یاریدەدەریان لای عائیشە بـوون، عائیشـە زۆر بـە خەسـتی ئـەگریاو ژنەکـەیش لەگەڵیا ئەگریا،پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە عائیشەی فەرموو: ئەی عائیشە: هەندێ شتم لـەبارەی تـۆوە بیستوە ئەگەر شتی خراپت کردووە بگەرێوە بۆ لای خـوا و پەشـیمان ببـەرەوە خـوا پەشـیمان بوونەوە لـەبەندەکانی خۆی وەرئەگرێ، هەر کەپێغەرە ﴿ﷺ﴾ لەفەرمودەی خۆی بویەوە، خوێن هاتوچۆی کرد بەدەمارەکانی عائیشەدا، چاوەکانی لەفرمێسك ووشك نەئەبووەوە، ڕووی کرد بۆ لای باوك ودایکی چاوەڕوان بووئەوان بەشتێ وەڵامـی پێغەمـەر بدەنـەوە، وەڵامیـان نەدایـەوە، عائیشە توڕەبو زۆر بەچرپ وبەپرپی قیژانی بەسەریاو وەڵامی نەدایەوە، بـاوك ودایکـی ووتیـان: نازانین بەشتێ وەڵامی بدەینەوە، عائیشە گریانەکەی زۆر پەرەی سەند. لـەپاشـا ڕووی وەرگـێڕا لەپێغەمەری خواو ووتی: بەڕاستی من ئەزانم ئەگەر بڵێم: ئەو شتەی بیـژراوە ڕاسـتە مـن شـتێ ئەڵێم نەبوە، بەخوای مەزن من پاك وخاوێنم لـەو باسە، ئەگەر بڵێم: نەبوە بڕوام پێناکـەن، مـن هەر ئەوشتە ئەڵێم: کە یەعقوب لـەکاتی وونبوونـی یوسـفدا ئەبفـەرموو ﴿ فالصبر جميل والله المستعان على ما تصفون ﴾ پێغەمەر کتوپڕ سروشی بۆ هاتە خوارەوە، کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لە سروشەکە ڕزگاری بوو فەرموی: مژدە بێ ئەی عائیشە، ئەی ژنە سورە بچکۆلـەکـە. بەڕاستی خوای مەزن پاکی ورزگاری تۆی ناردە خوارەوە، عائیشە ووتی: سوپاس بۆ خوای مەزن، دایکی بەعائیشەی ووت: هەڵسە برۆ بۆلای ئەی حومەیرە، عائیشە ووتـی: بـەخوا هەڵناسـم، جگـەی خوا پاکی منی نەناردوەتە خوارەوەو سوپاسی جگەی خوای مەزن ناکەم، پێغەمەر چـووە دەرەوە بۆلای مزگەوت، ئەوئایەتانە هاتبوونە خوارەوە بۆ پاکی عائیشە بەسەر موسڵمانانیدا خوێنـدەوە. کەخوای مەزن ئەفەرموێت :

إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا

جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾

﴿إِنَّ الَّذِيْنَ جاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ بەراستی کەسانێکی ئەوتۆ ئەو بوختانە گەورەیان پێکهێناوەو داویانەتە پاڵ عائیشەی دایکی بـاوەڕداران و بوختانی پێوە ئەکەن بە سەفوانی کوڕی موعەتەلی سولـەمی تاقمێکن لـەئێوە باوەڕدار یا هـەندێکن لـەو کەسانە خۆیان بە باوەڕدار دائەنێن دوایی ئێوە کـەبریتین لـە فروستادەی خـواو عائیشـەو سەفوان و ئەبوبەکر گومان مەبەن ئەو بوختانە خراپە بۆ ئێوە. بەڵکو ئەو بوختانە بۆ ئێوە چاکـە چونکە بەهۆی ئارام گرتنتانەوە توشی پاداشتی گەورە ئەبن لای خوای مەزن، ڕێزتان لای خوای

مـەزن پـەرەی سـەند بـەهۆی هاتنـە خـوارەوەی ژمارەیـە لـە ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز بـۆ بەرگری‌کردن لـەو بوختانە ئەو درۆزنانە دروستیان کردو دایانە پاڵ عائیشە.

﴿ لِكُلِّ امرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الآثمِ ﴾ بۆ هەمو کەسـێ هەیـە لـەو کەسـانەی ئـەو بوختانەیان کـردو پاداشـتێ کردویانـە لـە گونـاه بەئـەندازەی زۆری و کـەمی بوختانەکـەیان، هەندێکیان پێکەنی بون، هەندێکیان گفتوگۆیان لەو بوختانەدا کردبـو، هـەندێکیان بـێ دەنـگ بون، هەندێکیان بەرگرییان لەو بوختانە نەکردبو، لەکۆتاییدا ئەو بوختانە سـەپا بـەزەقی بەسـەر حەسانی کوڕی سابیت و مەستەح و ژنێکی قوڕەیشیەکان. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەریەکەیان هەشـتا داری لێدان.

﴿ وَالَّذى تَوَلَى كِبْرَهُ لَهُ عَذابٌ عَظيمٌ ﴾ وەکەسێکی ئـەوتۆ زوربـەی بلاوکردنـەوەی ئـەو بوختانەی هەڵگرتبو بۆی هەیە سزایەکی گەورە لەپاشـەڕۆژدا بـەئاگری دۆزەخ، لەجیهانیشـدا بەئابڕوچونی و بەدرۆکەوتنەوەی پیلانەکەی. ئەو کەسەیش عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بو کەیەکێ بو لـەگەورەکانی هۆزی خەزرەج، زوربەی دانیشتوانی مەدینە بەتایبـەتی کورەکـان و لاوەکـان داوایان کرد بدرێ لەسەری و بکوژرێ.

﴿ لَولاإذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤمِنُونَ وَالْمُؤمِنـاتُ بِأَنْفُسِـهِمْ خَـيْراً وَقـالُوا هـذا إفْـكٌ مُّبِـينٌ ﴾ ئەبوایە ئێوەی باوەڕدار کاتێ ئەو بوختانەتان بیسـت پیـاوان و ژنـانی بـاوەڕدار کتوپـڕ گومـانی چاکەو داوێن پاکیان ببردایە بۆخۆیان، خۆتانتان بە داوێن پاك دانایە، بـاوەڕداران هـەمویان وەك یەك لـەش وان و هەمویان براو خوشکی یەکترن و خراپەیان وەك یەك وایـەو بیـان ووتایـە ئـەو بوختانە درۆیەکی ئاشکرایە شایستەی باوەڕداران نیە، بەتایبەتی عائیشەی دایکـی بـاوەڕداران و ژنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، ڕوبەڕوی ئەو تاوانبارانە بوەستانایە، بەرگریان لەخۆیان بکردایە.

﴿ لَوْلا جاءوا عليه بأربعة شُهَداءَ فَإذْ لَمْ يأتُوا بالشُهَداءَ فَأُلئِكَ عِنْدَ اللهِ هُمُ الْكـاذِبُونَ ﴾ بۆ ئەو بوختان بازو خراپە بلاو کەرەوانە چوار شایەت ناپەرن شایەتی بدەن لـەسەر ڕاسـتی ئـەو گومانەو بەچاوی خۆیان بینیویانە دوایی کاتێ شایەتیان نەهێنا، دوایـی ئـەو بوختـان چییانـە لـە خزمەتی خوای مەزندا درۆزنن، شتی بەگوێرەی یاسا دەرنەکەوت درۆو بوختانە.

﴿ وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَتُهُ فِي الْدُنْيا وَالآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِيْما أفَضْتُمْ فِيْهِ عَـذابٌ عَظِيـمٌ ﴾ وە ئەگەر گەورەیی و بەزەیی خوای مەزن نەبوایە بەسـەر ئێـوەوە لەجیـهان و لـەپاشـەڕۆژدا لـەجیهاندا کە مۆڵـەتی ئێوەی دا هەتا ئێوە پەشیمان ببنەوە لـەو بوختانە دروستتان کردبـوو هـەتا تاوانبار دەربکەوێ، لـە پاشەڕۆژدا کە لێتان خۆش ئەبێ. بەڕاستی تووشی ئێوە ئـەبوو سـزایەکی

گەورە لـە جیهاندا بە بۆنەی ئەو بوختانەوە دەستتان پیٚ کردبوو دابوتانە پاڵ عائیشـەو سـەفوانی بیٚتاوان، سزایەکی وا دارلیٚدانەکەتان لـەچاو ئەودا زۆر بەبچوکتان دائەنا.

لـە پاشا خوای مەزن هۆی شایستەی ئەو سزا گەورەیەی جیهان و پاشەڕۆژ ڕوون ئەکاتەوەو ئەفەرمویٚ:

﴿ إِذْ تَلَقَوْهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَ تَقُولُونَ بِأَفْواهِكُمْ ما لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عَلِيْمٌ ﴾ ئەو سزایە تووشتان ئـەبوو کاتیٚ ئیٚوە ئەو بوختانەتان بەزمانی خۆتان بۆ یەکتری ئـەتان گـیٚڕاوەو بـەدەمی خۆتـان شـتیٚکتان ئەووت هیچ بەڵگەیەکتان بۆ ئەو شتە نەئەبوو نەتان ئەزانی بەیەکترتان ئـەووت: ئایـا نـەتزانیوە عائیشە بوختانی پیٚوە کراوە؟ وای لیٚ ئەهات لـەهەموو کۆڕو کۆمەڵیٚکا باسی بکرایە.

﴿ وَتَحْسَبُونَهُ هَيْناً وَهُوَ عِنْدَ اللهِ عَظِيْـمٌ ﴾ وە ئیٚـوە گومـان ئەبـەن چونـە نـاوی بوختـان بـە عائیشـەدا شتیٚکی ئاسانەو گوناهی تیٚدانیە وخراپەی لـەدواوە نـابیٚ و، ئـەو بوختانـە لـەخزمـەت خوای مەزندا گەورەیەو شایستەی سەختترین سزایە.

﴿ وَلَوْلا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ ما يكون لَنا أَنْ نَتَكَلَّم بِهذا ﴾ وە بۆ ئیٚوەیە یەکەم کات ئەوکاتەی ئەو بوختانەتان بیست نەتان ووت: شایستە نیە ئیٚمە گفتوگۆ لـەبارەی ئـەو بوختانـەوە بکـەین، یەکەم کات ئەبوایە گومانی خراپتان نەبردایە.

پیٚویستە ئادەمیزاد زمانی خۆی بپاریٚزیٚ لـەبوختان کردن بۆ هەموکەسیٚ بەتایبەتی بۆ عائیشەی ژنی پیٚغەمەر و دایکی موسڵمانان ،ئەو کەسانە باسی داویٚـن پیسـی بکـەن وبەلایانـەوە چـاکبیٚ خراپترین ئادەمیزادن.

﴿ سُبْحانَ اللهِ هذا بُهتانٌ عَظِيْمٌ ﴾ بیشیان ووتایە پاك وخاویٚنی بۆ خوایە. ئـەو بـاس وبوخاتـە درۆیەکی زۆر گەورەیە، چ شتیٚ لـەوە گەورەترە مرۆڤ بوختان بکا بەکە سـیٚکی داوایـن پاکـا، بەتایبەتی ژنی فروستادەی خوای مەزن، باوەڕدار ئەو کەسـەیە خراپـە لـەبراو خوشکی خـۆی بسریٚتەوە.

﴿ يعظكم اللهُ أَنْ تَعُودُوا لمثله أَبَداً إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِيْنَ ﴾ خـوای مـەزن ئامۆژگـاری ئیٚـوە ئـەکا کەئیٚوە نەگەریٚنەوە بۆ لای ئەو بوختانە لـەمەودوا هەرگیز ئەگەر ئیٚوە باوەڕتان هیٚنـاوە، چونکـە لـەو بوختانەدا پیٚغەمەر ئازاری پیٚ ئەگا بەهۆی ڕوشاندنی ڕیٚزی ناموسیەوە.

﴿ وَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمْ الآياتِ وَ اللهُ عَلِيْمٌ حَكِيْـمٌ ﴾ وە خـوای مـەزن ڕونـی ئەکاتـەوە بـۆ ئیٚـوە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لـەسەر دەستورو یاسای خۆی هەتا ئیٚوە ئامۆژگاری وەربگرن بەڕەوشتی چاکی ئەو یاسایانەو خوا بەهەمو کاریٚکی ئیٚوە ئەزانیٚ بەتایبەتی ڕوداوی نیٚوان عائیشەو سەفوان، پاداشتی ئیٚوە ئەداتەوە بەگویٚرەی کردەوەی خۆتان، هەموو شتیٚ لـەجیٚگەی شیاوی‌خۆیا دائەنیٚ.

﴿إِنَّ الَّذِيْنَ يُحِبُّونَ اَنْ تَشِعَ الْفاحِشَةُ فِي الَّذِيْنَ آمَنُوا لَهُمْ عَذابٌ اَلِيْمٌ فِي الْدُنيا وَ الآخرة وَاللهُ يَعْلَمُ وَ اَنْتُمْ لاتَعْلَمُونَ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ کە پێیان خۆش بێ کـەکاری ناشـیرین بـلاو ببێتەوە لـەناو کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی گـەورەو ئـازاردار لـەجیهاندا بەجێ بەجێ کردنی سنوور لـەسەری ولەپاشەڕۆژدا بەئاگری دۆزەخ ئەگەر پەشـیمان نەبێتەوەو خوا ئەزانێ بەنهێنیو چفەی ئێوەو ئێوە هیچ شتێ لـەوانە نازانن.

﴿ وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُـهُ وَاَنَّ اللهَ رَؤوفٌ رَّحِيْـمٌ ﴾ وە ئەگـەر گـەورەیی وبـەزەیی خوای مەزن نەبوایە لـەگەڵتان و چاکەی خوای مەزن بەسەرتانەوە نەبوایە، بەڕاستی بەهۆی ئـەو بوختانەوە سزای زۆرتان تووش ئەبوو بەڕاستی خوای مـەزن خـاوەنی بەزەییـە بـۆ بـەندەکانی و بەمیهرەبانە لـەگەڵیان، دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە ئاماژەیـە بـۆلای گـەورەیی تـاوانی ئـەو بوختانە کراوە بەدایکی باوەڕدارانا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ

يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ﴿٢٤﴾

﴿ يا أيها الَّذِيْنَ آمَنُوا لا تَتبِعُوا خُطُواتِ الْشَيْطانِ وَمَن يَتبَعُ خُطُواتِ الشَّيْطانِ فَإِنَهُ يَأمُرُ بِالْفَحْشاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە دوای ڕێگە و ڕچـەی شـەیتان مەکەون و هەرکەسێ دوای ڕێگەی شەیتان بکەوێ دوایی شەیتان فەرمان ئـەدا بـەگوناهی زۆر خراپ وبەشتێ یاسای خوای مەزن لای خراپەو دەروونی بەرز بێزی لێ ئەکاتەوەو لای ناخۆشـە بەوێنەی بوختان کردن بە عائیشەدا.

﴿ وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَتُهُ ما زكى مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ ولكنَّ اللهَ يُزكي مَنْ يَشاءُ وَ اللهُ سَمِيْعٌ عَلِيْمٌ ﴾ وە ئەگەر گەورەیی و بەزەیی خوای مەزن نەبوایە بەسەر ئێوەی بوختـان بـاز کە یاریدەی ئێوەی دا بۆلای پەشیمان بونەوە گوناهەکانی ئێوەی شۆردەوەو یاسای لابەری گونـاهی بۆ دانەنایە هیچ کەسێ پاك نەئەبووەوە لە گوناه وخوای مەزن ڕازی نەئـەبوو لـەئێوە، وە بـەلآم خوای مەزن پاك ئەکاتەوە لـە گوناه هەرکەسێ ئارەزووی هەبێ بەهۆی پەشیمان بونـەوەو، خـوا گفتوگۆی ئێوە ئەبیسێ ئەزانێ بەشاراوەی دڵتان و بەنیازی دەرونتان .

﴿ وَلا يَأتِلَ أولُوا الفضل مِنْكُمْ وَالسَّعَةَ أنْ يؤتوا أوْلي الْقُربى وَالْمَساكِيْنَ وَ الْمُهاجِرِيْنَ في سَبِيْلِ اللهِ ﴾ وە سوێند ئەخوا ئەو کەسانەی خاوەنی ڕێزن لـەئێوە لەناو ئایینداو دارایـی فراوانـی هەیـە کە نەیبەخشی بەخزمە نزیکەکانی خۆیو بەهەژاران و بەکۆچ کەران لـەبـەر بـەرزی و ڕێگـەی ئایینی خوای مەزن شتی لـەوەو بەر داویە بەوان لـەدارایيو دەست گیرۆیی کردون. ئـەو ئایەتـە لـەوەوە هاتوەتە خوار، ئەبو بەکر سوێندی خوارد لـەمـەو دووا دەسـت گـیرۆی مەستەح نـەکا چونکە بەشدار بوە لـەبلآوکردنەوەی ئەو بوختانە کرا بـەدایکی موسـوڵمانانندا عایشـەی کچـی ئەبوبەکر وەمەستەح، خزمـی ئەبوبـەکر بـوو هـەژارو کـۆچ کـەریش بـوو بەشـداری جـەنگی بەدریشی کردبو.

﴿ وَلْيَعْفُو أوْ لِيَصْفَحُوا ألا تُحِبّوْن أنْ يَغْفِرَ اللهُ لَكُمْ وَاللهُ غَفُرٌ رَّحِمٌ ﴾ وە بائـەوان لـەخراپـەی ئەوان ببورن و چاو بپۆشن لـەو کارە خراپەی ئـەوان و تۆڵـەیان لێ نەسـێننەوە بـەوەی دەست گیرۆییان نەکەن، ئایا ئێوە پێتان ناخۆشە کە خوای مەزن لـە ئێوە خۆش بێ بەرانبەر لێ بوردن و چاو پۆشی کردنی ئێوە لـە وان و خوای مەزن لێ خۆش بونی زۆرە لـەتاوانی بەندەکانی میهرەبانە

بۆ پەشـیمان بوەکـان. ئـەو ئایەتـە موژدەیـەکی زۆر گەورەیـە بـۆ لێ بـوردن. کەواتـە ئێـوەش فەرمانبەرداری خوا بن لـەلێ بوردندا، ئەبوبەکر کە پێغەمبەر ئەو ئایەتەی خوێندەوە بریتـی دا بـۆ سوێندەکەی دەست گیرۆیی کردنی مەستەجی گێڕایەوە بۆ جارانی پێشو. کەواتە ئەگەر کەسـێ سوێندی خوارد شتێ نەکا، دوایی ئەگەر چاکبو بیکا.

﴿ إنَّ الَّذِيْنَ يَرْمُونَ الْمُحَصَناتِ الْغافِلاتِ الْمُؤمِناتِ ﴾ بەڕاسـتی کەسـانێکی ئـەوتۆ خراپـەو داوێن پیسی فرە ئەدەن بۆ لای ژنانی داوێن پاك ئاگایـان لـەو خراپەیـە نیـەو شـتی وا بـەدڵیانا نەهاتوە، باوەڕدارن بـەخواو بەفروستادەی خـوای مـەزن، ئەیانـەوێ ئـەو ژنـە پـاك وبێئاگـاو باوەڕدارانە ناموسیان بڕوشێ وتانە لـە پێغەمەر ئەدەن.

﴿ لَعِنوا فِي الَّدُنيا والآخِرةِ وَلَهُمْ عَذابٌ عَظِيْـمٌ ﴾ ئـەو کەسـە بوختـان کەرانـە نـەفرەتیان لێکراوەو دوور خراونەتەوە لە میهرەبانی خوای مەزن لـەجیهاندا سزایان ئـەدرێ بـەدارلێدانیان ولـەڕۆژی دواییـدا بـە ئـاگری دۆزەخ، بۆیـان هەیـە سـزایەکی گـەورەتر لـەوەی جیهان،ئەوکەسانەیش بریتین لە عەبدولآی کوڕی ئوبەیی وتاقمەکەی. سزای گەورەیان بۆ هەیە:

﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ اَلْسَنَتُهُمْ وَ اَيْدِيَهُمْ وَ اَرْجُلُهُمْ بِمـا كـانُوا يَعْمَلُـونَ ﴾ لـە ڕۆژێکـا زمـان ودەست وپێکانیان شایەتی ئەدەن لـەسەریان بەشتێ ئەیکەن لـەتاون ولـەبوختان، خـوای مـەزن هەموو ئەندامانی مرۆڤ ئەهێنێتە گفتوگۆ کردن، هەموو ئەندامێ شایەتی ئەدا بەشتێ کردویەتی، جگە لـە ئەندامەکانی شایەتی تر پێویست ناکا بە پێچەوانەی جیهان.

﴿ يَوْمَئِذٍ يُوَفِيْهُمُ اللهُ دِيَنَهُمْ الْحَقَّ وَ يَعْلَمُونَ أنَّ اللهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِيْنُ ﴾ ئەو ڕۆژە خوای مـەزن پاداشتی ڕاستی ودادپەروەری هەمو کەسێ ئەداتەوە بەگوێرەی شایستەی خۆی وبەڕاستی ئەزانن هەر خوای مەزن دادپەروەرە دەستەڵاتی ئاشکرایە، ئەبێ بزانرێ نـاوەڕۆکی ئـەو ئایەتانـە هـەمو کەسێ ئەگرێتەوە بوختان بکەن.

ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟

وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُوا۟ فَٱرْجِعُوا۟ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾

﴿ الْخَبِيْثاتُ لِلْخَبِيْثِيْنَ وَ الْخَبِيْثُونَ لِلْخَبِيْثاتِ وَ الْطَيِّباتُ لِلْطَيِّبِيـنَ وَ الْطَيِّبُـونَ لِلْطَيِّبـاتِ اُولئِـكَ مُبَرَءُونَ مِمّا يَقُولُونَ ﴾ ژنانی بیرو باوەڕ خراپ ونیاز و گفتوگۆو کردەوە خراپ داوێن پیسی بێ ڕەوشتی چاك نەبێ ،شایانی پیاوانی خراپن و،پیاوانی خراپ شایانی ژنانی پیسن،ژنانی پاك شایانی پیاوی پاکن، پیاوانی پاك شایانی ژنانی پاکن،ئەو کەسانە بوختانیـان پێدا کـراوە وەك عائیشـەو سەفوان پاکن ودوورن لەشتێ ئەو بوختانکەرانە ئەیلێن.

﴿ وَلَهُمْ مَّغْفِرَةٌ وَّ رِزْقٌ كَرِيْمٌ ﴾ وە بۆ ئەو کەسە پاکانـە هەیـە لێ خۆشـبونێکی زۆر گـەورە لەلایەن خوای مەزنەوە وەبۆیشیان هەیـە خواردەمـەنێکی بـەڕێز لەبەهەشـتا. زانایـان زۆربـەی زۆریان بەم جۆرەی دوایی مانای ئەو ئایەتەیان کردوە:

گفگتوگۆی خراپو ناشایستە هەر لەئادەمیزادی خراپەوە درەئەچێ، پیاوانی ڕەوشـت خـراپ گفتوگۆی خراپی لێ پەیدا ئەبێ، گفتوگۆی پاك هەر لەپیاوی پاکەوە دەرئەچێ، پیاوانی ڕەوشـت پاك گفتوگۆی پاکیان لێ پەیدا ئەبێ.. هەرچۆنێ مانای ئەو ڕسـتانە بکـرێ پاکـترین و ڕەوشـت پاکترینی ئادەمیزاد بریتیە لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾. کەواتە پێویستە پاکترین وڕەوشت پاکـترینی ژنـی هەبێ و ئەوەی ئەدرێتە پاڵ عائیشە بوختانێکی گەورەبێ.

خوای مەزن چوار کەسی لەخراپە پاك کردوەتەوە: یوسوفی پاك کردەوە بەشایەتێ لەخێزانی زولەیخا، موسای پاك کردوەتەوە لەنەخۆشی لەشی بەهۆی بەردێکەوە جلەکانی موسای برد بـۆ لای جوەکـان موسـا بـەڕووتی ڕای ئـەکرد بـەدوای بەرگەکـەیا. مەریـەمی پـاك کردوەتــەوە بەگفتوگۆی عیسای کوڕی لە بێشـکەدا بـەمناڵی. عائیشـەی پـاك کردوەتـەوە بـەو ئایەتانـەی ڕابوردن کەبریتین لە نزیکەی شازدە ئایەت.

بۆزانـین: عـەبدولاّی کـوڕی عـەباس چـو بـۆلای عائیشـە سەرخۆشـی لیّ بکـا بەبۆنـەی نەخۆشیەوە،عائیشە زۆر ئەترسا لـەخوای مەزن، عەبدولاّفەرموی: تۆ مەترسـە، ناچیتـە خزمـەت خوای مەزن مەگەر بەلیّ چ بوردنی خوای مەزنەوەو بەڕوی گەش وبەخواردەمەنی بـیّ ڕەنجـەوە، ئەو ئایەتەی بەسەردا خویّندەوە، عائیشە لـەخۆشیدا بیّ هۆش کەوت.

عائیشە ئەفەرمویّ: خوای مەزن (٩) شتی بەخشیوە بـەمن بـەهیچ ژنـیّ تـری نـەداوە: (١) جبرەئیل لـەویّنەی مندا هاتوەتە خوارەوەو کاتیّ‌فەرمانی داوە من بخوازیّ. (٢) پیّغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ منی بەکچی خواستوە، جگەی من کچی تـری نـەهیّناوە. (٣) پیّغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ کۆچـی دوایـی کردوە سەری پیرۆزی لەکۆشی مندا بوە.(٤) لـەهۆدەی منـدا نیـژراو لـەگۆڕدا. (٥)جبرەئیل بەسروشەوە هات بۆ خزمەت پیّغەمەرە کاتیّ پیّغەمەر و من لـەژیّر یەك سەرخەردا بووین. (٦)من کچی یەکەمین جیّگەنشین ودۆستی پیّغەمەرم. (٧)پاکی و داویّن پاکی مـن لـەئاسمانـەوە هاتوەتـە خوار. (٨)من بەپاك و ڕەوشت بەرزو دروست کراوی خوای مەزنم، چونکە لـەخزمەت پیاویّکـا بووم ڕەوشت بەرز بوو لای خوای مەزن. (٩) لەلای خوای مەزنەوە بەلّیّن دراوە خواردەمـەنی خۆش و بیّ ڕەنجم پیّ‌دراوە لـەبەهەشتا.

ژنیّ لـەیاریدەرانی پیّغەمەر ﴿ ﷺ﴾ چوە خزمەت پیّغەمەر، ووتی: ئەی نیّرراوی خوای مەزن: من لـە خانوی خۆما وائەبیّ بەجۆریّکم پیّم ناخۆشە هیچ کەسیّ بیّت بۆلام: نـەباوکم ونـەکوڕم، دوایی وائەبیّ باوکم دیّت بۆلام و هەروەها پیاویّ‌تر لـەخیّزانی من و من بەوجۆرەم کەباسم کرد، دوایی من چ شتیّ بکەم؟ دوایی خوای مەزن ئایەتی ( ٢٧ -٢٨) نارده خـوارەوە. دوایـی ئـەبو بەکر فەرموی: ئەی نیّرراوی خوای مەزن: تۆ ئەزانی خانەکان وجیّگە گشتی‌یەکانی ڕیّگەی شام کەسیان تیّدا نیـە، خـوای مـەزن ئایـەتی (٢٩) ی ئـەو سـورەتەی نـارده خـوارەوە. بـۆ ڕوون کردنەوەی ئەو باسانە خوای مەزن ئەفەرمویّ:

﴿ يا أَيُّها الَّذِيْنَ آمَنُـوا لا تَدْخُلُـوا بُيُوتـاً غَـيْرَ بُيُوتِكُـمْ ﴾ ئـەی کەسـانیّکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هیّناوە:ئیّوە مەچنە ناو هیچ خانویّ جگەی خانوی خۆتان کە ئامادەکراوە بۆ دانیشـتنی خۆتـان، خانوی خۆتانبن یاجگەی خۆتان.

﴿ حَتّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلى أَهْلِها ﴾ هەتا ئیّوە داوای چوونە ژورەوە ئەکەن لـەدانیشتوی ئەو خانوە بە گویّرەی دام ودەزگای ئەو شویّنە: وەك لیّدانی دەرگاکـەی بەسـوکی و جـەرەس لیّدان وشتی تر، سلاّو لـەدانیشتوانی ناوی خانوەکـە ئەکـەن، ئەگـەر سـیّ جـار داوای چوونـە ژورەوەتان کردو وەلاّمتان نەدرایەوە، ئیّوە بـەبیّ دلّ ئـازاری بگەڕیّنـەوە، ئەگـەر بیـژرا: تـۆ چ کەسیّکی، مەلیّ منم، ناوی خۆت ونازناوی خۆت بلّیّ.

﴿ ذٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ ئەو دەستور وەرگرتنە بەو جۆرەی باسـکراچاکترە بـۆ ئێوە لەداوا نەکردنتان. دوایی دەستورتان پێدرا چاك و چۆنی لـەگەڵ دانیشتوانا بکـەن، ئـەوەی بێژرا بە ئێوە بۆ ئەوەیە ئێوە ئامۆژگاری وەرگرن وکار بـەو فەرمانـەی ئێمـە بکـەن.پێچەوانـەی رەوشتی کۆمەڵایەتیە چونە ژورەوە بۆناو خانوی جگەی خۆتان بەبی دەستور، دوای دەستوردان واچاکە سلاو لەدانیشتوان و پێویست نیە، ئیتر دانیشتوان خزمتان بن یا بێگانـە، خانوەکـە هـی خۆتانبێ یا بەکرێیان گرتبێ. عەتای کوڕی یەسار پرسیاری لەپێغەمەر کرد:ئایا من داوای چوونە ژورەوە لەدایکم بکەم؟ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵێ. ووتـی:مـن ئەمـەوێ خزمـەتی بکـەم. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: پێت چاکە بەڕووتی ببینی؟ ووتی: نە. پێغەمـەر فـەرمووی: کەواتـە داوای دەستور بکە.

﴿ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَداً فَلا تَدْخُلُوها حَتّى يُؤْذَنَ لَكُمْ ﴾ دوایی ئەگەر کەستان لەناو ئـەو خانوەدا دەست نەکەوت ئێوە سەری لێ بدەن، دوایی ئێـوە مەچنـە نـاوی خانوەکـە هـەتا ئێـوە دەستوری چونە ژوورەوە وەرئەگرن، بونی وێنەی مناڵ نابێتە هۆی چونە ژوورەوە، ئیتر یا بـڕۆن یا چاوەڕوان بکەن هەتا کەسێ پەیدا ئەبێ. ئەگەر شتێکی کوتوپڕی پەیدا بوو: وەك کوژانەوەی ئاگر بۆ فریاکەوتنی کەسێ لەنێو خانوەکەدایە، یا پێویسـت بـوو قەدەغـەی تاوانـێ بکـرێ، یـا لەوەوبەر خاوەنی خانوەکە دەستوری دابێ، لەوکاتانەدا ئەتوانن بچنە ژوورەوەو باکەسـی تێـدا نەبێ.

﴿ وَإِنْ قِيلَ لَكُمْ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا ﴾ وە ئەگەر بەئێوە بێژرا:ئێوە بگەڕێنەوەو مەیەنە ژوورەوە، دوایی ئێوە بگەڕێنەوەو پێتان ناخۆش نەبێ، لەوانەیە ئەوکاتە شیاوی سەردان نەبێ یـا خـەریکی کارێکی تایبەتی خۆیان بن پێویستە ئێوە لەسەری نەڕۆن لەدەرگادا نەوەستن.

﴿ هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَ اللهُ بِما تَعْمَلُونَ عَلِيـمٌ ﴾ ئـەو گەڕانەوەیـە چاکـترە بـۆ ئێـوەو بـەڕێزترە بۆتان،خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ ئێوە بیکەنو پاداشتتان ئەداتەوە، ڕق و کینەتان بۆ پەیدا نەبێ بۆ خاوەن خانوەکان کەدەستوری نەدا بچنە ژوورەوەو بیانوی بۆ هێنانەوە.

بۆ زانین:سـەردان و پرسـیار وئامەشـۆ کردنـی یـەکتری ئەبێتـە هـۆی خۆشەویسـتی لـەنێو ئادەمیزادا. بەتایبەتی ڕۆژانی جەژن و چون بۆ کاروان ولەکاروان هاتنەوە، لەکاتی نەخۆشـیو پرسەداو پێویستە بۆ ئەو چونە ئەو کارانە کاتی شیاویان بۆ دابنرێ، لـەکاتی خـواردن وخـەوتنا نەبێ. پێویستەکە چوونە ژورەوە چاو داخەن وتەماشـای کـەل وپـەلی نـاو خانوەکـەیان نەکـەن بەتایبەتی خێزانەکانیان، ئەگەر خاوەن خانوەکان کاتی تایبەتی بۆ دیاری کردن لەو کاتەدا بڕۆن.

زۆر دامەنیشن بەتایبەتی لای نەخۆش، ئەگەر خاوەن خانوەکە کارێکی وای لێ‌دەرکـەوت هێما بۆ هەڵسان، وەك تەماشاکردنی کاتژمێر پێویستە هەڵسن ، کەچونە ژوورەوەلە جێگەیە دانیشن شایستەی وێنەی ئێوە بێ .

وەك لـەمەوبەر باسکرا:ئەبو بەکر ووتی: ئەی پێغەمەری خوا: تۆ ئەزانی چەند خان وجێگەیە هەن لـەرێگەی شامدا چۆڵن وکەسیان تێدا نیە،ئێمە چ شتێ بکەین؟ خوای مەزن ئـەم ئایەتانـەی ناردە خوارەوە. فەرمووی:

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُناحٌ اَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيْها مَتاعٌ لَكُّمْ ﴾ هیچ گونـاهێ لـەسەر ئێوە نیە کە ئێوە بچنە ناو ئەو خانوانە ئامادەکراون بۆ دانیشتن وپشـوودان، وەك مێـوان خانـەو چاخانەکان و دوکان وچێشتخانە، ئەوانە بۆتـان هەیـە بچنـە ژوورەوە بۆناویـان بـۆ هـەڵگرتنی کەلوپەلتان وبۆ خەوتن وخواردن وخواردنەوە. چونکە هەموو کەسێ دەرگـای خـانوی خـۆی بکاتەوە بۆ چوونـە ژوورەوەی هـەمو کەسـێ پێویسـت نیـە هـەموو کاتـێ دەسـتور وەربگـرێ بەمەرجێ لـەو جێگانەدا شتی نهێنی خاوەن خانوەکانیان تێدا نەبێ، لـەو جێگانەدا کەل وپەلی ئێوە لـەناویانا دانرابێ. بێگومان ئەتوانن بەبێ دەستور بچن بۆلای کەل وپەلی خۆتان.

﴿ وَ اللهُ يَعْلَمُ ما تُبْدونَ وَما تَكْتُمُونَ ﴾ وە خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ ئێوە ئاشکرای ئەکـەن لـەداواکردنی دەستور بۆ چوونە ژورەوەو بەشتێ ئێوە پەنهانی ئەدەن لـەدەروونی خۆتانا وبەشـتێ نیازی ئەکەن. ئەو ڕستانە هەڕەشەی زۆر سەختە بۆ ئەو کەسانە ئەچنە ناو خانوی جگەی خۆیان بەبێ دەستور، ئیتر بۆ هەرشتێ بێ چاکبێ یا خراپ یا بۆ ئەوەی نهێنی خاوەن خانوەکە ببا بۆلای کاربەدەستانی ستەمکار.

قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ

ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾

﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِيْنَ يَغضُوا مِنْ اَبْصارِهِمْ ﴾ تۆ بلّێ بەپیاوانی باوەڕدار چاوی خۆیان قەدەغە بکەن لەتەماشاکردنی کەسانێ ڕەوا نین بۆیان لەژنان کەمارەیان بکەن. هەروەها قەدەغەیە تەماشاکردنی کوڕێکی بێ موو، پێغەمەری خوای مەزن ئەفەرموێ نابێ پیاو تەماشای نێوان ناوك و ئەژنۆی پیاو بکا وژن نابێ تەماشای نێوان ناوك وئەژنۆی ژن بکا پیاو لەگەڵ پیاوی تردا نەخەوێ لەژێر یەك سەرخەردا، ژنێ لەگەڵ ژنی تردا نەخەوێ لەژێر یەك سەرخەردا. ئیتر بابەبێ داوێن پیسیش بێ.

بۆ زانین: زۆرترین لەزانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی دروست نیە پیاو تەماشای ژنانی بێگانە بکا لەجگە لەڕومەت ودەستیان بەمەرجێ بەدڵ پیسی تەماشایان نەکا وترسی‌نەبێ لەدواڕۆژدا تووشی کاری نارەوا ببێ ئەوانەیش بۆ ژنانی موسڵمانە کەلە ئایینی موسڵمانا دەرکەوتن وڕووتی قەدەغەیە. بەلام ژنانی بێ باوەڕ هەندێ لەزانایان ئەڵێن: دروستە تەماشای جگەی ڕومەت و دەستیان بکرێ، تەماشا کردنی مووی ژنانی باوەڕدار دروستە. بەتایبەتی ژنانی لادێ. هەرچۆنێ بێ تەماشاکردن بەنیازی پیسەوە قەدەغەیە بۆلای هەرکەسێ بێ.

﴿ وَيَحفظُوا فُرُوجَهُمْ ذٰلِكَ اَزْكى لَهُمْ اِنَّ اللهَ خَبِيْرٌبِما يَصْنَعُونَ ﴾ وە بەپیاوانی باوەڕداریش بلّێ: شەرمگەی خۆیان بپارێزن لەداوێن پیسی وناموس ورێزی خۆیان نەدۆڕێنن وناموسی جگەی خۆیان نەڕوشێنن،ئەو تەماشا نەکردنەی ژنانی بێگانە و پاراستنی شەرمگەی خۆیان

لەداوێن پیسی ودەست لێ‌نەدانی ژنانی بێگانە چاکترە بۆ ئەوان، چونکـە دوورە لـەئابڕوچون و گومان بردن وپاکترە بۆ پاك بونەوەیان لـەگوناه. بەڕاستی خوای مـەزن ئاگـادارە بەشـتیێ ئـەوان ئەیکەن بەچاو و بەشەرمگەکانتان. خـوای مـەزن تەماشـاکردنی پێشـی داوێـن پیسـی خسـتوە، چونکە تەماشاکردن پۆستەی داوێن پیسی و پێشەکیە بۆی.

﴿ وَقُلْ لِلْمُؤمِناتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصارِهِنَّ ﴾ وە تۆ بلێ بـە ژنـانی بـاوەڕدار، چـاوی خۆیـان قەدەغەبکەن بۆ لای پیاوانی بێگانە کە دروست نیە تەماشاکردنیان، بـەبێ مەبەسـتێکی بـەنرخ، وەك فێرکردنی خوێندن و کڕین وفرۆشتن وشایەتی لـەسەرداں. تەماشـاکردنی ژنـان بـۆ پیـاوان هەروەك تەماشاکردنی پیاوانە بۆ ژنان.

﴿ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ وەتۆ بەژنانی باوەڕداریش بلێ: شەرمگەی خۆیان بپـارێزن لـەداوێن پیسی ناموسی‌خۆیان چلکاوی نەکەن و ڕێزی خۆیان نەدۆڕێنن.

﴿ وَلايُبْدِينَ زِيْنَتَهُنَّ إلا ماظَهَرَ مِنْها ﴾ وە دەرنەخەن جوانی لەشیان وئەو شتانەی خۆیانی پـێ ئەرازێننەوە لـەخشڵ و بەرگ و کل وبۆیە وبازنە وپامورەو گوارەوە خەنەو گەردنەی مل وشـتی تریش بۆ پیاوانی بێگانە مەگەر بەگوێرەی خوڕەوشتی دانیشتوان شتێ بێ دروسـتبێ دەرکـەوتنی لەشی ژنان وەك ڕومەت و دەست وهەردوو پێ لەکاتی کـارکردن وکڕیـن وفرۆشـتن، چونکـە داپۆشینی ئەوشتانە ئەوان تووشی ئازار ئەکەن بەتایبەتی ژنانی هەژار پێویستبێ بچنـە دەرووە بـۆ پەیداکردنی هۆی ژیان یـا بـۆ شـتێ‌بێ زۆر پێویسـتبێ وەك نەشـتەرگەری پزیشـك وچونـە لای پزیشك ، بەمەرجێ نیازیان پیس نەبێ. ئەگەر ئـەو ژنانـە جـوان بـوون مەترسـی لـەدەرکـەوتنی ڕومەت و دەستیان ئەکرا پێویستە دەرنەخرێن. بەڵام ئەندامەکانی تریان وەك سەر و مل وسـنگ و قۆڵ وران و جگەی ئەوان دروست نیە دەرخرێن.

﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُورِهِنَّ عَلى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِيْنَ زِيْنَتُهُنَّ ﴾ وەپێویستە ژنانی بـاوەڕدار سـەر و مل و سنگی خۆیان داپۆشن بەسەرپۆشەکانیان، جوانی وجێگەی جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ ئەم کەسانەی خـوارەوە باسـیان ئـەکرێ، چونکـە پێویسـتە بـەزۆری تێکـەڵاویان بکـرێ و خراپەیان لێ ناوەشێتەوە، ئەوکەسانەیش ئەمانەن کەدروستە ژنان خۆیان دەرخەن بۆیان.

١- ﴿ إلاَ لِبُعُولَتِهِنَّ ﴾ مەگەر بۆ مێردەکانیان دروسـتە خۆیانیـان بـۆ دەرخـەن، ژن و مـێرد بۆیان هەیە تەماشای هەموولـەشی یەکتری بکەن، جگەی لـەشەرمگەی چاك نیە تەماشایان بکەن.

٢- ﴿ أَوْ آبائِهُنَّ ﴾ یا بۆ باوکەکانیان وباپیرەکانیان لـەلایەن باوکەوە بن یا لـەلایەن دایکەوە، وەك باوکی باوك و باوکی دایك هەتا بەرەوژووریش.

٣- ﴿ أَوْ آباءِ بُعُولَتِهِنَّ ﴾ یا بۆ باوك وباپیری مێردەكانیان دایكی بن یا بـاوكی هـەتا بـەرەو ژورتریش .

٤- ﴿ أَوْ أَبْنائِهِنَّ ﴾ یا بۆ كورو كوڕەزاو كچەزا وەك كوڕی كوڕ وكوڕی كچ هەتا بـەرەو خوار بڕۆن.

٥- ﴿ أَوْ أَبْناءِ أَزْواجِهِنَّ ﴾ یا بۆ كوڕی مێردەكانیان هـەتا بـەرەوخوار ئـەڕۆن وەك كـوڕی كوڕو كوڕی كچیان.

٦- ﴿ أَوْ إِخْوانِهِنَّ ﴾ یا بۆ براكانیان ئیتر باوك ودایكی بن یاباوكی یادایكی بن.

٧- ﴿ أَوْ بَنِي إِخْوانِهِنَّ ﴾ یا بۆ كوڕی براكانیان، چونكـە ئـەو ژنـە ئـەبن بـەپوری كـوڕی براكانیان.

٨- ﴿ أَوْ بَنِي إِخْوانِهِنَ﴾ یا بۆ كوڕی خوشكەكانیان، چونكە ئەو ژنە ئەبێ بەپورو خوشكی دایكیان.

٩- ﴿ أَوْ نِسائِهِنَّ ﴾ یا بۆ ژنانی موسڵمان وهاوئایینی خۆیان. بەڵام ژنانی بـێ بـاوەڕ ژنـانی موسڵمان نابێ لـەبەردەم ئەواندا خۆیان ڕوت بكەنەوە، ئەبێ وەك پیاوی بێگانە تەماشایان بكەن، چونكە لـەوانەیە لای پیاوی بێگانە باسی شۆخیان بكرێ وتووشی خراپەیان بكـەن. كارەكـەری ژنان بایاوەڕدار نەبن بۆیان هەیە خۆیانیان بۆ دەربخەن.

١٠- ﴿ أَوْ ما مَلَكَتْ أَيْمانُـهُنَّ ﴾ یـا بـۆ ئـەو كەسـانە ئـەو ژنانـەخاوەنیانن لـەبـەندەكان و كارەكەرەكانیان با بێ باوەڕیش بن. بەڵام بەندەی پیاو بۆی نیە تەماشای ژنە گەورەی خۆی بكا لـەجگەی ڕومەتی ودەستی.

١١- ﴿ أَوِ التّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الأَرْبَةِ مِنَّ الْرِجالِ ﴾ یا بۆ كەسـانێكی ئـەوتۆ پـەیوەندی داری ئادەمیزاد و داوایان ئەكەن بۆ ئەوەی خواردەمـەنیان بدەنـێ وپێویـستیان بـەژن ومـێردی نـەبێ، یالەبەر گێلی وكەم ئەقڵیان یا لـەبەرئەوەی پیروپەككەوتەن بەتەمای ڕابواردنی ژنان نین. پیـاوی خەسێنراو شەرمگەیان زانایان بیروبۆچونیان جیاوازە لەبارەی دەرخستنی بۆ ژنان.

١٢- ﴿ أَوِ الطِفْلَ الَّذِيْنَ لَمْ يَظْـهَرُوا عَلـى عَـوْراتِ النِسّـاءِ ﴾ یـا بـۆ ئـەو منالأنـەی ئـەوتۆ ئاگاداریان بەسەر شەرمگەی ژناندا نیە، شەرمگەی ژنانی جوێ ناكەنــەوە لـەئەندامـەكانی تـری ژنان، چونكە منالْ ونەفامن.

بۆ زانین: مام وخاڵ وەك ئەو پیاوانەن دروستە ژنان خۆیان بـۆ دەرخـەن، هەرچـەندە خـوای مەزن ناوی نەبردوون.

﴿ وَلايَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ ما يُخْفِينَ مِـنْ زِينَتِـهِنَّ ﴾ وەپێویسـتە ژنـان لـەكاتی ڕۆیشـتندا پێكانیان نەدەن بەزەویدا لـەبەرئەوەی بزانرێ بەشتێ ژنان دایانپۆشیون، بەوێنەی دەنگی لولـەی ملیان كەئەدرێ بەسەر كەمەرە پشتیان و خڕەخڕو تەقەتەقی پامورەی قاچیان، چونكە ئەو جۆرە شتانە دژی ئەو شەرمەن ژنان بەوانـەوە جوانـن، پیـاوان ئاگـادر ئەكـەن وئـارەزووی خراپیـان ئەجولێنن، وەك ژنانی ئەم سەردەمەی ئێمە ژنان پێلاوی پاژنە ئاسنین و ڕەق ئەكەنە پێیـان، وەك ئەسپی نالكراو لـەدوورەوە تەقەی ئەبیسرێ.

﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعاً أَيُّها الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ وە ئێوە پەشیمان ببنەوە بۆلای خـوا هەموتان بەژن وپیاوەوە بۆلای خوای مـەزن ئـەی بـاوەڕداران، بۆئـەوەی ئێـوە ڕزگارتـان ببـێ لەگوناهو بەختیاری هەردوو جیهان ببێ بە بەشـتان وخـوای مـەزن لێتـان ڕازی ببـێ، گونـاهی تەماشاكردنی ژنانی بێگانەو ئەو خراپانەی كردوتانە بشۆرێتەوە .

وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾

﴿ وَأنكِحُوا الأَيامي مِنْكُمْ وَالصَّالِحِيْنَ مِنْ عِبادِكُمْ وَإمائُكُمْ ﴾ وە ئێوەی کاربەدەست لەباوك ولەجگەی باوك ژن بهێنن بۆ کوڕەکانتان و بیشدەن بەشوو کچەکانتان: کوڕ بن یا کچ بـن، یـا بێوە پیاو وبێوەژن بن، وەئێوەی گەورەی بەندەکان و کارەکەرەکان ژن بـهێنن بـۆ بـەندەکانتان بدەن بەشوو کارەکەرەکانتان هەرکاتێ شیاوی ژن هێنان وشووکردن بون وئەیان توانی مافی ژن ومێردی جێبەجێ بکەن، ئێوەی سەربەست لەپیاوان و لەژنان تەماشای هەژاری کەسێ مەکـەن لەو پیاوانە خوازبێنیتان لێ ئەکەن.

﴿ إنْ يَكُونُوا فُقَراءَ يُغْنِهُمْ اللهُ وَ اللهُ واسِعٌ عَلِيْمٌ ﴾ ئەگەر ئەو پیاوانە هەژار بن خوای مـەز ن بەگەورەیی خۆی سامانداریان ئەکاو دارایـی دێـت وئـەڕوا ولـەناوئـەچێ، هـەژار ئەوکەسانەن هـەژاری ڕەوشـتی چـاك بـن، خـوای مـەزن چاکـەی فراوانـەو کۆتـایی پێنایـە، ئـەزانێ بەکاروکردەوەی بەندەکانی خۆی: ئەو فەرماندانانەی خوای مەزن بۆ ژنهێنان و ژن خواستن بـۆ پێویست نیە. بەڵکو چاك وایە ئێوە ئەو کارانە بکەن، نەوەك ئێوە تووشی داوێن پیسی ببن.

﴿ وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِيْنَ لايَجْدُونَ يكاحاً حَتّى اللهُ مِنْ فَضْلِهِ ﴾ وەبا کەسـانێکی ئـەوتۆ دەسـتیان ناکەوێ ویاریدەیان نادرێ بۆ ژن هێنان لەمارەیی وبـەخێو کردنـی ژن وپێویسـتی تـر کۆششـی تەواوی خۆی بەکاربهێنێ بۆ پاراستنی خۆی لەداوێن پیسی بـەڕۆژوگرتن وجگـەی ڕۆژوگرتـن هەتا خوای مەزن سامانیان ئەداتێ و ئاواتەکەیان بەجێ ئەهێنێ بەگەورەیی خوای مەزن، ئەوکاتە ئەتوانێ ژن بهێنێ.

پرسیار: خوای مەزن لەئایەتی پێشوودا ئەفەرموێ: ئەگەر هەژار بن خـوای مـەزن سـامانتان ئەداتێ، وائەگەیەنێ لەبەر هەژاری نابێ وازلـە ژنهێنان بهێنن، لـەم ئایەتـەدا ئەفـەرموێ: ئەگـەر داراییتان نەبوو ژن مەهێنن وخۆتان لـە داوێن پیسی دوور خەنەوە، ئـەو دوو فـەرمودەی خـوای مەزن چۆن دژی یەکتری نین؟

وەڵام: دژایەتی لەنێوان ئەو دوو ئایەتەدا نیە، چونکە ئایەتی پێشوو بەرانبەر کاربەدەستانە کە نابێ هەرلـەبەر هەژاری ژن نەخوازن بۆ کوڕەکانیان وکچەکانیان نەدەن بەشوو، ئـەم ئایەتـە بـۆ ئەو کەسانەیە ژنیان نادەنێ لەبەر هەژاری، خوای مەزن بەوان ئەفەرموێ: چاوەڕوانبکـەن هـەتا خوای مەزن سامانتان پێ ئەبەخشێ.

﴿ وَالَّذِيـنَ يَبْتَغُـوا الْكِتـابَ مِمّـا مَلَكَـتْ أيْمـائُكُمْ ﴾ وە کەسـانێکی ئـەوتۆ لەبـەندەکان ولەکارەکەرەکان داوای خۆکڕینەوەیان کرد لەگـەورەکانیان بەشـتێ لەمـەودوا پـەیدا ئەکـەن بەشێوەیەکی ڕەوا بەجۆرێ ئەو بەندەو کارەکەرانە پیشەسازن وئەتوانن کاربکەن.

ووشەی ( کتاب ) لێرە بەمانای ( مکاتەبە )یـانیٚ بـەندەو کارەکـەرەکان خۆیـان ئەکڕنـەوە لەگەورەکانیان بەئەندازەیە دارایی لـەچەند ماوەیەکدا بیدەن بەگەورەکانیان هەتا ئازاد بن. بـەم جۆرە گەورەکانیان ئەڵێن { من موکاتەبەم کرد لەگەڵ تۆ لـەسەر سـەددینار لـەدوو مـانگدا یـا زۆرتر لەدوو مانگ ئەو سەد دینارەم بدەیتێ، هەرمانگەی ئەوەندە دیناربێ، دوایـی تـۆ ئـازادی، بەندەکەیش بڵێ: قبوڵم کرد.دوایی ئەگەر بەرلـەتەواوبوونی ئەو ماوەیە پارەکەی هێنـا پێویسـتە خاوەنەکەی ئازادی بکا. بەڵام هـەتا بدتـەواوی پارەکـە نـەدا بەخاوەنەکـەی ئـازاد نابـێ، ئـەو ڕیکەوتنە لـەنێوانیانا پێی ئەوترێ: موکاتەبە یاکتابەت، چونکە خاوەنـەکانیان پێویستی کـردوە لەسەر خۆی ئەو بەندەیە ئازاد بکا ئەگەر پارەکەی هێنا، ئەگەر بەندەکەی نەیتوانی پارەکـە بـد کیتابەتەکەی پوچ ئەبێتەوە، واچاکە بۆ خاوەنەکانیان دەسـت لـەهـەندێ لـەو پـارە هـەڵگرێ، چونکە ئاینی ئیسلام ئازادکردنی بەندەی زۆر پێ خۆشە. خاوەنەکانیان ناتوانن پەشیمان ببنـەوە، دوای ئەوەی بەندەکان داوای موکاتەبەیان کرد خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً ﴾ دوایی واچاکە ئێوە موکاتەبە بکـەن لـەگـەڵیان ئەگـەر ئێوە ئەتانزانی لـەو بەندانەدا توانای پەیداکردنی ئەو پارەیانە هەیـە وچاکـەی ئـایینی بـەندەکانی تێدایەو دەست پاکن.

﴿ وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللهِ الَّذِي آتَاكُمْ ﴾ وە ئێوەی موسڵمان پێویسـتە ببەخشـن بـەو بەندانـە هەندێ لـەو داراییە خوای مەزنبەخشیویە بە ئێوە، هەتا بتوانن بەوبۆنەوە خۆیان ئازاد بکـەن لـە کۆیلایەتی، چونکە ئەو بەندانە یەکێکن لـەوهەشت تاقمە زەکاتیان پێئەدرێ. هەندێ لـە زانایـان ئەڵێن: مەبەست لـەو کەسانە خوای مـەزن فـەرمانیان پـێ ئـەدا هـەندێ دارایـی بـدەن بـەوان خاوەنەکانیانە، یانێ دەست هەڵبگرن لـەهەندێ لـەپارەی کیتابەتەکە.

﴿ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنـاً لِتَبْتَغُوا عَـرَضَ الْحَيَـاةِ الدُّنْيـا ﴾ وە ئێـوەی خاوەن کۆیلە زۆر مەکەن لـەکارەکەرە تازە پێگەیشتوەکانتان لـەسەر کردنی داوێن پیسی ئەگەر ئەو کارەکەرانە ئەیان ویست دووربن لـەداوێن پیسی وکردنی گونـاە، لـەبەرئـەوەی ئێـوە پـەیدا بکەن داراییەکی کەمی جیهان وشتێکی بێنرخ و بێ بەردەوام.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبوو: عەبدولای کوڕی ئوبـەی سـەرۆکی دووڕوەکـان دوو کارەکەری هەبوو زۆری لێ ئەکردن داوێن پیسی بکەن بەپارەو بیدەن بەو، ئەوانیش نـەیان ئەویست داوێن پیسیـت بکەن خوای مەزن ئەوکارەی قەدەغەکرد.

پرسیار: خوای مەزن ئەفەرموێ: زۆر لـەکارەکەرەکانتان مەمەن لـەسـەر داوێـن پیسـیئەگەر ئەیان ویست خۆیان بپارێزن لـەداوێن پیسی، ئەوەیش ئەمە ئەگەیەنێ ئەگەر ویستیان داوێن پیسی بکەن بابیکەن کەچی داوێن پیسی قەدەغەیە بەهەموو جۆری بیانەوێ بیکەن بەئارەزووی خۆیـان یان نەیانەوی؟

وەلاّم: ئەو ئایەتە هۆی هاتنە خوارەوەکەی زۆر کردنە لـەوان لـەسەر داوێن پیسی، مەرج نیە ئەوان بیانەوێ بیکەن، خۆ ئەگەر بیانەوی بیکەن زۆرکردن دەوری نیـە، داوێـن پیسـی ئەکـەن بەبی زۆر لیٚ‌کردن.

﴿ وَمَـنْ يُكْرِهْـنَّ فَـإِنَّ اللهَ مِـنْ بَعْـدِ إِكْراهِــهِنَّ غَفُــورٌ رَّحِيْــمٌ ﴾ وەهەرکەســێ زۆر بکــا لـەکارەکەرەکانی خۆی لـەسەرکردنی داوێن پیسی، دوایی خوای مەزن لـەدوای ئەو زۆرکردنەی خاوەنەکانیان لـەوان لـەکارەکەرەکان خۆش ئەبێ میهرەبانە بۆ ئەوان، سزای خوای مەزن لـەسەر زۆر لیٚ کراو نیەو لـەسەر زۆرلیٚ‌کەرەکانە دووای مردن.

﴿ وَلَقَدْ أَنْزَلْنا إِلَيْكُمْ آياتٍ مُّبَيِّناتٍ وَّمَثَلاً مِنَّ الَّذِيْــنَ خَلَـوا مِـنْ قَبْلِكُـمْ وَ مَوْعِظَـةً لِلْمُتَّقِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆ ئێوە چەندین ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز لـەم سـورەتەدا ڕونی کردوەتەوە بۆ ئێوە فەرمان ویاساو دەستور وڕەوشــتی بـەرز و شـتی تریـش، ناردومانەتـە خوارەوە بۆلاتان وێنەو چیرۆك ودەنگ وباسی کەسانێکی ئـەوتۆ ڕۆیشـتبوون لـە پێـش ئێـوەۆ، ئـەوانیش وێنـەی دەنـگ وبـاس وبەسەرهاتیعائیشـەن، وەك بەسـەرهاتی یوسـوف وزولــەیخا، بەسەرهاتی مەریەمەی داوێن پاك، عائیشەو مەریەم هەردووکیان داوێن پـاکن ودوورن لـەخراپـە لـەگەڵ کەمێ جیاوازی نێوانیان: عائیشە مێردی هەبوو منالٚیشی نەبو، مەریەم منالٚی هەبوو بـەبێ مێرد بەهۆی فەرمانی خوای مەزنەوەو، ناردومانەتە خوارەوە لـەوئایەتانەدا ئامۆژگاری کردن بـۆ کەسانێکی ئەوتۆ لـەخوا ئەترسن وئامۆژگاری وەرئەگرن وسوودی لیٚ وەرئەگرن.

ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ

وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾

﴿ اللهُ نُورُ السَّماواتِ وَالأَرْضِ ﴾ خـوای مـەزن خـاوەنی ڕوونـاکی ئاسمانـەکان وزەوییـە، بەوڕوناکیە ئاسمانـەکان وزەوی ڕونـاك ئەکاتـەوەو هـەر بـەو ڕوناکیە ڕێگـەی ڕاسـت نیشـان ئەدابەهەرکەسێ ئارەزووی هەبێ لـەم گەردونەدا، بەڕێوە ئەبا کاروباری بونـەوەران بەئەوپـەڕی زانستەوە بەبەڵگەیەکی ڕونەوە، لەبەر ئەوپەڕی زۆری ئەو ڕوناکیە هەمو بونەوەرانی پـێ ڕوون ئەبێتەوە، کاروباری بونەوەران بەڕێکی ئەڕاو بەڕێوە. دوایی ئەقڵی ئادەمیزاد تروسکەیە کە لـەو ڕوناکیە، زانست وزانیاری ئامانجێکی بچوکی ئەو ڕوناکیەن، ئە وڕوناکیە بریتیـە لـە گـەورەیی وتواناو زانستی خوای مەزن، لەدروست کردنی بونەوەراندا ئەو گەورەییە دەرئەکەوێ، دوایـی هەمو شتێ لەئاسمانەکان وزەویدا بەڵگەی ئاشکراو ڕونن لەسەر بوونی خوای مەزن و گەورەیی خوا.

هەرچەندە ئەقڵی ئادەمیزاد لەتوانایا نیە بونـی خـواو کارەکـانی وەك شـێوەیە لەشـێوەکانی بونەوەراندا دانێ. بەڵام ئەگەر خـوای مـەزن بیـەوێ کـارێکی بـەوجۆرە بفـەرموێ، بـەجۆرێ ئەیفەرموێ نزیکبێ ئەقڵی ئادەمیزاد بیزانێ ولێی تێبگا، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشكاةٍ فِيْها مِصْباحٌ ﴾ وێنەی ئـەو ڕوناکیـە خـوای مـەزن دروسـتی کـردوە بەوێنەی ڕوناکیەکە ئەوپەڕی زانیاری وتوانای ئەقڵی ئادەمیزاد پێی ناگـا، وێنـەی ئـەو ڕوناکیـە بەوێنەی ڕوناکی چرایەکە دانرابێ لەناو تاقێکی دیوارێکا ئەو تاقە پێنـج لای گیرابێ وڕونـاکی چراکە هەمووی لەناویا کۆ بوبێتەوەو باو هەوا لێی نەدا.

﴿ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ ﴾ ئەو چرایە لەناو چرادانێکـی شوشـەی پاك وبێ گەرد و لەگەوهەرێکی نایاب دروسـت کرابێ لەپشـتیەوەو لەپێشـیەوە هـەموو شـتێ بینرێ، ئەو شوشەیە لەڕوناکیدا بەوێنەی ئەستێرەیەکە ڕوناکی ئەو ئەستێرەیە هەر ئەستێرەیە بـێ مەبەستەکە ناگۆڕێ.

﴿ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ ﴾ ئـەو چرایـە ڕوونـاکی وەریگـرێ ودابگیرسێنرێ بەڕۆنی درەختێکی پیرۆزی پڕ لە پیت و خاوەن سوود، شەوچیرەو ڕۆنی چێشتەو سوتەمەنیە، ئەو درەختە بریتیەلە لەدرەختی زەیتون، ئەڕوێ لەجێگەیەکا تیشکی خۆر بەدرێژایی ڕۆژ ئەکەوێتە سەری، هیچ شتێ تیشکی خۆری لێ ناگرێ، بەوێنەی درەختێکە بەسەر بەرزترینی کێوێکەوە بێ یا لەدەشتێکا بێ، دوایی بەرهەمی ئـەو درەختـە تـەڕو تازەیـە، ڕۆنەکەیشـی پـاك وخاوێن وپالفتەیە،نەلەلای خۆرهەلاتەوەیە هەتا لەکاتی هەلهاتنی خۆردا تیشکی خۆر لێـی بـدا ونە لەلای خۆرئاواوەیە دوای نیوەڕۆ تیشکی خۆر لێی بدا.بەلکو هەموو کاتێ تیشکی خۆر لێـی ئەدا.

﴿ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ﴾ ڕۆنـی ئـەو درەختـە ئـەوەندە ڕوناکیەکـە زۆرو بەهێز بوو نزیکبو خۆی لەخۆیا بەتەنها ڕوناکی بلاو بکردایەتەوە، بەبێ ئەوەی ئاگر تووشی ببێ، خۆ ئەگەر بەئاگر دابگیرسێنرێ ڕوناکیەکەی زۆرتر ئەبوو.

بۆزانین: بەهۆی کۆکردنەوەی ئەو تاقە بۆ ڕووناکی، بەهۆی ئەو شوشـەوە ڕونـاکی چراکـە بەهێزتر و زۆرتر ئەبی. بەبۆنەی ئەو چرایە هەلگیرساوە بەو ڕۆنـە پاکـەوە ڕوونـاکی دوچەنانـە زۆرتر ئەبێ. ئەگەر ئەو تاقە نەبێ ڕووناکی چراکـە بەهـەر شـەش لادا بـلاو ئەبێتـەوە، ئەگـەر ڕۆنەکەنەبێت ڕووناکی کەمتر ئەبێ یا هەر نایشـبێ، ئەگـەر شوشـەکە نـەبێ ڕونـاکی دووپـات نابێتەوە، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ نُورٌ عَلَى نُورٍ ﴾ ئەو ڕوناکیە ڕوناکی لەسەر ڕوناکیە: ڕوناکی چراکە، ڕوناکی شوشـەی بێگەرد. ڕوناکی ڕۆنی پاك . بەکورتی ئەو چرایە ڕوناکی زۆرتر ئـەدا لەبـەر پـاکی ئـەو ڕۆنـە، شوشەو تاقەکەیش ڕوناکی زۆرتر کۆئەکەنەوە، ئەپارێزرێن لەباو شتی تر.

﴿ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ ﴾ خوای مەزن هەرکەسێ ئـارەزۆی بکـا لـە بـەندەکانی خـۆی شارەزای ئەکا بۆلای ڕوناکی خۆی کەبریتیە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، یاریدەی ئەدا بـۆ پێکـانی ڕێگای ڕاست بەهۆی بەلگەی بێگومانەوە.

﴿ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ وەخوای مەزن هەمو شتێ ڕون ئەکاتەوە بۆ ئادەمیزاد بەهۆی وێنەکانەوە هەتا باشتر تێبگەن و باوەڕبهێنن و، خوای مـەزن بەهـەمو شـتێ ئەزانێ لە ئاشکراو لەنهێنی.

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللهُ أَنْ تُرْفَعَ ﴾ لەبەر پەرستنی خواو لەبەر ڕەزایـەتی خـوای مـەزن چـەند پیاوێ نوێژ ئەکەن لەچەند مزگەوت و چەند خانویەکا، خوای مەزن دەستوری داوە ڕێزی ئـەو مزگەوتانە بگیرێ و پاك بکرێنەوە لە چڵك و پیسیو لەگفتوگۆی بێسودو لەهەمو شتێ ئازاری ئەو کەسانە ئەدا بەنوێژکردن ئاوەدانیان ئەکەنەوە. کەواتە واچاکە هەرکەسێ سیرو پیازو تـوری خوارد نەچێتە ناو ئەو مزگەوتانە، هەتا نوێژکـەران و دانیشـتوانی نـاو ئـەو مزگەوتانـە بـەبۆنی پیسیان توشی ئازار نەبن.

﴿ وَيُذْكَرُ فِيهَا اسْمُهُ﴾ وە خوای مەزن دەستوری داوە بەباوەڕداران و بەنوێژکەران کەلـەناو ئەو مزگەوتانەدا یادی خوای مەزن بکرێ بەخوێندنی قورئـان و گفتوگۆکـردن لـەفـەرمودەکانی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ، نوێژکردن لـەوانا.

﴿ يُسَبِّحُ لَهُ فِيها بِالْغُدُوِ وَالآصالِ رِجالٌ لاتُلْهِيهِمْ تِجارَةٌ وَّلابَيْعٌ عَنْ ذِكْرِاللهِ﴾ نوێژئەکەن لـەبەر ڕەزایەت و فەرمانی خوای مەزن چەند پیاوێ لەناو ئەو مزگەوتانەدا لـەسەرەتای بەیانیدا نوێـژی بەیانی ئەکەن و لـەدوای نیوەڕۆیش نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشا ئەکەن، بازرگـانیو مامەڵەو کڕین و فرۆشتن ئەو پیاوانە خەریك ناکا لـەیادی خوای مەزن و لـەپەرستنی ئەو.

﴿ وَإِقامِ الصَّلاةِ وَإِيْتاءَ الزَّكاةِ يُخافُونَ يَومـاً تَتَقَلَّـبُ فِيْـهِ الْقُلُـوبُ وَالأَبْصـارُ ﴾ وبازرگـانیو مامەڵە ئەو پیاوانە خەریك و بێئاگا ناکا لـەبەرپاکردنی نوێژەکان و لـەبەخشینی زەکاتەکانیان بە هەژاران، بەگوێرەی دەستوری خوای مەزن بەجێیان ئەهێنن بەگورجیو تەمەڵییو سستی تیایانـا ناکەن، بەدڵخۆشیو بەبێ دوڕوی نوێژو زەکاتەکانیان بەرپا ئەکەن، ئەو پیاوانە ئەترسن لـەسام و لـەگرانی وەستان لـەو ڕۆژەدا، لـەو ڕۆژەدا دڵیان دەست ئەکا بــە جـم و جـۆڵو تەپـە تـەپ و چاوەکانیان لـەترسانا هیچ شتێ نابینن، هەرچەندە ئەوپەڕی خۆپارێزبوون لـــەبێ فـەرمانی خـوای مەزن و ئەوپەڕێ خوا پەرست بوون.

﴿ لِيُجْزِيَهُمُ اللهُ أَحْسَنَ ماعَمِلُوا وَيَزِيدُهُمْ مِنْ فَضْلِهِ ﴾ ئەو پیاوانە ئەو کارە چاکانە ئەکــەن و لـەخوا ئەترسن لـەبەرئەوەی خوای مەزن پاداشتیان بداتەوە بە شیرینترین پاداشـت لـەسـەر شتێ کردویانەو کەم ناکرێتەوە بـەڵکو بـۆ ئـەوانی زۆرتـر ئـەکا خـوای مـەزن پاداشـتەکانی ئـەوان بەگەورەیی خۆی، بەجۆرێ بەدڵی هیچ کەسێکا نایە ئەوەندە پاداشتەکانیان زۆرە.

﴿ وَاللهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشاءُ بِغَيْرِ حِسابٍ ﴾ وەخـوای مـەزن بـەتواناو ویسـتی خـۆی پاداشـت و ڕۆزی ئەدا بەکەسێ ئارەزوی هەبێ لـەبەندەکانی خۆی بەبێ ژمارە، بەجۆرێ بونەوەران نـاتوانن بیان ژمێرن لـەبەر زۆری ئەو پاداشتە، بەبێ پرسیار لـەهەردو جیهاندا ڕائەبوێرن.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٢﴾

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أعْمالُهُم كَسَرابٍ بِقِيعَةٍ ﴾ وەکەسانێکی ئوتـۆ باوەڕیـان نـەهێناوە کردەوەکانیان وێنەی تیشکی خـۆر وایـە بـلاو ئەبێتـەوە لەدەشـتێکی پـان و فراوانـدا لـەکاتی گەرمای نیوەڕۆدا ئەبینرێ.

﴿ يُحْسَبُهُ الظَّمآنُ ماءَ حَتى إذا جاءَهُ لَمْ يَجِدهُ شيئاً ﴾ ئادەمیزادی تینو گومان ئەبا ئـاوە هـەتا کاتێ ئەو مرۆڤە ئەگاتە لای ئەوشتە ئەو کەسە ئەو شتەی دەست ناکەوێ بەهیچ جۆرێ مەگەر تیشکی خۆرەو تینویی ئەو ناشکێنێ بگرە زۆرتـری ئـەکا، ئـەو فـەرمودەی خـوا بەتایبـەتی ئـەو کەسانە ناگرێتەوە کەبێ باوەڕن، زۆر کەس هەن لـەناو موسوڵماناندا خۆیان بـەپیاوچاك ئەدەنـە بەرچاو دانیشتوان کەچی لەناوەڕۆکدا بەو شێوەیەنین. بەڕاستی بێ باوەڕان هەرچەندە بەگومانی خۆیان وائەزانن کردەوەکانیان سودیان پێ ئەگەیەنێ. بەڵام لـەناوەڕۆکا ئەبێتە هۆی ئازاردانیان.

ئەو ئایەتانە لـەوەوە هاتوەتە خوارەوە بێ باوەڕان ئاویان ئەدا بەحاجیەکان و خزمەتی خانـەی خوایان ئەکردو نانیان ئەدا بە میوان و سەریان ئەدا لـەخزمان و دەست گیرۆییان ئەکردن. بـەلاّم لـەگەڵ بێباوەڕیدا لای خوای مەزن بێسودە .

﴿ وَوَجَدَ اللهَ عِنْدَهُ فَوَفاهُ حِسابَهُ وَاللهُ سَرِيْعُ الحِساب ﴾ وەکاتێ ئـەو کەسـە مـردو لـەڕۆژی دواییدا چوە خزمەت خوای مەزن پاداشتی کردەوە چاکەکانی دەست ناکـەوێ، دوایـی خـوای مەزن پاداشتی کارەکەی خۆی ئەداتێ بەتەواوی، پرسیاری ئـەو بێبـاوەڕیو بێفـەرمانی خـوای لێئەکا، بۆی دەرئەکەوێ ئەو کارە چاکانەی لـەبەر ڕەزایەتی خوا نەکردوە.

خوای مەزن پاداشت دانەوەی زۆر بەگورجی ئەڕواو هیچ پرسـیارێ خـوای مـەزن خـەریك ناکا بۆ پرسیاریتر. یانی بێباوەڕان بڕوایان وایـە کاتـێ لـەجیـهاندان بڕوایـان وایـە ئـەو کـارە چاکانەیان ڕزگاریان ئەکا. بەلاّم کاتێ لـەخزمەت خوای مەزندا ئەوەستن بۆ پرسـیارو ولاّم هیـچ شتێکیان دەست ناکەوێ لـەو شتانە گومانیان بۆ ئەبرد. بەڵکو گوناهو تاوان و پرسیارو سـزایان دەست ئەکەوێ، دوایی بێ ئومێد ئەبن، بەوێنەی ئەوەی بێ ئومێد بون کەوایان ئـەزانی تیشـکی خۆر ئاوە.

﴿ أَوْ كَظُلُماتٍ فِي بَحْرٍ لُجِيٍّ يغْشاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحابٌ ﴾ یاکردەوەی ئـەو بێ باوەڕانە لـەبەرئەوە پوچ وبۆشـە لـەڕوناکی ڕاسـتی بەوێنـەی چـەند تاریکیـە کـە نیشـتوەتە سەریەکتری لـەدەریایەکی زۆر قوڵدا ئەو دەریایە دائەپۆشێ شەپۆلی ئاو لـەسەرەوەی ئەو شـەپۆڵی تر هەبێ لـەسەر ئەو شەپۆلـەیشەوە هەورێ هەبێ بەری ڕوناکی خۆریان گرتوە، دوایی پەیدا ئەبێ لـەوانەوە چەند تاریکیە کۆبونەتەوە لـەسەریەك: تاریکی دەریا، تاریکی شـەپۆلی یەکـەم. تـاریکی شەپۆلی تر. تاریکی هەور.

﴿ ظُلُماتٌ بَعْضُها فَوْقَ بَعْضٍ إذا أخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكد يَراهـا ﴾ چـەند تاریکیـەکن هـەندێکیان لـەژوور هەندێکی تریانەوە بەجۆرێ ئەگەر کەسێ گیرۆدەی ئـەو تاریکیانـە ببـێ هـەرکاتێ ئـەو کەسە دەستی خۆی دەربهێنێ نزیك نیە دەستی خۆی ببینێ یاهەر نای بینێ مەگەر زۆر خۆی بـۆ ماندو بکا. ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە بەهێزترین وێنەیە بۆ ئـەو کەسـانە لـەدەریای خراپـەی خۆیـان خنکاون: درۆکردن، دووڕوویی، دڵپیسی، لـەخۆبایی‌بون، خـۆ بەگـەورە دانـان، چـاوچنۆکی، بەتەمای درێژی تەمەن، هەروەها بڕوای. کەسـێ بـەوجۆرە بـێ ڕاسـتی نازانـێ وبـیر لـەڕاسـتی ناکاتەوە.

﴿ وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللهُ لَهُ نُوراً فَما لَهُ مِنْ نُور ﴾ وەهەرکەسێ خوای مەزن شارەزایی وڕونـاکی بۆ دانەنابێ لـەجیهاندا بۆ دۆزینەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دوایی بـۆ ئـەو کەسـانە نابێ هیـچ ڕوناکیە لـەپاشەڕۆژدا.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّماواتِ وَ الأَرْضِ ﴾ ئایا تـۆ و هـەموو ئادەمـیزاد نـەتان زانیوە بەڕاستی کەسێ لە ئاسمانەکان وزەویدان لەفریشتە وئادەمیزادو جنۆکە خـوای مـەز پـاك ئەکەنەوە لـەشتێ شایستەی خوای مەزن و کردارەکانی خوای مەزن نـەبن، هـەموو شـێوەیەکی گەورەیی بۆ دائەنێن یا بەزمانی خۆیان یابەبەڵگەی ڕون وئاشکرا.

﴿ وَالطَّيْرُ صافاتٍ ﴾ وەبەڵگەیە لەسەر تەواوی توانای خوای مەزن ئـەو باڵدارانـە لـەکاتی فڕینیانا باڵی خۆیان ڕائەکێشن بەهۆی تواناو زانستی خوای مەزنـەوە هـەتا نەکەوێتـە خـوارەوە بۆسەر زەوی، دوایی خوای مەزن ئێسکی بـاڵندەی بەبۆشـی دروسـت کـردوە هـەتا سـوکبێ، کلکیشی بۆ دروست کردون بەجۆرێ بەئارەزووی خۆیان ڕوبکەن بۆ هەرلایە ئارەزوویان هەبێ بەوێنەی سوکانی ماشین و فڕۆکەو کەشتی.

﴿ قَدْ عَلِمَ كُلٌّ صَلاتَـهُ وَتَسْبِيْحَهُ وَاللهُ عَلِيْـمٌ بِمـا تَفْعَلُـونَ ﴾ بەڕاسـتی هـەموو یـەکێ لـەو بونەوەرانە ئەزانێ بەشتێ پەیدا ئەبێ، لەوانەوە لەپارانـەوەو پـاکی دەربڕیـن بـۆ خـوای مـەزن، بەجۆری ئێمە نایزانین وهەر خوای مـەزن ئـەیزانێ و بونـەوەران ئـەزانن چـۆن خۆیـان بپـارێزن لەکارەساتی ناهەموارو، خوا ئەزانێ بەشتێ لەمەودوا بونەوەران ئەیکەن.

﴿ وَ للهِ مُلْـكُ السَّـماواتِ وَالأَرْضِ وَ إِلَى اللهِ المَصِيْرُ ﴾ وەهـەر بـۆ خوای مەزنـە پاشـایەتی وخاوەنیەتی ئاسمانەکان وزەوی وهەر خوای مەزن هەڵیان ئەسوڕێنێ و، هەر بۆلای خوای مەزنـە گەڕانەوەی هەموو بونەوەران لەڕۆژی دواییدا.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٤﴾

وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَٱللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٦﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ﴾ ئایا تۆ نـەتزانیوه کـه بەڕاستی خـوای مـەزن ئەخورێتە هەور بەنەرمی و لـەسەرخۆ بەهۆی باوە ئەڕوا بۆلای هەرجێگەیە خوای مـەزن بیـەوێ بەپارچەپارچەی، لـەپاشا کۆیان ئەکاتەوەو ئەیان نوسێنێ بەیەکەوەو ئەیانکا بەیەك پارچە.

﴿ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكاماً فَتَرى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ ﴾ لـەپاشا خوای مـەزن ئـەو هـەورە ئـەکا بەکۆمەڵێکی چڕوپڕ هەندێکیان لـەسەر هەندی تریانەوەو، ئەیانباو ئەیان بەستێ بەیەکەوە، دوایی تۆ ئەبینی دێتە خوارەوە لـەناو ئەو هەورەی ئاسمانەوە باران لـەبۆشاییەکانیانەوە.

﴿ وَيُنَزِلُ مِنَ السَّماءِ مِنْ جِبالٍ فِيها مِنْ بَرَدٍ ﴾ وەخوای مـەزن ئەنێرێتـە خـوارەوە لەهـەوری ئاسمانەوە لـەچەند پارچەیەکی گەورەی ئەوتۆی بەوێنەی کێـو وان لـەگـەورەییدا لـەناو ئاسمـاندا ئاوی ئەیبەستێ ورەق ئەبێ وناو ئەبرێ بەتەرزە هەندێکیان گەورەن هەندێکیان بچووکن.

بۆزانین: تەم بەهۆی گەرمایی تیشـکی خـۆرەوە لـەزەریاو دەریـاو ڕوبـارو کێوەکـان بـەرز ئەبێتەوە ئەبێ بەهەور کاتێ گەیشتە جێگەیە سارد ئەبێ بەباران دڵۆپ دڵۆپ ئەڕژێتە خـوارەوە، دوایی ئەگەر ساردیەکەی هەوا زۆربو لـەوەی پێشوو ئەبێ بەتەرزەو ئەکەوێتە خوارەوە، ئەگـەر ساردی هەوا زۆرتربو ئەبێ بەبەفر و بەووردی و بەپانی ئەکەوێتە خوارەوە.

﴿ فَيُصِيبُ مَنْ يَشاءُ وَيصْرِفُهُ عَمَّنْ يَشاءُ ﴾ دوایی خوای مەزن بـەهۆی ئـەو تـەرزەوە ئـازار تووشی کەسێ ئـەکا ئـارەزوی هـەبێ، بەوبۆنـەوە زەویـەکانیان تووشی کـەم بەرهـەمی ئـەبن ودانیشتوان ئازاریان پێ‌ئەگاو ، خـوای مـەزن ئـەو تەرزەیـە لائـەدا لـەکەسـێ ئـارەزوی هـەبێ وئازاریان توش نابێ وزەویەکەی بەرهەمی باش ئەڕەخسێنێ وهەرزانی پەیدا ئەبێ. هەروەك تەرزە وائەبێ خوای مەزن ئەیکا بەهۆی لـەناوچوونی دارایی و شینایی ئادەمیزاد، وائەبێ ئەیکا بـەهۆی هەرزانی وخۆشی بۆیان، هەروایش بەفرو بارانیش وائەبی ئەبنە هۆی زیان بۆ ئـادەمیزاد ووایـش ئەبێ ئەبنە هۆی خۆشی و بێ ئازاری بۆیان.

﴿ يَكادُ سَنا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالأَبْصار ﴾ نزیکە ڕووناکی ئەو هـەورە چاوەکـان نەیـەڵێ لـەبـەر زۆری ڕوناکی و بروسکەو چەخماخەی ئەو هەورەوە.

﴿ يُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهارَ إِنَّ فِي ذلِكَ لَعِبْرَةً لأُولِى الأَبْصار ﴾ خـوای مـەزن شـەو وڕۆژ بـەڕێوە ئەباو ئەیانهێنێ بەدوای یەکا لـەسەر پەیڕەو و پرۆگرامێکی تایبــەتی وا ئـەبێ هـەندێکیان لـەوی تریان زۆر ئەبێ یا کەمتر. بەڕاستی هەیە لـەهاوردن وبردنی هەورو ڕژاندانی باران و تەرزەو بەفر بەو جۆرە باسکران، گۆڕانی شەو ڕۆژ بەکەم بون وزۆر،ڕوناکی زۆری بروسکەو چەخماخە تەمی کردن بۆ ئەو کەسانەی خاوەنی ئەقڵ وبیرکردنەوەن بەڵگەی ڕون وئاشکران لـەسەر بونی توانای زۆر و بێ وێنەی خوای مەزن ودانانی هەمو شتێ لـەجێگەی شیاوی خۆیانا.

﴿ وَاللّهُ خَلَقَ كُلَّ دابَةٍ مِنْ مّاءٍ ﴾ وەخوای مەزن دروستی کـردوە لــەئاو هەمووشـتێ ئـەڕوا بەسەر زەویدا لـەئاو جگەی فریشتە و جنۆکە، هەندێکیان لـەخۆڵی شێلراوە بەئاو، هەندێ تریان لـەدڵۆپێ ئاو، ئیتر ئەو ئاوە تۆمی نێرە بێ یانە؟ چونکە زینەوەری وا هەیە لـەتۆمی نێرە پەیدا نابێ. بەڵام خوای مەزن ڕاستەو خۆ لـەئاو دروستی ئەکا، خـــوای مـەزن جنۆکـەی لــەئاگر دروسـت کردوە، فریشتە لـەڕوناکی. ناوبردنی ( داتە ) بۆ وێنەیـــە، ئـەگینا خـوای مـەزن زۆر شـتی وای دروست کردوە لـەئاو نایەنە ژمـارە، وەك درەخـت و ڕووەك و بـەردو خـاك و بونـەوەرانی تـر کەهەمویان دروست کراوی خوای مەزنن لـەوانەیە هەموویان لـەئاو دروست کرابن.

﴿ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلى بَطْنِهِ وَمِنْهُمْ مَّنْ يَمّشِي عَلى رجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ يَمْشِي عَلى أرْبَعِ ﴾ دوایی هەرچەندە ڕەگەزێکی سەرەکی بۆ دروست بوونی هەمو شتێ ئەڕوا بەســەر زەویـدا و ئـاو یـەك سروشتی هەیە لـەگەڵ ئەوەیشدا ئەو شتانەی لـەئاو دروست کراون چەندین شتی جۆراوجۆرن.

هەندی لـەو گیانادارانە لـەسەر ورگیان ئەڕۆن بەڕێوە، وەك ماسی و مارو کرم، هەیانە ئـەڕوا بەڕێوە لـەسەر دووپێ، وەك ئادەمیزاد وبالندە، هەیانە ئەچن بەڕێوە لـەسەر چوارشت لـەدوو پـێ ودوو دەست وەك بەسەزمانانی ترو دوڕندەکان.

﴿ يَخْلُقُ اللهُ مايَشاءُ إِنَّ اللهَ عَلى كُلِ شَيءٍ قَدْيرٌ ﴾ وەخوای مەزن دروست ئــەکا هـەر شـتێ ئارەزووی بکا لـەهەندێ گیانادران ئــەڕۆن بـەڕێوە زۆرتـر لــەچوار پـێ، وەك جۆڵایـی کـەرە وقرژانگ و هەزار پێ، بەڕاستی خوای مەزن دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شـتێکا لـەبونـەوەران وگیـانداران لــەخوارەوە هـەتا سـەرەوە، ئـەیان بـا بـەڕێوە بەتـەواوترین پـەیڕەو و پرۆگــرام، هەریەکەیان بەجۆرێ بگونجێ لـەگەڵ سودیان.

﴿ لَقَدْ أَنْزَلْنــا آيـاتٍ مُبَيِّنــاتٍ وَاللّهُ يَـهدِي مَـنْ يَشـاءُ إِلى صِـراطٍ مُسّتَقِيْم ﴾ بەڕاسـتی ئێمـە ناردومانەتە خوارەوە چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکرا، ڕونی کردوەتەوە فەرمان ویاسای پێویستی بۆ ئادەمیزاد، بەڵگەیشن لـەسەر یەکێتی خواو، خوای مەزن شارەزایی هەرکەسێ ئەکا ئـارەزوی

هەبی بۆلای ڕێگەی ڕاست کە ئایینی پیرۆزی ئیسـلامە، ئـەقڵی داوە بـەئادەمیزاد لـەو بەڵگـە ئاشکرای قورئانی پیرۆز بیر بکەنەوە هەتا ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە.

دانیشتوانی سەردەمی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ سێ تاقم بـون: (١) دووڕوەکـان بـەدەم وبەئاشـکرا باوەڕیان هێنابوو، لەدڵدا بەنهێنی بێباوەڕ بوون. (٢)بـاوەڕداران بەئاشـکراو بەنـهێنی خـاوەنی باوەڕ بون. (٣)تاقمێ تریان بەئاشـکراو بەنـهێنی بـێ بـاوەڕبوون.بەرێکـەوت بەشـیر نـاوێ لـە دووڕوەکان لـەگەڵ جولـەکەیەکدا ئاژاوەیان لێ پەیدا بوو، لـەسەر پارچە زەوییە، دوایـی جوەکـە ووتی ئێمە ئەچین بۆلای موحەمەد بۆ چارەسەرکردنی ئـاژاوەی نێوانمان، بەشـیر ووتـی:ئـەچین بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف مالوم و سەرۆکی جولـەکەکان، چونکـە سـتەمکارە، بەوبۆنـەوە خوای مەزن فەرموی:

وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل

لَا تُقْسِمُوا طَاعَةٌ مَعْرُوفَةٌ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٥٤﴾

﴿ وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنا ﴾ وە دووڕووەکانە ئـەڵێن:ئێمـە باوەڕمـان هێناوەبەخواو بەنێراوی خوای مەزن وفەرمانبەرداری ئەوان بووین، موسـڵمانی ڕاستەقینەین و بەدڵ و بەدەم باوەڕمان هێناوە.

﴿ ثُمَّ يَتولى فَرِيْقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذلِكَ وَما اُولئِكَ بِالْمُؤمِنِيْنَ ﴾ لەپاشـا تاقمـێ لـەو دووڕوانـە پشت ئەکەنە فەرمودەی خوای مەزن و واز لـەوەرگرتنی فـەرماندانی پێغەمـەر ئـەهێنن لـەدوای ئەوەی ئەیان ووت: ئێمە باوەڕمان بەخواو بەفروستادەی خوای مـەزن هێنـاوەو فەرمانبـەرداری ئەوان بووین، ئەو تاقمە بەڕاستی بەدڵ وبەزمان باوەڕیان نەهێناوە، چونکە ئەوانە هەر تەنها بەدەم باوەڕیان هێناوە.

﴿ وَإذا اُدعُوا إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكِمَ بَيْنَهُمْ إذا فَرِيْقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ ﴾ و هەرکاتێ بانگی ئەو تاقمە دووڕوانە بکرایە بۆلای نامەی خوای مەزن وبۆلای نـێرراوی خـوای مـەزن لـەبەرئـەوەی فروستادەی خوای مەزن فەرمان بدا لـەنێوان ئـەوان و کەسـانی تـردا بـۆ نەهێشتنی ئاژاوەیـان کوتوپڕ لـەو دوو ڕووانەیە تاقمێ واز لـەچون بۆلای پێغەمەر ئەهێنن، چونکە ئـەزانن فـەرماندانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لـەدژی ئەوانەو، ناوەڕۆکی نیازیان دەرئەکەوێ کەدرۆ ئەکەن لـەگفتو گۆیانا.

﴿وَإِنْ يَكُنْ لَهُمْ الحَقُّ يَأتُوا إِلَيْهِ مُذعنين ﴾ وەئەگەر فەرماندانی پێغەمەر بـۆ سـوودی ئـەوانبێ ومافەکە لـەدژی جگەی ئەوانبێ بەپەلە ئەچن بۆلای فروستادەی خوای مەزن و فەرمانبـەرداری ئەبن و ملی بۆ کەچ ئەکـەن، بەجگـەی فـەرمانی ئـەو ڕازی نـابن لـەبەرئـەوەی مـافی خۆیـان لـەدوژمنەکەیان بۆ وەرئەگری، چونکە ئەزانن پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ دادپـەروەرە، ئـەو تاقمـە شتێ بەڕاستی ئەزانن بەگوێرەی هەوەسی ئەوانبێ. ئەو جۆرە هەوەسانەوە نەبێ هەرئەو دووڕوانە وابن بەتایبەتی، زۆرکەس هەن بەناو موسڵمان، ئەو هەوەسە خراپە مۆری داوە بەسەر دڵیانا، ڕاسـتی لای ئەوان ئەوەیە سودی ئەوانی تێدا بێ.

﴿ أَفي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَمْ ارْتابُوا أَمْ يَخافُونَ أَنْ يَحِيفُ اللهُ عَلَيْهِمْ ﴾ ئایا هـۆی وازهێنـانی ئـەو دووڕوانەبۆئەوەی بڕۆن بۆلای پێغەمەر بۆ وەرگرتنی فەرماندانی: نەخۆشـی ناودڵیانـە، وەك بـێ

باوەڕی ودوورِییان یا هۆیەکەی گومانیـان لەپێغەمەرایـەتی و دادپـەروەری پێغەمـەر یـا ئەوەیـە ئەترسن خواو فروستادەی خوای مەزن لەفەرماندانیانا ئەوان تووشی ستەم بکا؟ هۆی وازهێنانیان هەرشتێ بێ لای ئەوان خۆیان ستەمکارن.

﴿ بَلْ اُولئِـكَ هُـمُ الظّـالِمُونَ ﴾ بـەڵکو ئـەو دووڕوانـە ئەیانـەوی ستەم لـەئادەمیزاد بکـە نەوازهێنان بۆلای فروستادەی خـوای مـەزن، چونکـە ئـەوان پـاکی پێغەمـەر لایـان ئاشـکرایە لەفـەرماندانیا، پلـەی پێغەمەرایـەتی دوورە لەلایـەنگیری، دەسـت پـاکی پێغەمـەر لای ئـەوان بەناوبانگـە، بگـرە لـەپێش پێغەمەرایەتیشـدا، ئەگـەر بەڕاسـتی گومانیـان هەیـە لەفــەرماندانی پێغەمەردا، بۆچی ئەگەر فەرماندانی لەسوودی ئەوانبێ ئەڕۆن بۆلای؟

دوای باسکردنی دووڕوان و وازهێنان لەچون بۆلای پێغەمەر، خوای مەزن باسی باوەڕداران ئەکا ئەفەرموێ:

﴿ إنّما كانَ قَوْلَ الْمُؤمِنِيْنَ إذا دَعُوا إلى اللهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أنْ يَقُولُوا سَمِعْنا وَ أطَعْنا وَ اُلئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ بەڕاستی گفتوگۆی باوەڕدارانی ڕاست هەرکاتێ بانگیان بکری بۆلای نامەی خوای مەزن و بۆلای پێغەمەر هەتا فەرمان بدا بۆ نەهێشتنی ئاژاوەی نێوانیان ئەمەیە کــە ئـەڵێن: ئێمـە بانگی ئەومان بیست و پەیرەوی فــەرماندانی ئەکـەین و ئـەو تاقمـە هـەر ئـەوانن سـەرئەکەون لەهەردوو جیهانداو ئەو تاقمە بەردەوامن لەســەر ڕەوشـتی بـەرزی خۆیـان بـۆ وەڵامدانـەوەی فەرمانی خوای مەزن و پێغەمەری خوا.

﴿ وَمَنْ يُطِعُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللهَ وَيتقه فأُلئِكَ هُمُ الْفائِزُونَ ﴾ وەهەرکەسێ فەرمانبەرداری خواو نێرراوی خوای مەزن بێ لــەبۆ شـتێ فـەرمانی پـێ ئـەدەن ولەسـزای خـوا بترسـێ لــەو گوناهانەی کردویەتی ولەمەودوایش خۆی بپارێزێ لەشتێ کەخوای مەزن تووشی سـزای بکـا، دوایی ئەو کەسانە بەختیارن بەوەرگرتنی بەهەشت.

﴿ وَاَقْسِمُوا بِاللهِ جَهدَ اَيْمانِهِمْ لَئِنْ اَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ﴾ وە ئەو دووڕوانە سـوێندیان خـواردوە بەگەورەترین پلـەی سوێند ئەگەر تۆ فەرمانیان پێبدەی بەدەرچونیان لە نیشتمانی خۆیان و بەجێ هێشتنی دارایی خۆیان و جەنگ کردن لەڕێگەی بەرزی ئایینی ئیسـلامدا ئەچنـە دەرەوە بـۆلای هەریەکێ لەو شتانە بەهەمو توانای خۆیانەوە،.

﴿ قُلْ لاّ تَقْسِمُوا اطاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ﴾ تۆ بڵێ بەو دووڕوانە: ئێوە بەدرۆسوێند مــەخۆن چونکـە درۆکردن لەسوێندا گوناهێکی گەورەیە، ئەوەی داوابکرێ لــەئێوە فەرمانبەرداریـەکی ناسـراوە کەچاکترین وبەرێزترین شتە بۆ ئێـوە کـە پەیرەوێکـە دەرئـەچێ بـەباوەڕێکی پـاك و بـەنیازێکی ڕاستەوە. نەك باوەڕێ بەسویچندی درۆ.

﴿ إنَّ اللهَ خَبِيْرٌ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن ئاگـادارە بەشـتێ ئێـوە بیکـەن لەنـهێنی وئاشکرادا وئاگای لەسوێندی درۆی ئێـوە هەیـەو ئەتانـەوێ بـاوەڕداران بخڵـەتێنن بەسـوێندی درۆتان.

﴿ قُلْ أطِيْعُوا اللهَ وَ أطِيْعُوا الرَّسُولَ ﴾ تۆ بڵێ: ئێوە فەرمانبەرداری خواو فروستادەی خـوای مەزن بکەن بە نیازی پاك و ڕاستەوە. نەك بەدووڕوویی وبەسوێندی درۆ.

﴿ فَإنْ تَوّلُوا فَأنَّما عَلَيْهِ مـاحُمِلَ وَ عَلَيْكُـمْ مـا حُمِلْتُمْ ﴾ دوایـی ئەگـەر ئـەو دووڕوانـە واز لەپەیڕەوی خواو نێرراوی خوای مەزن بهێنن، دوایی ئەوان هیچ زیانێ بە پێغەمەر ناگەیەنن، زیان لەخۆیان ئەدەن، نێرراوی خوای مەزن هیچ شتێکی لـەسەر نیە جگە لـەوەی ئـەو شـتەی خـوای مەزن داوای بکا لەڕاگەیاندنی پەیام جێ بەجێ ی بکا، بەڕاستی ئەو بەو داوایە هەڵساوەو لـەسەر ئێوەیشە داواکاری ئەووەربگرن وپەیڕ'وی بکەن وباوەڕی پـێ بکـەن، دوایـی ئەگـەر ئێـوە واز لەداواکاری موحەمەد بهێنن خۆتان تووشی سزای خوای مەزن ئەکەن .

﴿ وَإنْ تُطِيْعُوا تَهْتَدُوا وَما عَلى الرسُولِ إلاّالْبَلاغُ الْمُبِيْـنُ ﴾ وە ئەگـەر ئێـوە فەرمانبـەرداری وپەیڕەوی موحەمەد بکەن ئێوە شارەزایی بۆلای ڕێگەی ڕاست وەرئەگرن، ئەگەر بـێ فـەرمانی ئەو بکەن لـەسەر موحەمەد نیە جگەی ڕاگەیاندنی ئاشکرا، بەوەیش هەڵساوە، ماوەتەوە بەسـەر ئێوەوە ئەوەی داواتان لێ ئی کرێ، تووشیزیان ئەبن ئەگـەر وازی لێ بـهێنن، سـودتان پـێ ئـەگا ئەگەر پەیڕەوی ئەو بکەن، هەردوولایان ئەگەڕێتەوە بۆ سەرتان.

وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾

﴿ وَعَدَ اللهُ الَّذِيْنَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ ﴾ خوای مـەزن فـەرمودەی خـۆی ڕو پـی ئەکا بۆلای پێغەمەرو باوەڕداران سوێند ئەخواو ئەفەرموێ: کەسانێکی ئـەوتۆ لـەئێوە باوەڕیـان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە، خوا بەڵێنی داوە.

﴿ لِيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الأَرْضِ كَما اسْتَخْلَفَ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ بەڕاسـتی خـوای مـەزن ئـەوان ئەگێڕێ بەجێگە نشینی خۆی لـەزۆربـەی زەوی بـێ باوەڕانـا، کاروبـاری زەوی ئەبـەن بـەڕێوە بەوێنەی پاشایان لـەزەوی خۆیانا، هەر بەوێنەی باوەڕدارانی پێش خۆیان لـەبـەنو ئیسـرائیلیەکان بون بەپاشا، لـەشامدا و دەستەلاتی خۆیانیان کێشا بەسـەر شـام وجگـەی شـامدا دوای نـەمانی تاوانباران، هەندێ پاشاکانیان بەوێنـەی داوودو سـولەیمان، بەڕاسـتی موسـڵمانانیش بـوون بـە جێگەدار لـەزەویدا، دوای ئەوەی خوای مەزن یارمەتی دانو ئۆردوی کیسرا وقەیسەریان شـکان و سامانی ئەوانیان داگیرکردو بەئاسودەیی لـەنیشتمانی خۆیانا دانیشن.

بۆزانین: بۆ زۆرتر شارەزایی لـەناوەڕۆکی ئەو ڕستانەی پێشوو باس ئەکەین لـەبارەی جێگـە نشینی باوەڕدارانەوە:پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لـەگەڵ هاوڕێکانی (١٠) ساڵ لـەمەکەدا مانەوە، فـەرمانیان پێدرابو بەئارام گرتن لـەسەر ئازاری بێ باوەڕان، شەو و ڕۆژیان ئەبردە سەر بەترس و لـەرزەوە. لـەپاشا فەرمانیان پێ درابەکۆچ کردن بۆ مەدینەو جـەنگ کـردن لـەگـەڵ بـێ بـاوەڕاندا، هـەر بەترسەوە چەکیان لـەخۆیان نەئەکردەوە، چونکە نیازیان پـاکبو یـەکبون، پارچـە پارچـە نـەبون لـەماوەی ( ٢٣ ) ساڵی ژیانی پێغەمەرو ( ٣٠ ) ساڵی جێگە نشینەکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ خوای مەزن سەرزەوی نیوەدورگەی عەرەب و زۆربەی زەوی قەیسەر و تەواوی نیشتمانی‌کیسرای پێ بەخشین. بەهۆی یەکبونی نیازی پاکیان بەهێزی بازوی خۆیان لـەشکری ئەو دوو هێزەیـان تێـك شکاند.

﴿ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِيْنَهُمُ الَّذِي ارْتَضىٰ لَـهُمْ ﴾ وەخـوای مـەزن بـەڵێنی دا بەموسـڵمانان کـە ئایینەکەی خۆیان بۆ ئەوان سەر بخاو بۆیانجێگیر بکا لـەزەویدا، ئەو ئایینەی ئـەوتۆ خـوای مـەزن پەسەندی کردوە بۆ ئەوان بەبەهێزکردنی و سەری بخا بەسەر هەموو ئایینەکانی ترداو، بەڵێنی دا بەموسڵمانان، کەفەرموی:

﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمِناً ﴾ وەخوای مەزن موسڵمانان ئەگۆڕێ بـەخاوەنی ئاسـایش لـەدوای ئەوەی ترسیان هەبو لـە دوژمنە بێباوەڕەکانیان، دوای ئەوەی لاواز بون لـەبت پەرستان ئەترسان، هاتنەدی ئەو بەڵێنانە کە هەواڵدانە بەکارێکی پەکخەر کەلـەوەودوا پەیدابوون.

ئەوەبوو کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چوە مەدینە ویاریدەرانی پێغەمەر جێگەیان دا بەکۆچ کەران. موسـڵمانان بـەجۆرێ بـون شـەو وڕۆژ بەچەکـەوە بـون، ئەترسـان قورەیشـیەکان لـەناکاودا پەلاماریان بدەن،. دوایی ڕۆژی لـەڕۆژان هەندێ لـەهاوڕێکانی پێغەمەر ووتیان: ئایا ڕۆژی دێـت

بەسەر ئێمەدا نەترسین و چەکەکانمان دابنێین؟ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: ئێوە دانانیشن مەگەر ماوەیەکی کەم هەتا کاتێ دێت دائەنیشن لەنێو کۆمەڵێکی گەورەدا خۆتان ئەکەنەوەو چەك وئاسنتان پێوە نابێ. بەوبۆنەوە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوەو بەڵێنی خوا هاتە دی.

﴿ يَعْبُدُنَنِي وَلا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً ﴾ خوای مەزن ئەو بەڵێنەی بۆ جێبەجێ کردنو چونکە خوا فەرموی: ئەوان من ئەپەرستن بەتەنهاو هیچ شتێ ناکەن بەهاوبەشی من لەپەرستندا.

﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ وە ئێوەی موسوڵمان نوێژە پێویستەکان بەگوێرەی یاسا بیکەن، ئێوە زەکاتە پێویست کراوەکان بدەن بەهەژاران و پەیڕەوی نێراوی خوای مەزن بکەن، بۆئەوی ئێوە میهرەبانیتان لەگەڵ بکرێو بەئاواتی خۆتان بگەن لە پاشەڕۆژدا.

﴿ لاتَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الأَرضِ وَمَأواهُمْ النَّارُ وَلَبِئْسَ المَصِيْرُ ﴾ وەتۆ گومان مەبەنە کەسانێکی ئەوتۆ دوژمنایەتی تۆ ئەکەن و بەئاشکراو بەنهێنی تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە ڕێگە لەئێمە بگرن و دەستمان بەوان ئەگا، تۆ سەرئەخەین بەسەر ئەواندا لەهەمو هەرێمێ لەهەرێمەکانی زەوی‌و، جێگەو ئارامگای ئەوان ئاگری دۆزەخەو، دۆزەخ خراپ جێگەی گەڕانەوەو چارەنوسی ئەوانە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ

عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾

﴿ يآأيها الَّذِيْنَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِيْنَ مَلَكَتْ أيْمانُكُمْ وَالَّذِيْنَ لَمْ يَبْلُغُوا الحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاثَ عُوراتٍ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: پێویستە کەسانێکی ئەوتۆ بەندەو کارەکەری ئێوەن بچوك بن یا گەورە کەسانێکی ئەوتۆ منالن و لە چوارساڵ بەرەو ژورن و نەگەیشتونەتە کاتی باڵغبون داوای هاتنە ژورەوە بکەن لەئێوە، بەندەو کارەکەرەکان داوای دەستور بکەن لەگەورەکانیان، منالەکانیش داوای دەستوری چونە ژورەوە بکەن لەخزمەکانیان بەر لە چونە ژورەوە لەم سێ کاتانەی دواییدا.

١- ﴿ مِنْ قَبْلِ الصَّلاةِ الفَجْرِ ﴾ لەپێش نوێژی بەیانی، چونکە بەزۆری ئادەمیزاد لەگەڵ ژنەکەیدا لەژێر سەرە خەوێکدان. بەرگی خەوتنیان لەبەردایە، وایش ئەبێ لەشێوەیەکدان لایان ناخۆشە کەسێ بیانبینێ.

٢- ﴿ وَحِيْنَ تَضَعُونَ ثيابَكُمْ مِنَ الظَّهِيْرَةِ ﴾ وە لەکاتێکا ئێوە بۆخەوتنی پێش نیوەڕۆ بەرگەکانی خۆتانتان لەبەر کەندوەو داتان ناون لەبەر گەرمای نیوەڕۆدا، پیاووژنەکەی بەیەکەوەن.

٣- ﴿ وَمِنْ بَعْدَ الصَّلاةِ العِشاء﴾ وەلەدوای نوێژی عیشاو، چونکە لەو کاتەدا ئادەمیزاد خۆیان ئامادەکردوە بۆخەوتن لەگەڵ ژن و خێزانەکەیداو دانیشتون.

﴿ ثَلاثُ عَوراتٍ لَّكُمْ ﴾ ئەو سێ کاتانەی پێشو سێ کاتی شەرمن بۆ ئێوەو کاتی خۆ داپۆشینن، لەوانەیە شەرمگای ئادەمیزاد دەربکەوێ و پێویستبێ داپۆشرێ، بۆیە پێویستە داوای چونە ژورەوە بکرێ.

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُم وَلاعَلَيْهِمْ جناحٌ بَعْدَهُنَّ طَوافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضَكُمْ عَلى بَعْضٍ ﴾ هیچ گوناهێ نیە لەسەر ئێوەی خاوەن خانوەکان و لەسەر بەندەو کارەکەرەکان و لەسەر ئەو منالانەی تەمەنیان لەچوار ساڵ بەرەو ژورە بۆچونە ژورەوە بەبێ داواکردن، دوای ئەو سێ کاتانە هەتا دواییان دێ ئەوان هاتو چۆبکەن بۆلای گەورەکانیان و خزمەکانیان، هەندێ لەئێوە سەر لەهەندێ ترتان بدەن، بەبێ دەستور.

﴿ كَذلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمُ الآياتِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ هەر بەو جۆرە خوای مەزن بۆئێوەی ڕون ئەکاتەوە فەرمان و یاسای خۆی بۆتان. هەر بەو جۆرەی شێوەو کاتی دەستوری چونـە ژورەوەی بۆئێوە ڕون کردەوەو، خوای مەزن ئەزانێ بەسودی ئێوەو هەمو شتێ لـەجێگـەی شیاوی خۆیـا دائەنێ بۆ بەرێوەبردنی کارەکانتان.

﴿ وَإذا بَلَغَ الأطفالُ مِنكُمُ الحُلُمَ فَلْيَسْتَأذِنُوا ﴾ وەهەر کاتێ منالـەکانی ئێـوەو خزمـەکانتان، ئەوانەیان داوای دەستوریان ئەکردلەو سێ‌کاتانەدا گەیشتنە کاتی باڵغبون و پیاوەتی، دوایـی بـا داوای دەستوری چونە ژورەوە بکەن لـەهەمو کاتێکا نەك تەنها لـەو سێ‌کاتانەدا.

﴿ كَما اسْتَأذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ هەر بەو جۆرەی پێویست بو داوای دەستور بکەن بۆچونە ژورەوە کەسانێکی ئەتۆ لـەپێش ئەوانەوە بون لـەئادەمیزادە تەمەن گەورەکان، پێویستە ئەمانیش داوای دەستور بکەن ئەنجا بچنە ژورەوە.

بۆزانـین: کـاتی بـاڵغبونی پیـاو کاتێکـە تەمـەنی بگاتـە پـازدە سـاڵی، یـا هەسـت بکـا بەهاتنەخوارەوەی شاوەتەکەی. بۆژنان بە پەیدابونی حەیز یا منالْ هەڵگرتن، یا تەمەنی بگاتە نـۆ ساڵان، هەندێ لـەزانایان لایان وایە ئەبی تەمەنی ژنیش بگاتە پازدە ساڵان.

﴿ كَذلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُـمْ آياتِـهُ وَاللهُ عَلِيـمٌ حَكِيـم ﴾ هـەر بـەو جـۆرەی خوارونـی ئەکاتـەوە فەرمانەکان و یاسای خۆی بۆ ئادەمیزاد ڕونی کردەوە بۆ یوە فـەرمانی خـۆی بـۆ منـاڵان دوای باڵغبونیان و، خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ ڕەوشتی ئێوە بپارێزێ لـە خراپە، هەمو شـتێ لـەجێگای شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ وَالقَواعِدُ مِنَ النِساءِ اللَّتِي لايَرْجُونَ نِكاحاً ﴾ وەئەو کەسانەی پەکیان کەوتوە لـەو ژنانـەی ئەوتۆ بە ئومێدی شوکردن نین و پیاوان ئەوانیان ناوێ لـەبەر پیری‌و حەیزیان پێدانایەو لـە مناڵبون کەوتوون.

﴿ فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ أنْ يَضَعْنَ ثِيابُهنَّ غَيْرَمُتَبَرِّجاتٍ بِزِيْنَةٍ ﴾ دوایـی هیـچ گوناهـێ لـەسـەر ئـەو پیرەژنانە نیە کە بەرگەکانیان لـەبەردایـە دایبکـەنن و سـەر نەکێشـێ بـۆلای دەرخسـتنی شـتێ پیویستە داپۆشـرێ لـەبەردایـە بـەندەو خزمـەتکارەکانیان لـەکراس و دەرپـێ و سـەرپۆش بـەو مەرجەی دەرنەخەن ئەو شتەی پێویستە دای پۆشن لـەملوانکەو بازنەو خرخاڵو نیازیـان وابـێ پیاوان تەماشایان بکەن، هەروەها سنگ و شلکەی ڕانیان دەرنەخەن. بـا ئـەوەشمان لـەبیرنـەچێ هەمو شتێ بابێ نرخیش بێ هەر یەکێ هەیە هەڵی بگرێ.

﴿ وَأنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ واللهُ سَمِيْعٌ عَلِيْـمٌ ﴾ وەچاکـترین شـت بـۆ ئـەو پیرەژنانـە ئەوەیـە کەبەرگەکانیان دانەکەنن لـەبەردەم پیاوانی بێگانەدا بادروستیشبێ ئـەو شتە، چونکـە دوربونـە لـەگومانی خراپ بردنو ، خوای مەزن گفتوگۆی پیاوان وژنان ئەبیسـێ، ئـەزانێ بـەنیازی دڵـی ژنان و مەبەستیان.

موسڵمانان کاتێ بچونایەتە دەرەوە بۆ جەنگ لەگەڵ پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ کلیلـی خانوەکـانی خۆیانیان دائەنا لەلای کوێرو شەلو نەخۆشەکان وخزمـانی خۆیـان، دەستوریان ئـەدانێ لـەناو خانوەکانیانا خواردەمەنی بخۆن، ئەوانیش ئەوشتەیان پی خۆش نەبوو، ئەیان ووت: لەوانەیە ئـەو خاوەن خانوانە پێیان چاك نەبێ ئەو خواردەمەنیە بخۆن، خوای مەزن فەرمانی پێدان وفەرموی:

لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوۡ صَدِيقِكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗاۚ فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦١﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بەجگەی ئـەوەی لەسـەرەوەی ئایەتەکـە باسـکرا، لـەلای هەندی لەزانایان ئەڵێن: هاورێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لایان خۆش نەبو لـەگەڵ کوێراندا خـواردن بخۆن، چونکە ئەوان خواردەمەنی چاك وخراپ جویێ ناکەنـەوەو لەوانەیـە تووشـی ستەم بـبن، شەلـەکان هەرچەندە چاك وخراپی خواردەمەنی ئەبینن. بەڵام دانیشتنی ئەوان لـەگـەڵ کۆمـەڵدا ئەبێتە هۆی ئازاردانیان، چونکە خوان ڕائەخرێ بەسەر زەویداو ناتوانێ قاچی ڕابکێشێ، مانەوەی نەخۆشەکان بەتەنها ئەبێتە هۆی شەرمەزاری بۆ خـۆی هـەتا تەندروسـتان لـەخـواردن ئەبنـەوە،

هەروەها هاورێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لایان گرانبو لەخانوی جگەی خۆیان خـواردن بخـۆن بـەبێ دەستور بۆ ڕەواکردنی ئەو مەبەستەو بۆ لابردنی گوناه لەسەر کوێر وشەل ونـەخۆش بـۆ یـەجێ هێنانی هەندێ لەفەرمانەکانی خوای مەزن، خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ لَيْسَ عَلى الأَعْمى حَرَجٌ وَّلا عَلىالأَعْرَجِ حَرَجٌ وَّلا عَلى الْمَرِيْضِ حَرَجٌ ﴾ هیچ گوناهێ نیە لەسەر کوێر لەوشتانەی ئەوتۆ داوایان لێ ئەکرێ و مەرجە چاویـان ببینـێ وەك جـەنگ کـردن لەگەڵ بێ باوەڕان و، هیچ گوناهێ لەسەر شەل نیە لەشتێکا داوای لێ بکرێ و مەرجبێ ڕۆیشتن و نەتوانێ بەوکارە هەڵسێ لەبەر شەلیەکەیو، هیچ گوناهێ لەسەر نەخۆش نیە لەشـتێکا ئـەو نەخۆشیە نەیەڵێ جێ بەجێی بکـا، وەك ڕۆژ و نوێـژ بەتـەواوی مەرجەکانیـەوە، ئـەو کەسـانە ئەگەر بیانەوێ بەتەواوی فـەرمانی خـوا هەڵسـن ونـەتوانن بـەجێیان بـهێنن گوناهیـان لەسـەر هەڵئەگیرێ و لەپاداشتیان کەم ناکرێتەوە هیچ شتێ.

﴿ وَلا عَلى أنْفُسِكُمْ أنْ تَأكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ ﴾ وەهیچ گوناهێ لەسـەر خۆتـان نیـە کـە ئێـوە خواردن بخۆن لەخانوەکانی خۆتانـا، مەبەسـت لـە (بُيُوتِكُـمْ ) خانوەکـانی ژن وکوڕەکانتانـە، چونکە خـانوی ئـەوان وەك خـانوی خۆتـانن، ژن وپیـاو بـەرگی یـەکترین، کوڕیـش پارچەیـە لـەخۆتانن، ئەگـەر ئـەوە مەبەسـت نـەبێ گونجـاو نیـە مـرۆڤ داوای دەسـتور لـەخۆی بکـاو لەوەیشەوە هاتوە هەندێ کەسن هەتا بۆیان بکرایە نانیان بەتەنها نەئەخوارد، چاوەڕوانیان ئەکرد کەسێ بهاتایە ونانیان لەگەڵ بخواردایە.

بۆ زانین: ناوەڕۆکی ئەو فەرمودەی خوای مەزنە ڕوی پـێ کـراوە بـۆلای هـەمو ئـادەمیزاد. کەواتە نابێ گومان ببرێ مەرجی دروستبونی خواردن ئەوەیە: کوێرو شەل و نەخۆش نەبن.

﴿ أوْ بُيُوتِ آبائِكُمْ أوْ بُيُوتِ اُمَهاتِكُمْ أوْ بُيُوتِ إخْوانِكُمْ أوْ بُيُوتِ أعْمامِكُمْ أوْ بُيُوتِ عَمّاتِكُمْ أوْ بُيُوتِ أخوالِكُمْ أوْ بُيُوتِ خالاتِكُمْ ﴾ یا ئێوە خواردن بخۆن لەخانوی باوکـەکانتان یـا خـانوی دایکـەکانتان یـا خـانوی براکانتـان یاخـانوی خوشـکەکانتان یـا خـانوی مامـەکانتان یاخـانوی پورەکانتان وخۆشکی باوکتان یاخانوی خاڵۆکانتان یاخانوی پورەکانتان وخۆشکی دایکتان، نـان خواردن لەخانوی ئەوکەسانەدا گوناه نیە بۆ ئێوە.

﴿ أوْ مامَلَكْتُم مَفاتِحَهُ ﴾ یا ئێوە بخۆن لەشتێ دراوەتە دەست ئێوە بـەڕێوەبردنی کاروباریـان لەخواردنی بەروبومی ئەو باخانە ومیوەکانیان ولەشیری ئەو ئاژاڵانەی جگەی خۆتانن لەلاتانـە. بەمەرجێ زۆر خۆری ناڕەوای تێدا نەکرێ و هەڵی نەگرن بۆ خواردنـی دوایـی. مەبەسـت لـە (مَفاتِحَهُ ) شتێکە لەژێر دەستی ئێوەدا بن.

﴿ أوْ صَدِيْقِكُمْ ﴾ یا ئێوە خواردن بخۆن لەناو خانـوی دۆستەکانی خۆتانـا هـەرکاتێ بزانـن ڕازین بچنە لایان بۆ خواردن، ئیتر هەرجۆرێ بێ ئێوە بزانن لایان ناخۆش نیە.

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُناحٌ أنْ تَأكُلوا جَميْعاً أوْ أشْتاقاً ﴾ هیچ گوناهـێ لەسەر ئێوە نیە کەئێوە خواردەمەنی بخۆن و کۆ ببنەوە لەگەڵ جگەی خۆتان یا بەتەنهاو بەجیاوازی لەگەڵ جگەی خۆتان خواردەمەنی بخۆن.

﴿ فَإذا دَخَلْتُمْ بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلى أنْفُسِكُمْ ﴾ وەهەرکاتێ ئێوە چوونە ناو ئەو خانوانە باسیان کران، دوایی ئێوە سلاو بکەن لەسەر ئەو کەسانەی لەخۆتانن وخزمی خۆتانن وهاوئایینی خۆتانن.

﴿ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللهِ مُبارَكَةً طَيِّبَةً ﴾ سلاویان لێ بکەن بەسلاوێ لەلایەن خوای مەزنەوە کراوە بەسلاو بۆ موسڵمانان، سلاوێکە پیرۆزەو ئومێدی چاکەی زۆر و پاداشتی زۆری لێ ئەکرێ، دەروونی گوێ گران پێیان خۆشە.

﴿ كَذلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمْ الآياتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ هەربەوجۆرەی ئایەتەکانی پێشووم بۆ ئێوە ڕوون کردەوە، ئەم ئایەتانەیشتان بۆ ڕوون ئەکەمەوە، بۆئەوەی پەیوەندیتان بەیەکەوە بەهێزتر بێ و خۆشەویستی نێوانتان زۆرتر بێ، بۆئەوەیش ئێوە بیر بکەنەوە لەشتێ سەرئەکێشێ بۆلای سودی خۆتان کاتێ قورەیشیەکان بەپێشەوایەتی ئەبوسوفیان وبەیاریدانی هۆزی غەفتان بەسەرۆکایەتی عویەینەی کوڕی حەسەن هێرش وپەلاماریان هێنا بۆ موسڵمانان لەمانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچی: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا بەکۆبونەوەی دانیشتوان بەهەڵکەندنی چاڵێ بەهەرچوار لای مەدینەدا، موسڵمانان کۆبونەوە بۆ پرس وڕاوێژ، بەچ جۆرێ بەرگری لەخۆیان بکەن. لەو کاتەدا دووڕووەکان نەچونە دەرەوە، هەریەکەیان بەجۆرە یانوێ وئەیان ووت: خانوەکانمان چۆڵن وکەس لای ناموسمان نامێنێتەوە، ژنەکانمان خاوەنی ڕێز وشەرمن وبێ کەسن خوای مەزن ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە فەرموی :

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَىٰ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا حَتَّىٰ يَسْتَأْذِنُوهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ۚ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ

يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قَدْ يَعْلَمُ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٤﴾

﴿ إنَّما الْمُؤمِنُونَ الَّذِيْنَ آمَنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ ﴾ بەڕاستی باوەڕدارانی باوەڕ ڕاست و تەواو کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان هێناوە بەخوای مەزن وبەنێروای خوای گەورە بەنیازی پاکەوە لەناخی دەرونیانەوە هەڵقولابێ.

﴿ وَإِذا كانُوا مَعَهُ عَلى أمْرٍ جامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتّى يَسْتَأذِنُوهُ ﴾ وەهەرکاتێ ئەو باوەڕدارانە لەسەر کارێ بون کۆی کردبونەوە لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ ڕاوێژ کردن وبەڕێوەبردنی کاروباری جەنگ و بۆ خۆئامادەکردن بۆ کاورباری جەنگ و لێکۆڵینەوەی کاری پێویستی گرنگی ئاینی، لەناو ئەو کۆبونەوەیەدا ناڕۆن بەهەر بیانوێ بێ هەتا داوی دەستور نەکەن لەپێغەمەری خوای مەزن ﴿ﷺ﴾، دوایی ئەگەر دەستوری پێدان ئەڕۆن وئەگینا لەجێگەی خۆیان ئەمێننەوە.

یانێ بەڕاستی پێویستە باوەڕداران سەربازێکی دڵسۆز بن بەرانبەر بە فەرمودەی خوای مەزن وپێغەمەر وبەرانبەر بەزانایان وپێشەوایانی خۆیان، چونکە نازانن چ کاتێ ڕووادوی کوتوپڕی ڕو ئەدا.

ئەگەر لەناکاودا شتێکی گرنگ ڕووی‌دا داوای دەستور لەفەرمانڕەواو پێشەواکانی خۆیان بکەن، زۆر ڕوونە ئەوکەسانەی باوەڕدارن پێویستە داوای دەستور لەپێغەمەر بکەن، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ إنَّ الَّذِيْنَ يَسْتَأذِنُوكَ أولئِكَ الَّذِيْنَ يُؤمِنُونَ بِاللهِ وَرَسُولِهِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ داوای دەستور لەتۆ ئەکەن ئەوکەسانەی ئەوتۆن باوەڕ بەخوای مەزن و بەنێرراوی خوا ئەهێنن، هەرکەسێ داوای دەستور لەتۆ نەکەن باوەڕدار نین.

﴿ فَإذا اسْتَأذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأنِهِمْ فَأذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللهَ ﴾ دوایی هەرکاتێ ئەو باوەڕدارە نیاز پاکانە داوای دەستوریان کرد بەهەندێ کاری گرنگ بۆ ئەوان پەیدا ئەبێ، دوایی

تۆ دەستور بدە بۆ هەر کەسیان تۆ ئارەزووت هەبو بڕوا بۆ جێ بەجێ کردنـــی کارەکـەی و تـۆ داوای لێ بوردن بکە لـەخوای مەزن بۆ ئەوان.چونکە هەرچەندە ئەوانە خاوەنی بیانوبن، ئەبوایـە کاری ئاینیان پێش کاری جیهان بخستایە.

﴿ إنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيْمٌ ﴾ بەڕاستی خــوای مـەزن خـۆش ئـەبێ لەناتـەواوی ئەوانـەی داوای دەستور ئەکەن بۆ کاری جیهان وباوەڕدارن، میهرەبانە بۆ ئاسان کردنی ئیش وکاریان.

﴿ لاتجْعَلُوا دُعاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كدعاء بَعْضَكُـمْ بَعْضـاً ﴾ ئێـوەی موسـڵمان بـانگ کردنـی نێرراوی خوای مەزن لـەنێو ئێوەدا مەی گێڕن بەوێنە بانگی کردنی هەندێکیان لـەهــەندی تریـان لـەوەی دروستبێ سستی بکەن لـەوەلاّمدانەوەی و بەبێ دەستوری ئەو بڕۆن بەلای کاری تایبەتی خۆتانەوە، پەلـەکردن لـەوەلاّمدانەوەی پێغەمەر پێویستە، هەندێ لـە زانایـــان ئـەڵێن : یانێ‌بـانگ کردن وناوبردنی پێغەمەر وەك بانگ کردنی هەندێکیان بۆ هــەندێ ترتـان نـەبێ وبـانگی بکـەن لـەپشتی پەردەوە بڵێن: ئەی موحەمەد. بەڵکو بەبێ بەرزرکردنـەوەی دەنگـی خۆتـان بـەڕێزەوە بانگی بکەن و بڵێن: ئەی پێغەمەری خوای مەزن. ئەی نێرراوی خوای مەزن.

﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللهُ الَّذِيْنَ يَتَسَلَّوُنَ مِنْكُمْ لِو أذاً ﴾ بەڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بەکەسانێکی ئەوتۆ ئەچنە دەرەوە لـەئێوە لـەناو کۆمەڵدا بەنهێنی بەداپۆشینی هەندێکتان ئەوانی ترتان لـەترسی ئەوەی نێراوی خوای مەزن نەتان بینێ.

﴿ فليحذر الَّذِيْنَ يَخالِفُونَ عَنْ أمْرِهِ أنْ تُصِيْبُـهُمْ فِتْنَـةٌ ﴾ دوایـی باکەسـانێکی ئـەوتۆ واز لــە فەرمانی نێرراوی خوای مەزن ئەهێنن و بەبێ پرسی ئەو خۆیان ئەدزنەوە بترسن کەتووشـــیئەوان ببێ ڕوداوی سەخت وگران لـەجیهاندا لـەلـەشیاناو دوژمن زاڵ ببێ بەســەریانا وسامانیان داگـیر بکەن.

﴿ أوْ يُصِيْبُهُمْ عَذابٌ ألِيْمٌ ﴾ یاتووشی ئەوان ببێ سزایەکی خاوەن ئازار لـەپاشەڕۆدا، ئەگـــەر لـەجیهاندا تووشیان نەبێ.

﴿ ألا إنَّ للهِ مافِي السَّماواتِ وَالأرْضِ قَدْ يَعْلَمُ ماأنْتُمْ عَلَيْهِ ﴾ ئێوە ئاگادار بن و بزانن بەڕاستی هەر بۆ خوای مەزنە شتێ لـەئاسمانەکان و لـەزەویدایە، بەڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بەشـتێ ئێـوە لـەسەرینی لـەباوەڕو نیازی پاك و لـەدووڕویی ودڵپیسی و لـەبێ فەرمانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ .

﴿ وَيَوْمَ يَرْجَعُونَ إلَيهِ فَيَنْتبئهم بِما عَمِلُوا وَاللهُ بِكُلِّ شَيءٍ عَلِيْمٌ ﴾ وە ئەزانێ بـــەڕۆژێ ئـەوان ئەگێڕرێنەوە بۆلای ئەو، دوایی خوای مەزن هەواڵ ئەدا بەوان بەشتێ ئەوان کردویانـە لـەکاری چاك و خراپ و،خوای مەزن ئەزانێ بەهەموو شـتێ وهیـچ شـتێ لـەو پەنـهان نیـە، پاداشـتیان ئەداتەوە بەشتێ شایستەی ئەوانبێ، ستەم لـە هیچ کەسێ ناکرێ لـەڕۆژی دواییدا.

**بەیاریدەی خوا کۆتایی پێ هات مانای ئەو سورەتە**

# ﴿ سورەتی ئەلفورقان ﴾

لەمەکە هاتوەتـە خـوارەوە. لای هـەندێ لـەزانایان جگـە لەئایەتـەکانی (٦٨ -٦٩ -٧٠) ژمارەی ئایەتەکانی (٧٧) ئایەتن .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ تَبارَكَ الَّذِي نَزَلَ الفُرقانَ عَلى عَبْدِهِ ﴾ چاکەو فەڕی خوای مەزن زۆر گەورەیە، خوایەکی ئەوتۆیە ناردویەتیە خوارەوە بۆ سـەر بـەندەی خـۆی کـە موحەمـەد قورئانـیّ چـاك وخـراپ و

باوەڕدارو بێ باوەڕ لەیەکتری جوێ ئەکاتەوە، لەبەرئەوەی هەموو بونەوەران لەئادەمیزادو لەجنۆکە بترسێنێ لەسزای خوای مەزن لەڕۆژی دواییدا، موژدە دەریشە بەوکەسانەی ڕێگەی ڕاست وەرئەگرن بەبەهەشت.

﴿ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّماوات وَالأَرْضِ ﴾ خوایەکی ئەوتۆیە پاشایەتیو خاوەنیەتی ئاسمانەکان وزەوی هەر بۆ ئەوە، هەر ئەویش دروستی کردوون ، زۆر بەرێك وپێکی ئەیانبا بەڕێوەو بەبێ یاریدانی هیچ کەسێ.

﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ لَهُ وَلَداً وَّلَمْ يَكُنْ لَّهُ شَرِيْكٌ فِي الْمُلْكِ ﴾ وەخوای مەزن منالّی بۆخۆی وەرنەگرتوە، ژنی نیە هەتا منالّی ببێ، بۆخوای مەزن نەبوە لەناو گەردونا هاوبەش و بۆیشی نابێ، هەمو گیانداران و ڕووەك و بێ گیان هەربەتەنها خوای مەزن دروستی کردوون. کەواتە گومانی عەرەبەکان کە فریشتەکان کچی خوان گومانی گاورەکان وجوەکان عیسا وعوزەیر کوڕی خوان، هەموویان درۆو بوختانن زۆر گەورەن.

﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً ﴾ وەخوای مەزن هەموو شتێکی دروست کردوە لەگیاندارو بێ گیان، دوایی خوای مەزن ئامادەی کردوە بۆ هەمویان وبۆ هەریەکەیان شتێ شایستە بێ بۆیان: ئامادەی کردوە بۆ ئادەمیزاد زانین وزانست وبەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی خۆی لە هەردوو جیهاندا وپەیداکردنی پیشەی جیاجیا،جۆرە هەستێکی داوە بەگیاندارانی تر،هەتا بتوانن خواردەمەنی بۆخۆیان پەیدا بکەن و خۆیان لەکارەسات لابدەن. کەواتە ڕێکەوت ڕۆڵی نیە لە دروست کردنی بونەوەراندا بەوجۆرە بەڕێوەبردنە، جگە لەئادەمیزادی نەزان هیچ کەسێ پەنا نابا بۆلای دروستبونی بونەوەران بەڕێکەوت .

﴿ وَاتَّخَذوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لا يَخْلِقُونَ شَيْئاً وَهُمْ يَخْلَقُونَ ﴾ وە بێباوەڕە نەزانەکان وەریان گرتوە بۆخۆیان لە جگەی خوای مەزن چەند خوایە ئەیان پەرستن، ناتوانن هیچ شتێ دروست بکە ن و ئەو خوایانەی ئەوان دروست کراو داتاشراوی دەستی ئەو بێباوەڕانەیە و نەبوون و خۆیان پەیدایان کردوون.

﴿ وَلا يَمْلِكُونَ لأَنْفُسِهِمْ خَيْراً وَلا نَفْعاً ﴾ وە ئەوبتانە سەرەڕای ئەوەی دروست کراوی دەستی خۆیانن خاوەنی نین هیچ سودێ بەخۆیان بگەیەنن وناتوانن هیچ زیانێ لەخۆیان لابدەن، ئیتر چۆن ئەوان ئەو بتانە ئەپەرستن .

﴿ وَلا يَمْلِكُونَ مَوْتاً وَّلا حَياةً وَّلا نُشُوراً ﴾ وەناتوانن هیچ زیندوێ بمرێنن یا مردوێ زیندوو بکەنەوەو ناتوانن ئادەمیزاد زیندوو بکەنەوە لەگۆڕەکانیان بۆ پرسیار لەڕۆژی دواییدا ،کەسێ بەوجۆرەبێ چۆن ئەبێ خوابێ .

دوای ئەوەی بت پەرستان بەڵگەیان بەدەستەوە نەماو پەکیان کەوت دەستیان دایە دەم درێژی کردن، پەنایان برد بۆلای درۆو بوختان، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَقالَ الّذِيْنَ كَفَرُوا إنَّ هذا إلاّ إفْكٌ افْتَراهُ وَأعانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُوْنَ ﴾ وە كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا بوو ووتیان: ئەو قورئانەی موحەمەد هێناویەتی هیچ شتێ نیە مەگەر درۆیەو خۆی هەڵی بەستوەو گومانی وایە لەلایەن خوای مەزنەوە بۆی هاتوەتە خوارەوەو یاریدەی موحەمەدیش ئەدەن لەسەر ساختە هێنانی ئەو قورئانە تاقمێ تر لەخاوەن نامەكان كەفێری ئەوی ئەكەن هەواڵی نەتەوە پێشوەكان، بەو شێوە تایبەتیەی خۆی ئەیڵێ وهەرشتێ ئارەزووی بكا ئەیخاتە سەری. بەگومانی خۆیان تاقمی تریش جگەی خاوەن نامەكان یاریدەی پێغەمەریان ئەدا: وەك عوبەیدی كوڕی خزری حەبەشی كەپۆشە وێژ بوو، جەبر ویەسار و عەداس كەگاور بوون وموسڵمان بوبون و دانیشتوی مەكەبون.

﴿ فَقَدْ جاءُوا ظُلْماً وَّ زُوراً ﴾ دوایی ئەو بێباوەڕانە بێ باوەڕیەكەیان پاڵی پێوەنان ستەم كردن لە پێغەمەر وبەبوختان ودرۆو بێنن وبڵێن: ئەو قورئانە خۆی دروستی كردوە بەدرۆو بەبوختان، ئەو نامەی خوای مەزنە وپەك خەرەی ئەوان بیكەن بەوەی لەدانیشتوانەوە وەری گرتوە.

﴿ وَقالُوا أساطِيْرَ الأَوَلِيْنَ اكْتَتَبَها فِهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَّ أصِيلاً ﴾ وەبێ باوەڕان ئەیان ووت:ئەو نامەیە چیرۆكی پێشوانەو درۆی ئەوانە و لەوانی وەرئەگرێ وفەرمان ئەدا بەنوسینەوەیان و ئەخوێنرێتەوە بەسەریا بەیانیان و ئێواران كەكاتێكیش كەس ئاگای لەوكاتانە نیەو بەنهێنی وەری ئەگرێ: نەك لەڕووناكی ڕۆژدا هەتا كەس بەو كارە نەزانێ. ئەو جۆرە كارە ناپەسەندانە ئامانجی ئەو كەسانەیە لەهەمو كات وجێگەیەكدا كەترسیان پەیدا كرد پلەو پایەو دارایینا لەكیس ئەچێ دەست ئەكەن بەبڵاوكردنەوەی پڕوپاگەندە و بوختان بە پیاوچاكانا كەدژی ستەمكاران ئەوەستن .

﴿ قُلْ أنْزَلَه لَهُ الّذِي يَعْلَمُ السِرَّ فِي السَّماواتِ وَالأَرْضِ إنَّهُ كانَ غَفُوراً رَحِيْماً ﴾ تۆ بڵێ ئەو قورئانە ئەفسانەو شتی پڕوپوچ نیەو لەكەس وەرنەگیراوە، خوایەكی مەزنی ئەوتۆ ناردویەتیە خوارەوە هەموو شاراوەكانی ناوئاسمانەكان وزەوی ئەزانێ، ئەو قورئانە ڕێگە پیشاندەری نەتەوەكانی دوارۆژە، دادپەروەری وچاكەكردنیان فێر ئەكا وبەوانی ڕائەگەیەنێ. بەڕاستی خوای مەزن لەگوناهباران خۆش ئەبێ، خاوەنی میهرەبانی وبەزەییە بۆیان، هەڕەشەیان لێ ئەكاو سزایان دووا ئەخا هەتا پەشیمان بینەوە،پاداشتی كردەوەی خۆیان وەرگرن، ئەگەر بەردەوامبون لەسەر بێ باوەڕی تۆڵەیان لێ ئەسێنێ.

وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ

لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَـٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَـٰلِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾

﴿ وَقالُوا ما لِهذا الرَّسُولِ يَأكُلُ الطَّعامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْواقِ ﴾ وە بێ باوەڕان بەگاڵتە پێکردنەوە ئەیان ووت: چ شتێکە بۆ ئەو نێرراوە و چۆن ئەبێ پێغەمەر بێ خواردن بخوا بەوێنەی ئێمەو بروا بەبازاڕ بۆ پەیدا کردنی هۆی ژیان بۆخۆی وەك ئێمە ئەڕۆین، ئەگەر پێغەمەر بێ بەگوێرەی گومانی خۆی، بۆ جیاوازی لەگەڵ ئێمەدا نیە وبۆ پلەی لە ئێمە بەرزتر نیە بەوێنەی کیسرا و قەیسەرو مەبەستیان ئەوەبو پێغەمەر خۆی بشارێتەوە لەکۆشکێکی بەرز ونایاب، پاسەوان و پەردەدار ببێ. نەیان ئەزانی یا خۆیانیان گێل ئەکرد، بەڕاستی خاوەنی پەیامێ،

هەرچۆنێ بی پێغەمەر بێ یا جگەی پێغەمەر بێ، بۆی ناگونجێ ئەو پەیامە جێ بەجێ بکـا مەگـەر لـەنێو دانیشتواندا بێو ئەگەر وانەبێ و تێکەڵاوی ئەوان نەبێ چۆن وەڵامی ئەو ئەدەنەوە؟

﴿ لَوْلا نُزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيراً ﴾ بـۆ نانێرێتـە سـەری ئـەو پێغەمـەرە فەریشـتەیە ئاگاداری کەسی بکا دژی فەرمانی بێ دوایی ئـەو فریشـتەیە لـەگـەڵ ئـەو پێغەمـەرە دانیشـتوان بترسێنن و دوژمنایەتی ئەو پەرچ بدەنەوە، دوایی ئێمـە بزانـین ڕاسـتە چونکـە فریشـتەکان ئـەو پێغەمەرە بەڕاست ئەزانن. ئەوەندە نەزانن. ئاگایان لــەوە نیـە هـۆی نـاردنی پێغەمـەران بـۆلای ئادەمیزاد ئەوەیە شتێ سودی ئەوانی تێدا بێ بۆیان ڕون بکاتەوە، ئەگەر لـەڕەگەزی ئەوان نـەبێ ئاوری بۆ نادەنەوە بەجۆرێ وولاّمی کەسێ بدەنەوە لـە ڕەگەزی خۆیانبێ.

﴿ أو يُلقِي إلَيْهِ كَنْزاً او تَكُونُ لَهُ جَنَةٌ يَأكُلُ مِنْها ﴾ یا بۆ فڕێ نادرێ بۆلای ئەو پێغەمبەرە لــە ئاسمانەوە گەنجینەیە پڕ لـەزێڕو زیو خۆی پێ دەربخاو پێویستی بە پەیدا کردنی هۆی ژیـان نـەبێو نەڕوا بەبازاڕدا بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی، یا باغ و بێستانی هەبوایە لـە میوەکـانی بخواردایـەو بەبەروبومی ئەو باغە بژیایە، بەشی ئـەوەی بکردایـە لــەبازاڕ پـەیدای ئـەکا، ئەگـەر موحەمـەد ئەوانەی نیە خوای مەزن نایکا بە پێغەمبەرو وێنەی ئێمەیە؟

﴿ وَقالَ الظّـالِمُونَ إنْ تَتّبِعُـونَ إلاّ رَجُـلاً سَحُوراً ﴾ وە ستەمکارانی قوڕەیـش ئـەیان ووت بەتایبەتی عەبدوڵای کوڕی زەبعەری، بـەر لــەوەی موسـوڵمان ببـێ: ئێـوە دوای هیـچ کەسـێ ناکەون مەگەر دوایی پیاوێ ئەکەون جادوی لێ کراوەو شێت بوەو ئەقڵی تێك چوەو گفتوگۆی بێمانا ئەکا.

﴿ أنْظُرْ كَيْفَ ضَرَبَ لَكَ الأمْثالَ فَضَلُوا فَلا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً ﴾ تۆ تەماشا بکە بەچ جۆرێکی سەرسوڕێنەر چەندین وێنەو گفتوگۆی نابەجێ ئـەو بێباوەڕانـە بۆتـۆی ڕون ئەکەنـەوە: جـارێ ئەڵێن: بۆفریشتە یاریدەت نادا، جارێتر ئەڵێن بۆلە ئاسمانـەوە گەنجینـەی زێـڕو زیـوی بۆنایەتـە خوارەوە، جارێتر ئەڵێن: جادوت لێکراوە، دوایی بەو بۆنەوە ڕێگــەیان وون کـردوەو ناگەنـە لای ڕاتموبی وەرگرتن، دوایی توانای ئەوەیان نیە بگەنە ڕێگەیە بیان گەیەنێتە لای ئاواتی خۆیان، دوایی تۆ ڕێگەی ڕاستی خۆت بگرەو منیش یارمەتیت ئەدەم و گرنگی بەوان مەدە.

﴿ تَبارَكَ الّذِي إن شاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْراً مِنْ ذلِكَ جَنّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الأنْـهارُ وَيَجْعَـلُ لَـكَ قُصُوراً ﴾ یەکجار زۆرە چاکەی خوایەکی ئەوتۆ دروستی کردوە بۆ تۆ شتێ چاکترە لەوەی بێ باوەڕان داوای ئەکەن و تۆ بتبێ لـەجیهاندا، ئەو شتە چاکەیە بریتیە لـە چەندین بەهەشت ئـەڕوا بەژێر درەختەکانیا و بەم لاولای کۆشکەکانی چەندین ڕوباری ئاوی شیرین وبۆ تـۆی دروسـت کردوە چەندین کۆشکی نایاب وبەرز. تۆ لـەواندا دائەنیشی ، پێویستت بەوانەی جیهان نیە. ئەو بێ باوەڕانە خراپتر لـەو شتانەی بەتۆی ئەڵێن، واز لـەبەدرۆخستنەوەی تـۆ نایـەرن لـەگـەڵ ئـەو هەموو بەڵگە پەك خەرانەیش ئەمەیە خوای مەزن ئەیفەرموێ:

﴿ بَلْ كَذَّبوا بِالسَّاعَةِ وَ اعْتَدْنا لِمَنْ كَذَّبَ بِالسَاعَةِ سَعِيراً ﴾ بەڵکو خراپتر لەوانە ئەو بێ باوەڕانە هاتنی ڕۆژی داویی بەدرۆ ئەخەنەوەو گوزەرانی جیهان فریوی داون وگومانیان وایە پلەو پایەی بەرز بریتیە لە دارایی وسامان و، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ کەسێ هاتنی ڕۆژی داویی بەدرۆ بخاتەوە لەڕۆژی دواییدا ئاگرێ کلپەی بێ و زۆر گەرم وسوتێنەر و خاوەن ئازارە.

﴿ إذا رَأتْهُمْ مِنْ مَكانٍ بَعِيْدٍ سَمِعُوا لَها تَغيظا وَزَفِيْراً ﴾ کاتێ ئەو بێ باوەڕانە لەجێگەی دوورەوە ئەو ئاگرە ئەوانە ببینێ لەگەڵ دووریشیان لەو ئاگرە دەنگی کوڵان وکڵپەی ئەو ئاگرە ئەبیسن بەوێنەی دەنگی کەسێ ڕقی هەڵسابێ ورقەکەی لەدڵیا بکوڵێ ودەنگێکی زۆر سەختتر ودرێژتر ئەبیسن بەوێنەی دەنگی پیاوێ لەڕقدا هەناسەیەکی درێژ هەڵکێشێ.

بۆ زانین: زانایان لەماناکردنی ئەو ڕستانەدا بیرو بۆچوونیان جیاوازە: هەندێکیان بەوجۆرەی پێشوو مانایان کردون. هەند' تریان ئەڵێن : کاتی ئەو ئاگرە بێ باوەڕان ئەبینێ لەجێگەی دورەوە بێ باوەڕان کڵپەی ئەو ئاگرە و دەنگی سەخت ودرێژی ئەو ئاگرە ئەبیسن، بەلایانەوە وایە لەمەودوا خوای مەزن گیان و ئەقڵ بۆ ئاگر دروست ئەکا. هەندێ تریان ئەڵێن: ناوەڕۆکی ئەو ڕستانە هێمایە لەسەختی سزای ئاگر.

﴿ وَإذا ألْقُوا مِنْها مَكاناً ضَيْقاً مُقَرَّنِينَ دَعُوا هُنالِكَ ثُبوراً ﴾ وە کاتێ ئەو بێ باوەڕانە فڕێ ئەدرێنە جێگەیەکی زۆر تەنگ لەئاگری دۆزەخدا بەپێون کراوی، بەزنجیر دەستیان ئەبەسترێ بە ملیانەوە، لەوکاتەداو لەو جێگە تەنگەدا ئەو بێ باوەڕانە داوای نەمان ومردن ئەکەن هەتا ڕزگاریان ببێ لەو سزا سەختەی دۆزەخ.

﴿ لا تَدْعُوا الْيَومَ ثُبوراً واحداً وَّادْعُوا ثُبوراً كَثِيْراً ﴾ دوایی بەجۆرێکی گاڵتە پێکردنیانەوە بەوبێ باوەڕانە ئەبێژرێ: ئێوە لەم ڕۆژەدا داوای نەمان مەکەن یەکجار و ئێوە داوای نەمان ومردن بکەن زۆرجار، بێ سودە ڕزگارتان نابێ، سزاکانیان هەرچەندە زۆر سەختە. بەڵام بەزۆر جۆری سزای سەختی ئاگر سزایان ئەدرێ، بۆ هەر یەکە لەو سزایانە داوای نەمان ئەکەن، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ داوای نەمان بکەن زۆر جاران.

﴿ قُلْ أذلِكَ خَيْرٌ أمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كانَتْ لَهُمْ جَزاءً وَمَصِيْراً ﴾ تۆ بڵێ بەو بێ باوەڕانە بەسەرزەنشتەوە: ئایا ئەو ئاگرەی ئەوتۆ ئامادەکرابوو بۆ ئێوە چاکترە یائەم بەهەشتە بەرین و بەردەوامەی ئەوتۆ خوای مەزن بەڵێنی داوە بیدا بەو کەسانەی لەخوا ترساون وخۆیان پاراستوە لەبێ فەرمانی خوای مەزن، دوایی ئەوەی پاداشتی کردەوەی ئەو کەسانەیەو جێگەی گەڕانەوەی ئەوانە لەپاشەڕۆژدا.

﴿ لَهُمْ فِيْها ما يَشاؤُونَ خالِدِيْنَ ﴾ بۆ ئەو لە خوا ترساوانە هەیە لەناو بەهەشتا هەرشتێ ئارەزووی بکەن لەخواردن و لەجێگەی ڕابواردن وبەرگ بەردەوامن لەو بەهەشتەدا هەتا هەتایە.

﴿ كانَ عَلى رَبِّكَ وَعْداً مَسْؤُولاً ﴾ بەڕاستی ئەو بەڵێنەی ئەوتۆ خوای مــەزن بـەڵێنی دابـو بیدا بە لەخوا ترسان بەڵێنێ بوداوای پێ کرابوو لەلایەن ئەو کەسانەوە لەخوا ترسابون لەلایەن خۆیان ولەلایەن فریشتەکانەوە. خۆیان ووتویانە:

﴿ رَبَّنا وآتِنا ما وَعَدْتَنا عَلى رُسُلِكَ ﴾ وە فریشتەکان ووتویانە : ﴿رَبَّنا وَ أدْخِلْهُمْ فِي جَنّاتِ عَدْنٍ التّي وَعَدْتَهُمْ ﴾.

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَما يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە خوای مەزن ئەو بێ باوەڕانە کۆئەکاتەوە لەڕۆژی دواییدا لـەگەڵ شتێئەوان ئەیان پەرستن لـەگــەڵ فریشـتەکان و جنۆکەو عیساوعوزەیر وئەوبتانەی خوای مەزن لەو ڕۆژەدا ئەیان یەرێتە گفتوگۆکردن .

﴿ فَيَقُولُ أأنْتُمْ أضْلَلْتُمْ عِبادِي هَؤلاءِ أمْ هُمْ ضَلّوا السَّبِيْلَ ﴾ دوایی خوای مەزن پرسیار لـەو پەرستراوانە ئەکا لـەبەرئەوەی ئەو کەسانەی ئەوانیان پەرستوە سەرشۆڕ بـبن و ڕسوا بکرێن. ئەفەرموێ:

ئایا ئێوە ئـەی پەرستراوەکان ئـەم بەندانـەی منتـان لـەڕێگـەی ڕاسـت لاداوە ، داواتـان لێ کردوون بۆلای پەرستنی ئێوەو وازیان لـەوە هێناوە گوێ بگرن لـە گفتوگۆی پێغەمەرەکانی مـن، یا خۆیان خۆیانیان لـەڕێگەی ڕاست لاداوە بەبێ ئێوەو بێ فەرمانی منیان کردوە؟

﴿قالُوا سُبْحانَكَ ماكانَ يَنْبَغِي لَنا أنْ نَتَّخِذَ مِنْ دُونِكَ مِنْ أوْلِياءَ ﴾ پەرستراوەکان کـە فریشتە پاکەکان وپێغەمەرە بێ گوناهەکان و بتە بێتواناکـانن بەسەرسـوڕمانەوە ئـەڵێن: پـاك وخـاوێنی دوری لـەشتی ناشایستە بۆ تۆیە ئەی پەروەردگاری ئێمە: شایستە نیەو ڕاست نیـە بـۆ ئێمـە کـە ئێمە وەربگرن و بپەرستین لـە جگەی تۆ هیچ خوایە تر، ئێمە بەنیازی پاکەوە هەر تۆ ئەپەرستین ولـەتۆ ئەترسین وبەتەمای پاداشتی تۆین.

﴿ وَلكِنْ مَتَعْتُهُمْ وَ آباءَهُمْ حَتّى نَسُوا الذِّكْرَ وَكانُوا قَوْماً بُـوراً ﴾ وە بـەلام تـۆ ئـەی خـوای مەزن ئەو بێ باوەڕانە وباوکەکانی ئەوانت بەرخوردار کـردوەو گوزەرانـی خـۆش و دارایـی و ماڵی زۆر و لـەشی ساغت پێ بەخشیون هەتا وایان لێ هاتوە وازیان لـەپەرستن و یادی تۆ هێناوە، سوپاسی تۆ نەکەن لـەسەر ئەو چاکانەو، ئەو بـێ باوەڕانـە تـاقمێکن لـەناوچون بـەهۆی کـاری خراپیانەوەو کوێرن لـەئاستی ڕاستی وچاکەیان تێدا نیە.

﴿ فَقَدْ كَذّبُوكُمْ بِما تَقُولُونَ ﴾ دوایی کاتی پەرستراوەکان بـێزاری خۆیانیـان دەربـڕی لـەو کەسانە ئەیان پەرستن خوای مەزن ئەفەرموێ: بەڕاستی خواکانتـان ئێوەیـان بەدرۆخستەوە کـە ئێوە ئەڵێن: ئەوانە خوای ئێمەن وئێمەیان لاداوە لـەڕێگەی ڕاست. کاتێ ئێـوە بەڵگـە لـەدژتان پەیدا بو:

﴿ فَما تَسْتَطِيْعُونَ صَرْفاً وَلا نَصْراً ﴾ دوایی ئێوە توانای ئەوەتان نابێ سزا لــەخۆتان لادەن و تواناتان نیە پەرستراوەکانتان یارمەتیتان بدەن و بۆتان بپارێنەوە.

﴿ وَمَنْ يَظْلِمْ مِنْكُمْ نُذِقْهُ عَذاباً كَبِيْراً ﴾ وەهەرکەسێ ستەم لـەخۆی بکاو جگەی خوای مەزن بکا بەهاوبەشی خوا لـەپەرستندا شایستەی ئەوەیە ئێمـە ئەچـەژێنین بـەو کەسـە سزای گـەورە وبەردەوام ئەبێ سزاکەی بت پەرستان ئەیان ووت: موحەمەد چۆن ئەبێ پێغەمەر بێ کـەخواردن بخواو بگەڕێ بەبازارا ؟ خوای مەزن سەرشۆڕی کردن وفەرموی:

﴿ وَما أرْسَلْنا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِيْنَ إلا أنَهُمْ لَيَأكُلُونَ الطّعام وَيَمْشُونَ فِي الأسْـواقِ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان نەکردوە لـەپێش تۆوە هیـچ کەسـێ لــەنێرراوەکانی ئێمـە بـۆ لای ئـادەمیزاد مەگـەر بەڕاستی کە ناردومانن خواردن ئەخۆن و ئەگەڕێن بــەبازاڕ، ئیتر بۆچی بـێ بـاوەڕان سـەریان سوڕئەمێنێ کە تۆیش کارێ بکەی ئەوان کردبێتیان .

﴿ وَجَعَلْنا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً ﴾ وە ئێمە هەندێ لە ئێوە تاقی ئەکەینەوە بەهەندێ ترتان:ئادەمیزاد تاقی ئەکەینەوە بەناردنی پێغەمەران ئایا باوەڕیان پێ ئەهێنن یانە؟ ئەم جیهانە جێگەی تاقی کردنەوەیە: ساماندااران تاقی ئەکەینەوە بەسامانەکەی ، هەژاران بەهەژارێتی. کەواتە ساماندار ئەبێ دەست گیرۆیی هەژاران بکا، هەژاریش ناسوپاسی خوای مەزن نەکا.

﴿ أَتَصْبِرُونَ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيراً ﴾ ئایا ئێوە ئارام ئەگرن لەسەر ئەو تاقی کردنەوەیەو ،خوای مەزن وپەروەردگاری تۆ ئاگاداری ئەو کەسانەیە بوختان بەپیاوچاکانا ئەکەن، ئاگاداری ئەو کەسانەیە بەردەوامن لەسەر ڕاستی. کەواتە ئێوەی باوەڕدار بەردەوامبن لەسەر ڕاستی. خوای مەزن هەموو شتێ ئەزانێ. بەڵام ئادەمیزاد تاقی ئەکاتەوە لەبەرئەوەی دانیشتوان بیان ناسن.

**کۆتایی بەماناکردنی جزمی ( ١٨ ) هات**

**( ٢٣ ) ی موحەرەم ( ١٤٢١ ) کۆچی بەرانبەر ٢٧/ ٤/ ٢٠٠٠**

بەناوی خـوای بەخشـندەی میـهرەبان درودی بێپایـان لـەسـەر پێشـەوای بونـەوەران ولـەسـەر یـارو یـاوەران و پـەیڕەوانی بـێ. بـەیاریدەی خـوای مەزنـەوە دەسـت ئەکـەن بەماناکردنی جزمی نۆزدەهەم .

وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ﴿٢٩﴾

﴿ وَقالَ الَّذِينَ لا يَرْجُونَ لِقاءَنا لَوْلا اُنْزِلَ عَلَيْنا الْمَلائِكَةُ أوْ نَرى رَبَّنـا ﴾ وەکەسـانێکی ئەوتۆ بەئومێدی ئەوە نین تووشی سزای ئێمە بن بەوبۆنەیەوە بڕوایان بەزیندوو بونەوە نیـە ئەڵێن:بۆچی فریشتە نانێرێتە سەر ئێمە بن بەنێرراوی خـوای مـەزن بـۆلای ئێمـە هـەاوڵ بدەن بەئێمە موحەمەد ڕاست ئەکا، یا بۆ ئێمە خوای پەروەردگاری ئێمە نابینین فـەرمانمان پێ بدا موحەمەد ڕاست ئەکا وپێمان بڵێ: موحەمەد ڕەوانە کراوی ئێمەیە بۆلای ئێوە.

﴿ لَقَدْ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ وَعَتَوا عُتُواً كَبِيْراً ﴾ بەراستی ئەو بت پەرستانە خۆیان بەگەورە دائەنا لەدەروونی خۆیانا،داوای شتێکیان ئەکرد لە پێغەمەر لەدەستەلاتی پێغەمەرانی بەندەی خوای مەزندا نیە، وە ئەو بێ باوەڕانە یاخی بوون لەفەرمانی خوای مەزن بەیاخی بونێکی گەورەو لەسنووری خوای مەزن دەرچوون بەوکارە پەکخەرانە تەمێ خوارنەبوون وداوای بینینی خوای مەزنیان ئەکرد.

﴿ يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلائِكَةَ لا بُشرى يَوْمَئِذْ لِلّمُجْرِمِيْنَ ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوەو ئەو ڕۆژەیان بۆ باس بکە بێ باوەڕان فریشتەکانی سزا ئەبینن، کەفریشتەکان ئەڵێن بەبێ باوەڕان: مژدەی خۆشی لەم ڕۆژەدا بۆ کەسانی تاوانبار نیە، ئەو ڕۆژە سەختە لێ بوردن وپاڕانەوە بۆ ئەوان نیە، چونکە بێ شەرمانە داوای بینینی خوای مەزنیان کردوە.

﴿ وَيَقُولُونَ حَجْراً مَحجُوراً ﴾ وە تاوانباران لەبەر ترسو ناخۆشی ئەو ڕۆژە ئەڵێن بەفریشتەکان نارەواو قەدەغە کراو بێ ئازاردان و سزادانی ئێوەی فریشتە بۆ ئێمە، ئەوەندە گێل ونەزانن وائەزانن ئەو جۆرە گفتوگۆیە سوود ئەبەخشێ بەوان. هەندێ لەزانایان مانای ئەو ڕستانەیان بەم جۆرە کردوە: فریشتەکان بەتاوانباران ئەڵێن:نارەوایەو ڕەوا ناکری بۆ ئێوە لەم ڕۆژەدا شتێ ببینن یا ببیسن ئێوە پێتان خۆشبێ، هەردوو ماناکە دروستەو ئەگەڕێنەوە بۆلای یەك مەبەست. کەتاوانباران ئەترسن لەخراپەو ناهەمواری ئەو ڕۆژە بۆ ئەوان.

﴿ وَقَدِمْنا إلى ماعَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْناهُ هَباءً مَنْثُوراً ﴾ وە ئێمە ڕوئەکەین بۆلای شتێ بێ باوەڕان کردویانە لەجیهاندا لەکارە چاکەکانیان، وەك سەردانیان لەخزم ومیوان ڕاگرتن ویارمەتی دانی لێقەوماوان ویاریدەی ستەم لێ کراوان، دوایی ئێمە ئەوکارەی ئەوان ئەگێڕین بەتۆزێکی وردی بلاوبویەوە بەئاسماناو خۆر لێی ئەداو ئەبینرێ لەبێ نرخی وبی سودی دا، چونکە بنچینەیان دانراوە لەسەر بی باوەڕی ونیازی خراپ، هەرشتێ لەبێ باوەڕیدا بکرێ بێ سوودە.

﴿ أَصْحابُ الْجَنَّةِ يَوْمَئِذْ خَيْرٌ مُسْتَقِراً وَأَحْسَنُ مقيلا ﴾ دانیشتوانی بەهەشت لەڕۆژی دواییدا لەچاکترین جێگەدان لەبارەی ئارامگایانەوەو لەشیرینترین جێگەدان لەبارەی پشودانەوە، هەست بەخۆشی وئاسایش ئەکەن.

﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّماءُ بِالغَمامِ وَنُزِّلَ الْمَلائِكَةُ تَنْزِيلاً ﴾ وەتۆ بیری بێ باوەڕانی بخەرەوە سەختی ڕۆژی دوایی کاتێ ئاسمان پارچە پارچە ئەبێ و ئەستێرەکان کێشیان نامێنێ وئەکەونە خوارەوە، ئەتوێنەوەو بۆشایی پڕ ئەبێ لەتەم و لەهەورو فریشتەکان ئەنێررێنە خوارەوە بەناردنە خوارەوەیە بەنامەی کردار یان پێیە بۆ خاوەنەکانیان.

﴿ الْمُلْكَ يَوْمَئِذْ الْحَقُّ لِلْرَحْمن ﴾ دەستەلاتی بێ وێنەو خاوەنیەتی ڕاست و پایەدار لەڕۆژی دواییدا بۆ بونەوەران بەتەنها هەر بۆ خوای خاوەن بەخشندەیەو خوای مەزن لەو ڕۆژەدا بێ هاوتاو بێ وێنەیە، لافو گزاف باوی نامێنێ.

﴿ وَكانَ الْيَوْمُ عَلى الْكافِرِيْنَ عَسِيْراً ﴾ وە ئەو ڕۆژەی دوایی ڕۆژێکە زۆر سەخت وگرانە لەسەر بێ باوەڕان، چونکە لەو ڕۆژەدا بەووردی پرسیارو وەڵام دێتە کایەوە لەلایەن خوای مەزنەوەو بێ باوەڕان بێ چاکەن.

﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلى يَدَيْهِ يَقُولُ يا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيْلاً ﴾ وەئەی نێرراوی خوا تۆ باسی ئەو ڕۆژە بکە بۆ بێ باوەڕان کە ستەمکاران گاز ئەگرن لەهەردوو دەستی خۆیان لەداخ وخەفەتا، ئەو ستەمکارانە ئەڵێن: خۆزگایە من وەرم بگرتایە لەگەڵ نێرراوی خوای مەزندا بۆلای ڕزگاریو ڕاغومایی کە ئایینی ئیسلامە.

﴿ ياوَيْلَتا لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاناً خَلِيْلاً ﴾ ئەی هاوارو نەمان بۆ من: خۆزگایە من فلان کەسم وەر نەگرتایە بەدۆست بۆخۆم . مەبەست لەدۆست لێرەدا هەمو دۆستێکە ڕێگەی خوارو خێچ بگرێ وهەوڵی ئەوەبدا هاوڕێکانی خۆی بخاتە سەر ڕێگەی چەوت وخراپ، ئیتر ئادەمیزاد بێ یا شەیتان.

بۆ زانین: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەت ئەوەبوو: عوقبەی کوڕی ئەبوو موعەیت زۆر جاران لای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دائەنیشت، وایش ئەبو پێغەمەری بانگ ئەکرد بۆ نان خواردن، پێغەمەر جارێك فەرموی: ئەگەر شایەتمان نەیەری نانەکەت ناخۆم، ئەویش شایەتمانی هێنا ،ئوبەی کوڕی خەلەف کەدۆستی عوقبە بو بەعوقبەی ووت: تۆ لەئایینی باوباپیری خۆت وەرگەڕاوی، ئەویش ووتی: لام نەداوەو وەرنەگەڕاوم. بەلام لەخانەی خۆمدا شەرمم کرد، بەدەم شایەتمانم هێناوە نەك بەدڵ. ئوبەی ووتی: نایەمە خانوی تۆو نانت ناخۆم هەتا لەقەیە نەدەی لەپشتی موحەمەد وتفێ نەکەیتە ناوچاوانی، عوقبە چوو بۆلای پێغەمەر کەلە سوژدەدا بو لەقەیەکی دا لەپشتی پێغەمەرو تفیشی کردە ناوچاوانی. پێغەمەر فەرموی: مەرجبێ کە لەدەرەوەی مەککە تووشت ببم شمشێرێ بدەم لەملت وسەرت ببڕم. عوقبە لەڕۆژی بەدردا بەدیل گیرا، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا بەعەلی وکوشتی، پێغەمەریش بەدەستی خۆی ئوبەی کوڕی خەلەفی کوشت.

﴿ لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جاءَنِي ﴾ عوقبە ووتی: بەڕاستی ئوبەی کوڕی خەلەفی دۆستی من منی لادا لەقورئانی پیرۆز دوای ئەوەی باوەڕم هێنابو کاتێ هات بۆلای من وشایەتیمانم هێنا بەئایینی ئیسلام .

﴿ وَكانَ الشَّيْطانُ لِلإِنْسانِ خَذُولاً ﴾ وەشەیتان دوژمنی ئادەمیزادە خۆی لایداوە لەڕێگەی ڕاست و ئادەمیزاد لەڕێگەی ڕاست لائەدا، کاتێ لە ڕێگەی ڕاست لایدا وازی لێ ئەهێنێ وبێزار ئەبێ لەو بێ باوەڕە. ئیتر ئەو شەیتانە ئادەمیزادبێ یا جنۆکە .

وَقَالَ ٱلرَّسُولُ

يَـٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَـٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ
جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا
وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ
وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾
وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ﴿٣٣﴾
ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَـٰٓئِكَ شَرّٞ
مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ
وَجَعَلۡنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرٗا ﴿٣٥﴾ فَقُلۡنَا ٱذۡهَبَآ إِلَى
ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرۡنَٰهُمۡ تَدۡمِيرٗا ﴿٣٦﴾ وَقَوۡمَ
نُوحٖ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغۡرَقۡنَٰهُمۡ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ لِلنَّاسِ
ءَايَةٗۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِلظَّـٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿٣٧﴾ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ
وَأَصۡحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونَۢا بَيۡنَ ذَٰلِكَ كَثِيرٗا ﴿٣٨﴾ وَكُلّٗا ضَرَبۡنَا
لَهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَۖ وَكُلّٗا تَبَّرۡنَا تَتۡبِيرٗا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ أَتَوۡاْ عَلَى ٱلۡقَرۡيَةِ
ٱلَّتِيٓ أُمۡطِرَتۡ مَطَرَ ٱلسَّوۡءِۚ أَفَلَمۡ يَكُونُواْ يَرَوۡنَهَاۚ بَلۡ
كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ نُشُورٗا ﴿٤٠﴾

﴿ وَقالَ الرَّسُولُ يا رَبِّ إنَّ قَوْمِي إتَّخَذُوا هَذا الْقُرآنَ مَهْجُوراً ﴾ وە نێرراوی خوای مەزن فەرموی: ئیتر لەجیهاندا بوبێ یا لەڕۆژی دواییدا بێ: ئەی پەروەردگاری من: بەڕاستی ئەم تاقمەی من وازیان لەم قورئانە هێناوەو باوەڕی پێ نایەرن وگاڵتەی پێ ئەکەن. پێغەمەری خوای مەز نلەکاتێکا ئەو سکاڵایەی بردە لای خوای مەزن کە گەورەکانی قورەیش لەترسی نەمانی سەرۆکایەتی وسامانی خۆیان بوختانیان ئەدایە پاڵ قورئان.

﴿ وَكَذلِكَ جَعَلْنا لِكُلِّ نَبِيٍ عَدُواً مِنَ الْمُجْرِمِيْنَ ﴾ وە هەر بەوجۆرەی ئێمە بت پەرستانی مەککەمان گێڕاوە بەدوژمن بۆ تۆ هەر بەوجۆرە ئێمە گێڕابومان بۆ هەمو پێغەمەرێ دوژمنێ لەتاوانباران. زۆر ڕون وئاشکرایە هەرکەسێ داوای پەیڕەو پرۆگرامی چاك بکا تاوانباران بەرەنگاری ئەو کەسە ئەوەستن لەزۆر کات ولەزۆر جێگەدا. کەواتە تۆ خەفەت مەخۆ کەواتە ئارام بگرو پشت ببەستە بەخوای مەزن.

﴿ وَكَفى بِرَبِّكَ هادِياً وَنَصِيْراً ﴾ وەبەسە بۆتۆ پەروەردگاری تۆ ڕێگە بەتۆ نیشان بدا بۆلای سەر شۆڕ کردن ودەستەلات پەیدا کردن بەسەر بی باوەڕندا، یاریدەری تۆ بێ وسەرت بخا بەسەریانا.

﴿ وَقالَ الَّذِيْنَ كَفَرُوا لَوْلا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرآنَ جُمْلَةً واحِدَةً ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابو ووتیان: بۆچی قورئان نەنێرراوەتە خوار بۆ سەر موحەمەد بەیەکجاری ، بەوێنەی تەورات ئینجیل ئەوبێ باوەڕانە سود لەقورئان وەرناگرن، ئیتر بەجاری بێتە خوارەوە یا بەپارچە پارچەیی و شێوەی پەکخەری قورئان کاریان تێ ناکا.

﴿ كَذلِكَ لِنُثَبِتَ بِهِ فُؤادَكَ وَرَتَّلْناهُ تَرْتِيْلاً ﴾ هەربەوجۆرە قورئان نێرراوەتە خوارەوە بەپارچە پارچەیی لەماوەی بیست و سێ ساڵدا، لەبەر هێز پەیداکردنی دڵی تۆ بەهاتنە خوارەوەی جبرەئیل جار لەدوای جار ولەبەرئەوەیش ئاسانێ لەسەر تۆو لەسەر باوەڕداران لەبەرکردنی و تێگەیشتن لەناوەڕۆکی قورئان، تۆو موساو عیسا زۆر لەیەك جیاوازن ئەوان ئەیانزانی بنوسن و خوێنەوار بون بەڵام تۆ نەخوێنەواری نازانی بنوسی وناتوانی لەبەری بکەی ئەگەر یەك جار بێتە خوارو، ئێمە قورئانمان خوێندوەتەوە بەسەر تۆدا پارچە بە پارچە لەماوەی بیست و سێ ساڵدا هەر لەبەر ئەوەی ئاسانی لەبەرکردنی ولەبەرئەوەیش پرسیاری ڕووداوی تازە پەیدا ئەبو لەماوەی جیاوازداو ئەبوایە وەڵامی بدرایەتەوە.

﴿ وَلا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إلا جِئْناكَ بِالْحَقِّ وَأحْسَنَ تَفْسِيْراً ﴾ وە بی باوەڕان نایەرن بۆ لای تۆ هیچ جۆرە وێنەیە بیانەوێ داواکاری تۆ پوچ بکەنەوەو خراپە لەپێغەمەرایەتی بگرن، بەوەی ئەڵێن: ئەبوایە تۆ گەنجینەیە لەزێڕو زیوت ببوایە، فریشتەکان لەلایەن خوای مەزنەوە بهاتایە داواکاری تۆی بەڕاست بگێڕایە ،قورئان بۆ بەیەکجار نەهاتوەتە خوارەوە مەگەر کە

بەوجۆرە هاتن بۆلای ئێمە بەخشیومانەبەتۆ ڕاستێکی ئەوتۆ داواکاری پوچی ئەوان ئەشۆڕێتەوە، ئەبەخشین بەتۆ شیرینترینماناو دەرخستنی ڕاستی.

﴿ الَّذِيْنَ يُحْشَرُونَ عَلى وُجُوهِهِمْ إِلى جَهَنَّمَ أُولئِكَ شَرٌّ مَكاناً وَ أَضَلُّ سَبِيلاً ﴾ تۆ بڵێ بەبێ باوەڕان کەسانێکی ئەوتۆ کۆئەکرێنەوە لەڕۆژی دواییدا لەسەر ڕومەتیان ڕائەکێشرێن بۆلای دۆزەخ ئەو کەسانە لەخراپترین جێگەدان وخراپترین بونەوەری خوای مەزن وخراپترین کەسێکن لەڕێگەی ڕاست لایانداوە، چونکە شتێکیان پەرستوە کە ڕو نەزان بوەو هیچ سودێ‌بەوان نابەخشێ.

دوای ئەوەی خوای مەزن ڕونی کردەوە کە هەموو پێغەمەران دوژمنیان هەبوە دوای ئەوەیش باسی هەندێ لەپێغەمەران و بەسەرهاتیان ئەکاو چۆن خوای مەزن بنەبڕی کردوون، ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنا مُوسى الْكِتابَ وَجَعَلْنا مَعَهُ أَخاهُ هارونَ وَزِيْراً ﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەخشیبومان بەموسا نامەیە کەتەوراتە وەگێرا بۆمان لەگەڵ موسادا براکەی خۆی کەهارونە بەیاریدەدەرو پشتیوان بۆ موسا. کەواتە هەرتۆ بەتەنها بەدرۆ نەخراویتەوە.

﴿ فَقُلْنا إِذْهَبا إِلى الْقَوْمِ الَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِآياتِنا فَدَمَّرْناهُمْ تَدْمِيْراً ﴾ دوایی ئێمە بەموساو هارونمان ووت: ئێوە بڕۆن بۆلای فیرعەون وتاقمەکەی بەچەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر یەکێتی ئێمە کەلەخۆیاناو لەهەموو جیهانا دەرکەوتوە، دوایی ئێمە ڕۆیشتین بۆلایان بەچەندین کاری پەکخرەوە ئەوان ئەو بەڵگانەیان بەدرۆخستەوەو باوەڕیان پێ نەهێنان،دوایی لەناومان بردن بەلەناوبردنێکی زۆر سەخت وناهەموا.

﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ لَمّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْناهُمْ ﴾ وەئێمە تاقمی نوحمان لەناوبرد کاتێ نوحیان بەدرۆخستەوە ،دوایی نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناویانامابوەوە، نەوە لەدوای نەوە، دووایەکانیان چاکتر نەبون لە پێشوەکانیان ئێمە ئەوانمان خنکان بەئاوی تۆفان، لەبەرئەوەی نوح ماوەیەکی زۆر لەناویانا مابوەوە وەك چەند پێغەمەرێ چوبێ بۆ لایان بۆیە خوای مەزن فەرموی: ﴿الرُّسُلَ ﴾ بەووشەی کۆمەڵ.

﴿ وَجَعَلْناهُمْ لِلْناسِ آيَةً وَّ أَعْتَدْنا لِلْظّالِمِيْنَ عَذاباً أَلِيْماً ﴾ وەئێمە ئەو خنکاندنەی ئەوانمان گێڕا بەتەمێ کردن بۆ ئەو ئادەمیزادانە لەدوای ئەوانەوە دێن و، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ هەمو ستەمکاران کە باوەڕ بەپێغەمەرەکانیان ناهێنن سزایەکی زۆر خاوەن ئازار لەهەردوو جیهاندا.

﴿ وَعاداً وَثَمُوداً وَ أَصْحابَ الرَّسِّ ﴾ وە ئێمە لەناومان برد عادی تاقمی هود وسەمودی تاقمی ساڵح و دانیشتوانی لای بیرێ کە بتیان ئەپەرست و دوایی شوعەیبمان نارد بۆلایان

وبەدرۆیان خستەوەو، دوایی کاتێ لەلای ئەو بیرە بـون، بیرەکـە ڕوخـا بەسـەریانا وخۆیـان ونیشتمانیان چون بەناو زەویدا. زانایان بۆ دیاری کردنی ئـەو چـاڵاوە بیریـان جیـاوازە: ئایـا چاڵاوێ بوە لەتوهامە، یا لەئازربایجان، یا لەئەنتاکیە، یا چاڵاوی ئەسەد، یا ئەو چاڵە درێژەیە ناوی براوە لەسورەتی ( ئەلبورجدا ) یا لە چەن جێگەیە تر بـێ، ئـەوەی ڕاستی بـێ نـاوی چالاوی تاقمی شوعەیبە کە هەمویان لەناوچون بەڕۆچوونی ئە وچاڵاوە.

﴿ وَقُروناً بَيْنَ ذلِكَ كَثِيْراً ﴾ وە ئێمە لەناومان بردن چـەند تاقمـێ تـری زۆر لـەنێوان ئـەو تاقمانەدا ئێمە لەناومان بردن چونکە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە.

﴿ وَكُلاًّ ضَرَبْنا لَهُ الأَمْثالَ وَكُلاًّ تَبَّرنا تَتْبِيْراً ﴾ وە ئێمە ڕونمـان کردبـوەوە بـۆ هـەموو تاقمـێ سزای ئەو تاقمانەی ئەوتۆ لەپێش ئەوانەوە بوون، جۆرەها ئامۆژگاری ولێدانی چەندین وێنەمان بۆ باس کردون، دوای ئەوەی باوەڕیان نەهێنا ئێمە ئەوانمان لەناوبردن بەلـەناوبردنێکی سـەخت وگران، مەگەر کەسێ باوەڕی هێنابێ.

﴿ وَلَقَدْ أتَوا عَلى القَرِيَةِ الَّتِي أمْطِرَتْ مَطَراً السَّوءِ أفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَها بَـلْ كـانُوا لايَرْجُـونَ نُشُـوراً ﴾ وەبەڕاستی قورەیشەیکان چوون و تێپەڕبوون بەسەر ئەو گوندەی ئەوتۆدا بارێنرابوو بەسەریانا بـارانێکی خراپ و لەلایەن خوای مەزنەوە بەردی بەسەریانا باراند و لەناوچوون، ئەو گوندەیش بریتی بـوو ولـە شاری سەدومی گەورە کە بەهۆی داوێن پیسیەوە خوای مەزن بنەبڕی کـردن، ئایـا قورەیشـیەکان ئـەو گوندەیان نەبینی بوو کەهاتوچۆیان ئەکرد بۆ بازرگانی لەمەکەوە بۆلای شام. بەڵکو ئەو بـت پەرسـتانە بە ئومێدی زیندوبونەوەیە نەبوون پێویست بکا پرسیارو سزادانیان لەڕۆژی دواییدا.

وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلَا أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾

﴿ وَإِذا رَأَوْكَ إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلاّ هُزُواً أَهذا الَّذِي بَعَثَ اللهُ رَسُولاً ﴾ وە هەرکاتێ ئەو بت پەرستانە تۆیان ئەبینی، تۆ وەرناگرن مەگەر بەجێگەی گاڵتە کردن بەتۆ، ئاماژە ئەکەن بۆلای تۆو ئەڵێن: بەگاڵتە کردنەوە: ئایا ئەوەیە کەسێکی ئەوتۆ خوای مەزن کردویەتی بە نێرراوی خۆی. ئەو ئایەتە لەبارەی ئەبو جەهلەوە هاتوەتە خوارەوە.

﴿ إِنْ كادَ لَيُضِلُّنا عَنْ آلِهَتِنا لَوْلا أَنْ صَبَرْنا عَلَيْها ﴾ بەڕاستی نزیك بوو ئەو نێرراوە ئێمە لابدا لەپەرستنی خواکانمان ئەگەر ئێمە ئارامان نەگرتایەو بەردەوام نەبوینایە لەسەر پەرستنیان. لەئایەتی پێشوودا ئەیان ووت: ئایا ئەمەیە نێرراوی خواو باوەڕیان پێی نەبوو، کەچی لەم ڕستەیەدا ئەوەی هەستی پێ بکەن ئەڵێن: موحەمەد ئەوەندە کاری پەکخەری هێنابوو نزیکبو لامانبدا لەپەرستنی بتەکانمان، ئەوەی ئەوان واتەگەیەنێ ئەیانزانی موحەمەد پێغەمەرە، ئەو دوو هەڵوێستەی ئەوان دژی یەکترین.

﴿ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِيْنَ يَرَوْنَ الْعَذابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيْلاً ﴾ وەلەمەودوا ئەو بت پەرستانە ئەزانن کاتێ سزای ئاگری دۆزەخ ئەبینن چ کەسێ لەڕێگەی ڕاستی ئایین لایداوە، بێگومان بت پەرستان نەك موحەمەد.

﴿ أَرَأَيْتَ مَنْ إِتَّخَذَ إِلَهَهُ هَواهُ أَفَتَكُونَ عَلَيْهِ وَكِيْلاً ﴾ ئایا تۆ نەتبینیوەو سەرت سوڕنامێنێ لەنەزانینی کەسێ شتێکی بەلاوە جوانبێ ئەیکا بەخوا بۆخۆی، بەردێ ئەپەرستێ، دوایی بەردێ تری بینی لەوبەردە جوانتر بو ئەیپەرستێ وواز لەبەردە پێشوەکە ئەهێنێ. کەواتە ئەو کەسە هەواو هەوەسی خۆی ئەپەرستێ و واز لە ڕاستی ئەهێنێ، ئایا تۆ ئەتەوێ چاودێری ئەو کەسە بکەی ونەیەڵی بت پەرستی بکاو دوای ئارەزۆی خۆی نەکەوێ، هەرکەسێ بەو جۆرە بی چاوەڕووانی چاکەی لێ ناکرێ.

﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ﴾ بەڵکو تۆ ئەزانی بەڕاستی زۆرتر لەو کەسانە شتێ بپەرستن زیان لەوان نەداو سوودیان پێ نەگەیەنێ گفتوگۆی تۆ ئەبیسن و وەری بگرن یاوورد ئەبنەوە لەشتێ ئەیلێن هەتا بەڵگەو نیشانەی بێگومان کاریان تێ بکا، تۆ بەئومێدی باوەڕهێنانی ئەوان مەبە، چونکە ئەوکەسانە گوێ لە ڕاستی ناگرن و لەهیچ شتێ وورد نابنەوە، بەلاّم کەمێکیان لەپاشەڕۆژدا پەشیمان ئەبنەوەو باوەڕئەهێنن.

﴿ إِنْ هُمْ إِلاّ كَالأَنعامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيْلاً ﴾ بەڵکو ئەو کەسانە بەوەی سوود لەوە وەرناگرن ئەی بیسن، بیرناکەنەوە لە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا، هیچ شتێ نین مەگەر وێنەی چوارپێ وان، چونکە چوارپێ ئەو شتەی خوای مەزن بەوانی سپاردوە جێبەجێی ئەکەن و فەرمانبەرداری خاوەنی خۆیانن. بەڵکو ئەو کەسانە لەچوارپێ گومڕاترن، چونکە چوارپێ چاکەو زیانی خۆیان جوێ ئەکەنەوە، ئەو بێ باوەڕانە سەرشۆڕی ڕاستی نابن و لەسزای خوای مەزن ناترسن. کەواتە هەرکەسی پەیڕەوی هەوەسی خۆی بکا چوارپێ لەو چاکترە.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سێزدە ساڵ لەمەکەدا داوای لە قورەیشیەکان ئەکرد باوەڕ بهێنن بەخوایەکی مەزنی تاك وتەنهای دادپەروەر، لەلای ئەو ڕەش وسپی و هەژارو سامانادر یەکسانن، ڕێز بۆ هیچ کەسێ دانانرێ بەجگەی لەخوا ترسانو خزمەتی ئادەمیزاد. کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نیە بت پەرستان بەفەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ تەنگەتاو ببن وئازاری بدەن وگاڵتەی پێ بکەن، بیروبۆچونی یەکسانی ئادەمیزاد بت پەرستانی ئاڵۆز کردبوو. یانی بیلالی بەندەی بێ دەسەڵات وێنەی ئەبوجەهلی خاوەن پلەوپایە بێ. بەڵکو گەورەتر، چونکە بیلال لەخوا ئەترسێ. هەروەها پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەردەوام بوو لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خۆی، لەبەردەم هێزی خراپ دا خۆی ڕاگرت، بڕوای وابوو سەرئەکەوێ، پشت بەخوا ببەستین، فێری زانست وزانیاری و دروستکردنی چەك ببین وپێویستە ئێمەی موسڵمانان لەفەرمودەو کردەوەی پێغەمەر فێری خۆراگرتن وفیداکاری بین، هەمو شتێ بەنرخبێ لامان لەڕێگەی بەرزی ئاڵای ئیسلامدا دای بنێین، لەبێ باوەڕان نەترسین باوەکو سەرباز وچەکی زۆریان هەبێ خوای مەزن لەم ئایەتانەی دوایی باسی هەندێ لە چاکەکانی خۆی بەسەر ئادەمیزادەوە ئەکا کە بەڵگەن لەسەر بوون و گەورەیی خوای مەزن .

أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ

وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾

١- ﴿ أَلَمْ تَرى إلى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَ وَلَوْ شاءَ لَجَعَلَهُ ساكِناً ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە بۆلای گەورەیی کاری خوای مەزن بە چ جۆرێ سێبەری بڵاو کردۆتەوە بۆ سوودی ئێوە، هەموو گۆشەو کەنار وتەواوی زەوی گرتوەتەوە هەر لەدوای ئاوابوونی خۆر هەتا هەڵهاتنی خۆر لەرۆژی دواییدا لەبەرئەوەی ئادەمیزاد پشووی خۆشی بدەن وماندوبونی ڕۆژیان نەمێنێ.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ لَجَعَلَهُ ساكِناً ﴾ وەئەگەر خوای مەزن ئارەزۆی بکردایە ئەو سێبەرە ئەوەستاو زەوی نەئەسوڕایەوە، بە نەسوڕانی زەوی سێبەر ئەوەستاو لانەئەچوو خۆر لای نەئەبرد.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنا الْشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيْلاً ﴾ لەپاشا ئێمە خۆر ئەکەین بەبەڵگە لەسەر بوونی سێبەر، ئەگەر خۆرنەبوایە ئادەمیزاد نەیان ئەزانی سێبەر چ شتێکە، بەڵێدانی ڕوناکی خۆر لەسەر زەوی سێبەر ئەناسرێ، بەنەمانی خۆر سێبەر ئەزانرێ .

﴿ ثُمَّ قَبَضْناهُ قَبْضاً يَسِيْراً ﴾ لەپاشا ئێمە ئەو سێبەرە بڵاوبوەتەوە بەسەر زەویدا لای ئەبەین بەهۆی توانای خۆمانەوەبەش لەدوای بەش وورده وورده بەبۆنەی سوڕانی زەوی بەدەوری خۆردا ، هەندێ لەزانایانی خاوەن بیر ئەڵێن: وێنەی گیراوی خۆر سێبەرێکی وەستاوە، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردوە بەر لەپەیدابوونی ئەوزانیاریە بەنزیکەی (١٤٢١) ساڵ لەمەوبەرو بەو جۆرە ئەبێ ووشەی (علی) بەمانا (مَعَ) بێ وەك هەندێ لەزانایان ووتویانە. کەواتە مانای ئەو ڕستەیە بەم جۆرە ئەبێ: (ئێمە گێڕاومانە خۆر لەگەڵ سێبەر بەبەڵگەیە لەسەر یەکێتی ئێمەو تەواوی توانای ئێمە).. خوای مەزن زەوی دروست کردوە بەخرێ، ئەسوڕێتەوە لەبەردەم خۆردا لە ماوی (٢٤) کات ژمێر یاکەمتر، ئەو لایەی خۆر لێی ئەدا پێی ئەووترێت ڕۆژ. نەختە نەختە خۆر بەجێی دێڵێ ئەو بەشەکەی تری پێی ئەووترێت شەو و سێبەرێکی وەستاوە.

٢- ﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الَّيْلَ لِباساً وَّ النَّوْمَ سُباتاً وَجَعَلَ النَّهارَ نشُوراً ﴾ وە پەروەردگاری تۆ کەسێکی ئەوتۆیە شەوی گێڕاوە کە ئادەمیزاد وجگەی ئادەمیزاد دائەپۆشێ

بەهۆی تاریکیەوە وەك بەرگ و، خەومان گێڕاوە بەپشودانی لەشتان و دوای ماندوبون بەهۆی پەیدا کردنی خواردن لەڕۆژدا و پەروەردگاری تۆ ڕۆژی گێڕاوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بلاو ببنەوە بۆ کارکردن و ماندو بون، دوای ئەوەی لەخەودا بێدار ئەبنەوە بۆ پەیدا کردنی هۆی ژیانیان، وەك ئەو ەوایە دوای خەوتن زیندو ببنەوە.

٣- ﴿ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّياحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ﴾ وە پەروەردگاری تۆ کەسێکی ئەوتۆیە با ڕەوانەکا بەموژدەدانی بارینی باران لەپێشەوە کەباران چاکەیەکی زۆر گەورەیە لەلایەن خوای مەزنەوە بۆ بەندەکانی .

﴿ وَ أَنْزَلْنا مِنَ السَّماءِ ماءً طَهُوراً ﴾ دوای ئەوەی با پەیدا ئەکەین و ئەخورێ لەهەور ئێمە ئەنێرینە خوارەوە لەئاسمانەوە ئاوێکی زۆر پاك کەبۆ لەشی خۆتان وبۆ خواردنەوەی هەموو زینەوەران .

﴿ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً وَ نُسْقِيَهُ مِمّا خَلَقْناهُ أَنْعاماً وَأَناسِيَّ كَثِيراً ﴾ لەبەرئەوەی ئێمە زیندوو بکەینەوەو ببوژێنینەوە بەهۆی ئەو ئاوەوە شارێکی چۆڵی ووشکی ئەوتۆ زەویەکەی بەوێنەی مردوو وایە لەبێ بەرهەمیدا، ئێمە ئەو ئاوەیش دەرخواردی چوارپێ وئادەمیزادێکی زۆری ئەدەین لەوشتانەی ئێمە دروستمان کردوون. دوای بوژانەوەی زەوی بەوئاوە زەوی ئەڕازێتەوە و بەرهەمی زۆر ئەبێ ودرەخت و چیمەن وباخ وباخات سەوز هەڵئەگەڕێن و چوارپێکان بەرهەمیان زۆر ئەبێ. خوای مەز نباسی جگەی چوارپێ و ئادەمیزادی نەکرد هەرچەندە جگەی ئەوانیش پێویستیان بەئاو هەیە لەبەرئەوەیە:جگەی ئەوان لەباڵندەو شتی تر ئەتوانن لەهەموو شوێنی خۆیان پاراو بکەنەوە بە ئاوی باران وجگەی باران لەئاوی زەریاو دەریاو ڕوبار و چالاوەکان.

﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْناهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَى أَكْثَرُ النّاسِ إِلا كُفُوراً ﴾ وەبەڕاستی ئێمە دووپاتمان کردوەتەوە باسی هەورو بارینی باران لەقورئان ولەنامەکانی تردا هەتا ئادەمیزاد بیر بکەنەوەو پەند وەربگرن و توانای گەورەی خوای مەزن بناسن، دوایی زۆۆرترینی ئادەمیزاد باوەڕیان بەچاکەی خوای مەزن نەهێناوە وسوپاسی خوای مەزنیان نەکرد. بەتایبەتی خوای مەزن باسی بارانی لەقورئانی پیرۆز بەزۆری دووپات کردوەتەوە جارێ بەناوی بەفرەوە، جارێ بەناوی تەرزەوە، جارێ بەناوی باران و دانانی لەناو زەویدا، جاری تر بەناوی ڕوبار و تەم و هەورەوە، خوای مەزن باران ڕەوانە ئەکا لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیە تر، چونکە ئەگەر بەبەردەوامی باران هەر لەجێگەیە بیارێ جێگەکانی تر لەناوئەچن ، ئەگەر بەبەردەوامی بیارێ دانیشتوان ئەخنکێن، ئەگەر هەر نەبارێ ئادەمیزاد هەمو یان لەتینوانا ئەمرن. کەواتە پێویستە هەمو مرۆڤێکی ژیر لەچاکەی خوای مەزن بیر بکەنەوەو سوپاسی چاکەکانی خوا بکەن، بەلام زۆربەی ئادەمیزاد سوپاسی خوای مەزن ناکەن.

﴿ وَلَوْ شِئْنا لَبَعَثْنا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيراً ﴾ وە ئەگەر ئێمە بمان ویستایە بۆ هەمو گوندێ پێغەمەرێکمان ئەناردو دانیشتوانی ئەو گوندەیان بترسانایە، ئەوکاتە قورسایی کاری پێغەمەرایەتی بۆ تۆ سووك ئەبو، بەلاّم ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە بۆ لای هەمو گوندێ و فەرمانی پێغەمەرایەتیمان لەتۆدا بەتەنها داناوە هەتا ڕێز و گەورەیی تۆ بەهەمو کەسێ ڕون بکەینەوەو بزانن تۆ گەورەترینی پێغەمەرانی. کەواتە تۆبەرانبەر بەو ڕێزگرتنە تۆ بەردەوام بە لەسەر ئاشکراکردنی ڕاستی ئایینی خوای مەزن.

﴿ فَلا تُطِعْ الْكافِرِيْنَ وَجاهِدْهُمْ جِهاداً كَبِيْراً ﴾ دوایی تۆ پەیڕەوی بێ باوەڕان مەکە لەوشتەی داوای لەتۆ ئەکەن و بۆ ئەو شتەی ئەیانەوێ لەگەڵیانبی و نەرمبی لەگەڵیان. خۆت ماندو بکە لەگەڵیان بەهۆی قورئانەوەو تێکۆشە بۆ بەرپاکردنی ئایین بەتێکۆشانێکی گەورە ،داوای کۆمەکی هەر لەخوای مەزنبکە، کاری پوچیان لەناو ببەو ئەگەر باوەڕ نەهێنن تۆ بەرپرسیار نیت. بەلاّم بێدارکردنەوەی نەخوێنەواران و شارەزاکردنی ئادەمیزاد بۆلای ڕێگەی بەختیاری و سەربەستی و بلاّوکردنەوەی دادپەروەری وچەسپاندنی یەکسانی نێوان دانیشتوان بەهۆی قورئانەوە بکە بەبێ ووچان.

﴿ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هذا عَذْبٌ فُراتٌ وَهذا مِلْحٌ أجاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُما بَرْزَخا ﴾ ەخوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە دوو دەریای بەرەلاّ کردوەو ئەڕۆن بەجێگەی خۆیانا بەدراوسێتی یەکتری تێکەلاّوی یەکتری نابن،یەکێ لەو دوو دەریایە زۆر شیرینە وبەئاسانی ئەخورێتەوە، ئەوەی تریانزۆر سوێر وتاڵە بۆ خواردنەوە دەست ناداو و خوای مەزن گێراویە لەنێوان ئەو دوو دەریایەدا پەردەیە لەهەر شتێ بێ هەتا تێکەلاّوی یەکتری نەبن و بەڵکو هەر یەکەیان لەسەر سروشتی تایبەتی خۆیان بەردەوامن لەشیرینی یەکێکیان و سوێری ئەوی تریان.

﴿ وَحِجْراً مَحْجُوراً ﴾ وەخوای مەزن گێڕاویە بۆ ئەو دوو دەریایە پەردەیەکی داپۆشراو لەخاکێ یا شتێ تر نایەڵێ تێکەلاّوی یەکتر بن و لەیەك بێزارن بەجۆرێ وان هەریەکەیان بەزمانی تایبەتی خۆیان بەیەکتری ئەڵێن: دوورکەرەوە لێم وتێکەلاّوی من مەبە، مەبەست لەو دوو دەریایە دوو دەریای تایبەتی نین، بەڵکو دوو جۆرن لە ئاو، یەکێکیان شیرینەو ئەوی تریان تاڵە نارواو قەدەغەیە ئاوە تاڵەکەو ئاوە شیرینەکە لە سروشتی خۆی بگۆڕرێن.

بۆزانین :لەمیهرەبانی وچاکەی خوای مەزنە بەسەر زینەوەراندا، ئاوی شیرینی داناوە لەجێگە بەرزەکاناو لەجێگەیە بەرزترین لەو جێگایانە ئاوی سوریان تێدا نیە، بەوێنەی ئاوی ڕوبارەکان و ئاوی ئەو گۆلاوانە لەسەرەوەی ڕوی دەریاکانن ، بەتابەتی ئاوی باران.کەواتە ئاوی شیرین وسوێر هەرەیەکەیان لەسەر سروشتی خۆیان ئەمێننەوە، ئەگەر بەپێچەوانەوە

بوایە ئاوی تاڵ ئەڕژایە ناو ئاوی شیرین و ئاوەکان هەموویان سوێر ئەبوون و ئادەمیزاد تووشی ئازار و ناخۆشی ئەبوون. ئەوە لەلایەکەوە لەلایە ترەوە بونی ئاوی سوێر زۆر پێویستە بۆ ژیانی زینەوەران و بۆ پاراستنی لەشیان بۆئەو شتانەی لەناو دەریادا ئەژین لەناو ئەچون، ئەگەر ئاوی سوێر نەبوایە زینەوەران بەزۆری لەناوئەچوون و بۆگەنیان ئەکرد وهەوایش پیس ئەبو، کاتێ ئادەمیزاد پێویستی بەئاوی شیرین هەبێ خوای مەزن تیشکی خۆر ئەنێرێتە سەر زەوی ودەریا سوێرەکان و تەم پەیدا ئەکەن و سوێری بەجێ ئەهێڵن و ئەبێ بەهەورو ئاوی شیرین ئەبارێتە سەر زەوی. کەواتە سەرچاوەی ئاوی شیرین لەئاوی سوێرەوە پەیدا ئەبێ.

دووبارە لەمیهرەبانی خوای مەزنە لەناو زەوی ژێر زەریاو دەریاکان ئاوی شیرین دەرهێنرێ، ئەو پەردەی زەویە نایەڵێ ئاوە سوێرەکە بڕژێتە ناو ئەو ئاوە شیرینە. کەواتە بۆمان دەرکەوت ئەو دوو جۆرە تێکەڵاوی یەك نابن. هەندێ لەزانیان ئەڵێن: ئەگەر دوو ڕووبار یەکێکیان شیرین بێ وئەوی تریان سوێر بێ بڕۆن بەپاڵی یەکا بێ پەردەی خاك، ئەو دوو ڕووبارە تێکەڵاوی یەك نابن بەهۆی پەردەیەکەوە ئادەمیزاد نای بینن.

﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْماءِ بَشَراً فَجَعَلَهُ نَسباً وَصِهْراً وَكانَ رَبُّكَ قَدِيْـراً ﴾ وەخوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردووە لەئاوی پیاو کاتێ ئەچێتە لای ژنەکەی خۆی ئادەمیزادێ، ئیتر ئەو ئادەمیزادە نێر بێ یا مێینە بێ؟ دوایی خوای مەزن ئەو ئادەمیزادە ئەگێڕێ بەپیاوێ خاوەنی نەژاد و ڕەگەزی یەکتری و پەیوەندیان بەیەکەوە ئەبێ، وەك کوڕو کوڕەزاو کچ ومام و ئامۆزاو ئەی گێڕێ بەخەزووری یەکتری بەهۆی ژنەوە، بەوێنەی باوکی ژن ودایکی ژن و کچەزاو پورزاو، پەروەردگاری تۆ زۆر بەتوانایە، چونکە لەئاوی ژن وپیاو ئادەمیزادێکی نێر یا مێ دروست ئەکاو بەڕەنگێکی جیاوازەوە.

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا

وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾

**﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ مالا يَنْفَعُهُمْ ولا يَضُرُّهُمْ وَكانَ الْكافِرُ عَلى رَبِّهِ ظَهيراً ﴾** وە بێ باوەڕان لەجگەی خوای مەزن شتێ ئەپەرستن سود بەوان نابەخشێ وزیان لەوان ناداو ، مرۆڤی بێ باوەڕ یاریدەو پشتیوانی شەیتان وتاوانبارانە لەسەر بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆی، پشتیوانی تاوانبارانە لەدژی پیاوچاکان.

**﴿ وَما أَرْسَلْناكَ إِلاّ مُبَشِراً وَنَذِيْراً ﴾** وەئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردوە بۆلای هەموو ئادەمیزاد مەگەر تۆمان بۆ ئەوە ناردوە مژدەبدەی بەباوەڕداران بەبەهەشت و بێ باوەڕان بترسێنی لەئاگری دۆزەخ، دوایی تۆخەفەتبار نەکا بێ باوەڕی ئەوان، بێ باوەڕیەکەیان زیانی بۆ تۆ نیە.

**﴿ قُلْ ماأَسْئَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إلا مَنْ شاءَ أَنْ يَتَّخِذَ إلى رَبِّهِ سَبيْلاً ﴾** تۆ بلێ بەبێ باوەڕان من داوی کرێ لەئێوە ناکەم و بەتەمای ئەوە نیم ئێوە داراییم بدەنێ لەسەر ڕاگەیاندنی شتێ منی پێوە نێرراوە بۆلای ئێوە پاداشتی من لەسەر هیچ کەسی نیە مەگەر لەسەر خوای مەزنە، بەلام هەرکەسێ ئارەزووی هەیە کەرێگەی ڕاست وەربگرێ بۆلای ڕەزامەندی خوای مەزن و نزیک بونەوە لەئایینی من ودارایی خۆی ببەخشێ لەرێگەی چاکەدا، دوایی بائەو کەسە ئەوشتانە بکا.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لاَيَمُوتُ ﴾ وەتۆ بۆ داواکاری خۆت پەنابەبە بۆلای زیندویەکی ئەوتۆ هەرگیز نامرێ، پشــت ببەسـتە لەسـەر ئـەو خوایـە لـەلادانی خراپـەی بێ بـاوەڕان لەخۆت،ئەو ئەتپارێزێ لەئازاری ئەوان ، هەر ئەو شایانی پشت لەسەر بەستنە نەك زیندوانێ مردن ڕویان تێبکا. کەئەوان مردن بێ یاریدەدەر ئەبێ. بـەڵام یـاریدانی خـوای مـەزن لـەناو ناچێ وبەردەوامە.

﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفى بِهِ بِذُنُوبِ عِبادِهِ خَبِيْراً ﴾ وەتـۆ خـوای مـەزن دوور بخـەرەوە لەهەموو شتێکی ناشایستە بەهۆی یاریدانی خوایە کەوە شەایستەی سوپاسەو، بەسە بۆ خوای مەزن ئەزانێ بەگوناهی بەندەکانی خۆی، تۆ گرنگی مەدە بەکەسێ باوەڕی نەهێناوە.

﴿ الَّذِي خَلَقَ السَّماواتِ وَالأَرْضِ وَما بَيْنَهما فِي سِتَةِ أيامٍ ثُمَّ اسْتوى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمنِ﴾ ئەو کەسەی زیندوەو هەرگیز نـامرێ خوایـەکی ئەوتۆیـە ئاسمانـەکان وزەوی شـتێ لـەنێوان ئەواندایە لە هەواو جگەی هەوا دروستی کردوون لەشەش کاتی جیـاوازدا، ئەگـەر خـوای مەزن بیویستایە لـەیەك کاتـا دروسـتی ئـەکردن. بـەڵام ویستویە بـەندەکانی خـۆی فێربکـا لەکارکردنیاندا لـەسەرخۆ بن وجار لـەدوای جار بیانکەن، لـەپاش دروسـت کردنیـان خـوای خاوەن بەخشندەو دەستەڵات گەورەیی خۆی ڕاکێشا بەسـەر هـەمو وبنـەوەراندا. مەبەسـت لـەڕۆژ چەند جارە، چونکە ئەو کاتە ڕۆژ نەبوە.

﴿ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيْراً ﴾ دوایی تۆی بێ باوەڕو فریو خوردە پرسیار بکە بۆ دروسـت کردنـی ئاسمانەکان وزەوی و شتێ لـەناو ئەواناديە لـەکەسێکی زانا لـەخاوەن نامەکان و جگەی ئەوان بۆ ئەوەی هەواڵی ڕاستی دروست کردنی ئەوانە بدا بەتۆی بێ باوەڕ. نەك کەسێ نەزان وبێ باوەڕ بێ.

﴿ وَإِذا قِيْلَ لَـهُمْ اسْجدُوا لِلرَّحمـانِ قـالُوا وَمـا الرَّحمـانُ ﴾ وەهـەرکاتێ ببێژرایـە بـەبت پەرستان: ئێوە سوژدە ببەن بۆ خوای خاوەن بەخشندەو میـهرەبان ونوێـژی بـۆ بکـەن ئـەیان ووت: ئێمە نازانین ڕەحمان چ شتێکە هەتا سوژدەی بۆ ببەین، چونکـە ئـەوان نـاوی خوایـان بەڕەحمان نەئەبرد، یا لـەبەر شتێ تر بوو جگەی ئەوە، نەیان ئەزانی ڕەحمان ناوی خوای مەزنە، بەموسەیلەمەی درۆزنیان ئەووت: ڕەحمان.

﴿ أنَسَجِدُ لِما تَأمُرُنا و زادَهُمْ نُفُوراً ﴾ ئەیان ووت ئایا ئێمە چۆن سوژدە ئەبەین بۆ شـتێ تۆ فەرمانمان پێ ئەدەی سوژدەی بۆ ببەین، ئێمە ناوی ڕەحمانمان نەبیستوە، بیستومانە: ڕاحیم و ڕەحیم هەیە نەك ڕەحمان، ئێمە بێ فەرمانی باوباپیری خۆمان ناکـەین وئـەو شـتانە ئەپەرسـتین ئەوان ئەیپەرستن وو ئەو فەرماندانە کەسوژدە ببەن بۆ خوای خاوەن بەخشندە زۆرتـر دوری ئەخستنەوە لەباوەڕهێنان، بەجۆرێ ئەیان ووت: تـۆ ئەتـەوی فەرمانبـەرداری تـۆ ببـین وواز لـەپەرستراوی باوباپیری خۆمان بهێنین.

﴿ تَبارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّماءِ بُرُوجاً ﴾ بەرزی و توانای بێ هاوتا بۆ کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردوە لە ئاسماندا چەندین جێگەیە بۆ خۆرو مانگ کەبریتین لە دوازدە جێگە بەلای زۆربەی زانایانەوە:

بورجەکان ئەمانەن: بەرخ، گا و دووانە، سێ مانگەی بەهار، قرژاڵ شێر، هێشوو، سێ مانگەی هاوین، ترازو، دووپشك و کەوان، سێ مانگەی پاییز، کارژەلە، دۆلچە، ماسی، سێ مانگەی زستان.

﴿ وَجَعَلَ فِيْها سِراجاً وَقَمَراً مُنِيراً ﴾ وەخوای مەزن دروستی کردوە لەناو بورجەکانی ئاسماندا چرایە کە خۆی لەخۆیا ڕووناکە ئەویش بریتیە لە خۆرو ، دروستیشی کردوە لەناو بورجەکانی ئاسمانا مانگ کەلەشەودا هەڵهات زەوی ڕوون ئەکاتەوەو ڕوناکیەکەی لەخۆرەوە وەرگرتوە. هەندێ لەزانایان لایان وایە مەبەست لە ووشەی (بُرُوجاً) حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکانە.

﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنهارَ خِلْفَةً لِمَّن أرادَ أنْ يَذَّكِرَ أوْ أرادَ شُكوراً ﴾ وە خوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە شەو ورۆژی گێڕاوە بەجۆرێ هەریەکەیان جێگەی ئەوی تریان بگرێتەوەو بێن بەدوای یەکا، لەبەرئەوەی بەڵگە بن لەسەر توانای گەورەی خوای مەزن لەبۆ کەسێ بیەوێ بیر بکاتەوە لەکاری بێ وێنەی خوای مەزن. یا بۆ کەسێ بیەوێ سوپاسی خوای مەزن بکا لەسەر چاکە بێ ئەندازەکانی کەنایەنە ژمارە.

لەپاشا خوای مەزن باسی شێوەی باوەڕداران و ئەوشتانەمان بۆ ئەکا لەجیهاندا ئەیکەن و پاداشتی گەورە وەرئەگرن. ئەفەرموێ: باوەڕداران ئەم کەسانەی خوارەوەن:

وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾

وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ
ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ
أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ
مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا
فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ
مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ
مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ
لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا
هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا
لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا
صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ
فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّي
لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا ﴿٧٧﴾

﴿ وَعِبادُ الرَّحمان الَّذِيْنَ يَمْشُونَ عَلى الأَرْضِ هَوْناً ﴾ وەبەندەكانی خوای خاوەن بەخشندە ئەو كەسانەی ئەوتۆن ئەڕۆن بەسەر زەویدا بەڕۆیشتنی لەسەرخۆو بەئارام بەشەرمەوەو شێوەی خۆیان تێك نادەن بەبێ دەمارو بەبێ خۆ بەگەورە دانان ئەڕۆن بەسەر زەویدا. ئازار

بەدەروون ویژدانی کەس ناگەیەنن. خزمەتکار لە پێش وپاشیانەوە ناڕۆن، سواری چارەویێ وماشێنی بەنرخ نابن وماتۆڕ و ماشین لەپاش وپێشیانەوە ناڕۆن.

﴿ وَإِذا خاطَبَهُمْ الْجاهِلُونَ قالُوا سَلاماً ﴾ وە هەرکاتێ نەزان وپیاوخراپان گفتوگۆی خراپیان لەگەڵ بکەن، وەلاّمیان بەخراپەوە نادەنەوە. بەجۆرێ وەلاّمیان ئەدەنەوە خۆیان تووشی ئازارو گوناه ناکەن و چاوپۆشی لەخراپەیان ئەکەن، ئەڵێن لە وەلاّمیانا: گفتوگۆی شایستەو دوربون لەگوناه لەسەر ئێمە بێ، چاکە لە نێوان و ئێمە وئێوەدا نابینرێ.

﴿ وَالَّذِيْنَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَّ قِياماً ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن شەو ئەبەنە سەر بەنوێژ کردن بۆ پەروەردگاری خۆیان بەسوژدە بردن و بەپێوە وەستان، کاتێکە دورە لەدووڕویی و کاتی خۆیان بەفیڕۆ نادەن لەچایخانە و جێگەکانی ڕابواردن بەخواردنەوەی مەیی وقورمار و دۆمینەو تاوڵەکردنەوە، دارایی خۆیان لەجێگەی خراپا دانانێن، پیلان لەدژی باوەڕداران وبێ تاوانان دروست ناکەن.

﴿ وَالَّذِيْنَ يَقُولُونَ رَبَّنا اصْرِفْ عَنّا عَذابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذابَها كانَ غَراماً ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن ئەڵێن :ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ سزای دۆزەخ لەئێمە لابدە، بەڕاستی سزای دۆزەخ بەردەوامەو تۆڵەسێنەوەیە، ناتوانرێ خۆمانی لێ ڕزگار بکەین، ئەو باوەڕدارانە لەگەڵ ئەوەیشدا پەرستنیان زۆرە و ڕەوشتیان لەگەڵ دانیشتوانا چاکە لەخوا ئەترسن وئەپارێنەوە سزای دۆزەخیان لێ لادا.

﴿ إِنَّها ساءَتْ مُسْتَقِراً وَ مَقاماً ﴾ بەڕاستی دۆزەخ ئارامگاو جێگایەکی خراپە، بەڕاستی باوەڕداران بەجۆرێ بڕوایان بەبونی بەهەشت ودۆزەخهەیە وەك ئەوە وایە چاویان پێیان کەوتبێ ، بۆیە بە ئومێدی چوونی بەهەشتن و لەسزای دۆزەخ ئەترسن و بەتەمای میهرەبانی خوای مەزنن.

﴿ وَالَّذِيْنَ إِذا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكانَ بَيْنَ ذلِكَ قَواماً ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن کاتێ دارایی خۆیان ئەبەخشن ئەوەندە دەست گوشاو نین لەسنوری دیاری ڕکاو وپێویست دەرچن ولەگوناهدا دای نانێن وئەوەندە ڕژدو مست قوچراو نین خۆیان و خێزانەکانیان تووشی تەنگانە بکەن، وەبەخشینیان مام ناوەندیە، نەئەوەندە ئەبەخشن هیچیان بەدەستەوە نەمێنێ و نەئەوەندە بەرچاو تەنگن هیچ شتێ نەبەخشن.

﴿ وَالَّذِيْنَ لايَدْعونَ مَعَ اللهِ إِلهاً آخَراً ﴾وەکەسانێکی ئەوتۆن لەگەڵ خوای مەزندا خوایەتر ناپەرستن وهەر لەخوای مەزن ئەپارێنەوە، هاوبەشدانان بۆ خوای مەزن گەورەترین تاوان وستەمە لای ئەوان .

﴿ وَلايَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلا بِالْحَقِّ وَلايَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذلِكَ يَلْقَ أَثاماً ﴾ وەکەسێکی ئەوتۆن ناکوژن کەسێ خوای مەزن قەدەغەی کردبێ کوشتنی مەگەر بەمافێکی

ڕەوا بیکوژن، بەجۆری کەسێکی باوەڕداری کوشتبێ یالە ئایین وەرگەڕابێ یا خراپەی بڵاوکردبێتەوە بەزەویدا و جگەی ئەوانەیش وە ئەو کەسانە داوێن پیسی ناکەن وهەرکەسێ ئەو شتانە بکا لەپەرستن بۆ جگەی خوای مەزن و کوشتنی کەسێ بەناڕەوا و داوێن پیسی تووشی سزای کردەوەی خراپی خۆی ئەبێ .

﴿ یُضاعِفُ لَهُ الْعَذابُ یَوْمَ الْقِیامَةِ وَیَخْلُدُ فِیْهِ مُهاناً ﴾ دوو چەنانە ئەکرێتەوە بۆ ئەوکەسە سزا لەڕۆژی دواییدا و،بەردەوام ئەبێ لەناو ئەو سزایەدا بەڕسوایی وبی نرخی و سەرشۆڕی هەتا هەتایە.

﴿ إلاّ مَنْ تابَ وَ آمَنَ وَعَمِلَ صالِحاً فَأُولئِكَ یَبدّل اللهُ سَیْئاتِهِمْ حَسَناتٍ وَّكانَ اللهُ غَفُوراً رَحِیْماً ﴾ مەگەر کەسی پەشیمان بوبێتەوە لەخراپەکانی خۆی وباوەڕی هێنابێ بەخوای مەزن وبەپێغەمەر و کردەوەی چاکی کردبێ بەنیازی پاکەوە، دوایی ئەو کەسانە خوای مەزن خراپەکانیان ئەگۆڕێ بەچاکە بۆیانلەڕۆژی دواییدا و خراپەکانیان ئەشۆرێتەوەو، خوای مەزن لەگوناهەکانیان خۆش ئەبێ، میهرەبانە خراپەکانیان ئەگۆڕێ بەچاکە.

﴿ وَمَنْ تابَ وَعَمِلَ صالِحاً فَإنَّهُ یَتُوبُ إلی اللهِ مَتاباً ﴾ وەهەر کەسێ پەشیمان بوبێتەوە لەگوناهەکانی خۆی جگە لەو گوناهانەی پەیوەندیان بەمافی بەندەکانی خواوە هەیە وکردەوەی چاکی کردبێ بۆ بەسەر گرتنەوەی ئەو شتانەی لەکیسی چووە، دوایی ئەو کەسە ئەگەڕێتەوە بۆلای خوای مەزن بەگەڕانەوەیەکی چاك وخۆش کەگوناهەکانیان ئەشۆرێتەوەو پاداشتی چاکی ئەدرێتێ.

﴿ وَالَّذِیْنَ لایَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإذا مَرُّوا باللغو مرّو اكْراماً ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن شایەتی درۆو پوچ نادەن بە هەرجۆری بی و، هەرکاتێ بەرێکەوت چون بەلای گفتوگۆی خراپ و کاری بێز لێکراوە یا شتێکی خراپیان بیست ئەڕۆن بەلایاو وازی لێ ئەهێنن ورێزی خۆیان ئەگرن و رێز بۆ خۆیان دائەنێن.

﴿ وَالَّذِیْنَ إذا ذُكِرُوا بِآیاتِ رَبِّهِمْ لَمْ یَخِرُوا عَلَیْها صما عمیانا ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن هەرکاتێ ئامۆژگاریان بکرایە بە ئایەتەکانی قورئانی پەروەردگاری خۆیان ئەگرین وئەکەون بەدەماو سوژدە ئەبەن بۆلای خوای مەزن، ڕوناکەن بۆلای ئەو ئامۆژگاریە بەوێنەی کەسێ کەربێ هیچ شتێ نەبیسێ و بەوێنەی کەسێ کوێر بێ.

﴿ وَالَّذِیْنَ یَقُولُونَ رَبَّنا هِبْ لَنا مِنْ أزواجِنا وَذُرِّیَاتِنا قُرّةَ أعیُنَ وَاجْعَلْنا لِلْمُتَقِیْنَ إماماً ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆن ئەپارێنەوە لەخوای مەزن وئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ ببەخشە بە ئێمە لەژنەکانمان و لەخێزان ومناڵەکانمان کەسێچاومان پێیان فێنك ببێتەوەو دڵمان پێیان گەش ببێتەوە بەجۆرێ بن تۆ یاریدەیان بدەی بۆلای پەرستنی خۆت، گومانی تێدا نیە کە

ئادەمیزاد خێزانی خۆی ببینێ کە ڕەوشتیان بەرزە دڵخۆش ئـەبن، چونکـە بـەئومێدی ئـەوەن لـەبەهەشتا بگەن بەیەکتری و، تۆ ئێمە بگێڕە بەپێشەوای پیاوچاکـان ولـەخوا ترسـان وچـاو لێکراو بۆ ئەوان، ئادەمیزاد بەگوێرەی سروشتی خۆیـان لایـان چاکـە منالـەکانیان پیاوچـاك ورەوشت بەرز بن و هەرچەندە خۆیشیان خراپ بن، وەك کەسی خۆی نەخۆشبێ لای خۆش نیە منالـەکانی نەخۆش بن.

﴿ أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِما صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيْها تَحِيَّةً وَسَلاماً ﴾ ئەو نۆ تاقمانە باس کـران لـەلایەن خوای مەزنەوە پاداشتیان ئەدرێتەوە بەپلـەیەکی بەرز لـەبەهەشتا بەهۆی ئارام گرتنیان لـەسـەر بـەردەوامی پەرستنی خـوای مـەزن و وازهێنانیـان لـەبێ فـەرمانی خـوای مـەزن ، لـەهۆدەکانی ناو بەهەشتا لـەلایەن فریشتەکانەوە ئاشتی وسڵاویان ئاراستە ئەکرێ وپێشـوازی چاکیـان لێ ئـەکرێ، بـەوان ئـەووترێ بەخۆشـی و بـێ ئـازاری بژیـن هەتاهەتایـە، نـامرن ودەرناکرێن، جێگەی خۆش بۆ ئێوەی بەندەی لـەخوا ترسە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ خالِدِيْنَ فِيْها حَسُنَتْ مُسْتَقَراً وَمَقاماً ﴾ بەبەردەوامی دانیشـن لـەناو ئـەو جێگـە وپلـە بەرزەدا، جێگە وپەلیەکی بەرزو شیرینە بۆئەوەی ئەوان ئـارام بگـرن لـەناویاو زۆر جێگـەی چاکە بۆ دانیشتنی ئەوان.

﴿ قُلْ مايَعْبَؤُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلا دُعاؤُكُمْ ﴾ تۆ بڵێ بەدانیشتوانی مەککە: پەروەردگاری ئێـوە گرنگی و نرخ بەئێوە نادا ،پێویستی بەپەرستنی ئێوە نیەو نرختان بۆ دانـانرێ ئەگـەر بۆئـەوە نەبێ ئێوە خوای مەزن بپەرستن، چونکـە ئـادەمیزاد و جنۆکـە هەربۆئـەوە دروسـت کـراون خوای مەزن بپەرستن. ئەگەر بۆ پەرستن نەبی ئێوە وئاژاڵ جوێ ناکرێنەوە خوای مـەزن نـرخ بۆ هیچ کارێکی ئێوە دانانێ ئەگەر ئێوە داوای باوەڕهێنان نەکەن.

﴿ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزاماً ﴾ دوایی چۆن خوای مەزن نرخ بۆ ئێوە دائەنێ کە ئێوە نێرراوی خواتان بەدرۆ خستوەتەوەو تانەتان لـەقورئان داوەو لـەئاستی باوەڕهێنـاندا خۆتانتـان بەگەورە داناوە، دوایی ئەو سزایەی بەدرۆ خستنەوەتان سـزایەکە بەردەوامـەو لێتـان جـوێ نابێتەوە، ئەو سزایە دەستی پێ کرد لـەجەنگی بەدرەوە وبەردەوام ئەبێ لـەڕۆژی دواییدا.

**بەیاریدەی خوا مانای سورەتی ئەلفورقان کۆتایی پێ هات ڕۆژی دووشەممە**
**( ٢٧ ) ی موحەڕەم ساڵی ( ١٤٢١ ) کۆچی بەرانبەر : ١/ ٥/ ٢٠٠٠ زایینی**

## (سورەتی شوعەراء)

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە ، هەندێ لەزانایان ئەڵێن: جگە لەئایەتی ( ١٢١ -١٢٢ - ١٢٣ -١٢٤- ١٢٥- ١٢٦- ١٢٧ ) لەمەدینە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٢٧) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدْ كَذَّبُواْ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾

﴿ طسم ﴾ زۆر جاران باسی مانای ئەو پیتانە کراوەو ئومێد وایە تەماشای مانایان بکەن لەسورەتەکانی تردا، بەتایبەتی لەسورەتی ئەلبەقەرەدا ولەوپیتانە قورئان پێك هاتوەو کاری پەك خەرن.

﴿ تِلْكَ آياتُ الْكِتابِ الْمُبِيْنِ ﴾ ئەو ئایەتانە لەم سورەتەدا باسیان ئەکرێ ئایەتی نامەیەکن چاك وخراپ لەیەك جوی ئەکەنەوە، دەستور ویاسای ئایینی ڕوون ئەکاتەوە، بەڵگەشە لەسەر پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ .

﴿ لَعَلَّكَ باخِعٌ نَفْسَكَ أنْ لاَيَكُونُوا مُؤمِنِيْنَ ﴾ تۆ ئەوەندە تێئەکۆشی کە دانیشتوانی مەککە باوەڕبهێنن بەم قورئانە نزیکە تۆ خۆت بکوژی لەخەفەتاکەئەوان باوەڕناهێنن، تۆ داوات لێ ناکرێ کەئەوان باوەڕبهێنن، تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە کە فەرمودەکانی خوای مەزن بەوان بگەیەنی.

﴿ إِنْ نَشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِمْ مِنَ السَّماءِ آيَةً فَظَلَّتْ أَعْناقُهُمْ لَها خاضِعِيْنَ ﴾ ئەگەر ئێمە ئارەزوو بکەین ئەوانهەمویان باوەڕ بهێنن بەڕاستی ئێمە ئەنێرینە خوارەوە بەسەریانا نیشانەیەکی گەورەو بەهێز و بینراو ناچاریان بکا بۆ لای باوەڕهێنان، دوایی ئەوان بەبۆنەی ئەو نیشانەیە گەردنی خۆیان دائەنەوێنن بۆی بەسەر شۆڕی. یانێ کاتێ ئەو نیشانەو سزایەیان بینی، ئێمە بەوان ئەڵێین: ئێوە خۆتانسەربەستن: یابۆ لەناوبردنتان، یابۆ باوەڕهێنان، بێگومان ئەوکاتە سەرشۆڕ ئەبن . بەڵام ئەو باوەڕهێنانە شایستەی پادشتی چاك نیە، باوەڕهێنان ئەبێ زۆری تێدا نەبێ وخۆیان سەربەست بن. ئێمە ڕێگەی چاك و خراپمان پی نیشان داون.

پرسیار: خوای مەزن لەکاتی موسادا کێوێکی بەسەر بەنو ئیسرائیلیەکانا بەرز کردەوە، فەرموی: ئێوە ئەبێ ئەو شتەی منپێم داون وەری بگرن وبەزۆر باوەڕی پی هێنان.

وەڵام بەڕاستی قورئانی پیرۆز بەڕوونی ئەفەرموێ: خوا جۆرە کارێکی وای کردوە لەگەڵ بەنو ئیسرائیلی لەگەڵ بەندەکانی تری خۆیدا نەی کردوە، چونکە ئەوان سروشتێکی نامۆیان هەبوە بەراوردیان لەگەڵ کەسانی تردا ناکرێن.

﴿ وَما يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنَ الرَّحْمنِ مُحْدَثٍ إِلاّ كانُوا عَنْهُ مُعْرِضِيْنَ ﴾ وەنایە بۆلای بێ باوەڕان هیچ ئامۆژگاریە لەلایەن خوای خاوەن بەخشندەوە بەتازەیی و سەرلەنوێ مەگەر ئەوان واز لەو ئامۆژگاریە ئەهێنن وبەنیازی پاکەوە وەریناگرن وئەوان تۆ بەدرۆ ئەخەنەوەو باوەڕناهێنن، ئومێدی ڕاغوییان لی ناکرێ وخۆتیان بۆ لەناو مەدە، بێ سودە کۆششی تۆ بۆ باوەڕهێنانی ئەوان.

﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا فَسَيَأْتِيهِمْ أَنْباءُ ما كانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە بۆلای بی باوەڕان و ئایەتی ڕون و ئاشکرای قورئانمان نارده خوارەوە بۆیان ، دوایی ئەوان تۆو ئەو ئایەتانەیان بەدرۆخستەوەو گاڵتەیان پێ کردن، دوایی ئەوان چاوەڕوان بکەن دێت بۆلای ئەوان هەواڵ وسزای ئەو شتەی ئەوان گاڵتەی پێ ئەکەن لەسزای جیهان و سزای پاشەڕۆژ، ئەو کاتە ئەزانن بەڕاستی ئەو هەواڵ وهەڕەشانەی قورئان بەلایانەوە گاڵتە بوون.

﴿ أَوَ لَمْ يَرَوْا إِلَى الأَرْضِ كَمْ أَنْبَتْنا فِيْها مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيْمٍ ﴾ ئایا ئەو بی باوەڕانە تەماشای توانای خوای مەزنیان نەکردوەو نەیان ڕوانیوە بۆلای زەوی کە ئێمە دەرمان هێناوە لەناو زەویدا هەمو جۆرە شتێکی پاك و خۆش لەو ڕوەکانەی لەزەویدا سەوز ئەبن بۆ خواردن و پۆشین وبۆ دەرمان، کەچی سوپاسی خوای مەزن ناکەن وباوەڕی پێ ناکەن.

﴿ إِنَّ فِي ذلِكَ لَآيَةً وَماكانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەناو ئەوشتانەی ئێمە دامان ناون بەتوانای خۆمان بۆ سودو چاکەی سەوز بوونی ئەو هەموەجۆراوجۆرەی ڕوەکە بەسودەکانا نیشانەیەکی گەورە داوای باوەڕهێنان ئەکەن، بەڵام ئەوان لەتوانای خوای مەزن

بیر ناکەنەوەو زۆرتر لەوان باوەڕنایەرن وبەردەوامن لەسەر بێ باوەڕی خۆیان ، بەلاّم کەمێکیان بیر ئەکەنەوەو باوەڕ ئەهێنن.

﴿ وَ إنّ رَبُّكَ لَهُوَ الْعَزِيْزُ الرَّحِيْمُ ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر گەورەو بەدەسەلاّتە بونەوەران ئەبا بەڕێوە ، دەستەلاّتی هەیە بەگورجی سزای بێ باوەڕان بدا، میهرەبانە مۆڵەتیان ئەدا بەگورجی لەناویان نابا.

وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾

﴿ وَ إذْ نادى رَبُّكَ مُوسى أنِ ائتَ الْقَوْمَ الظّالِمِيْنَ ﴾ وەتۆ بۆئەوەی خەفەت نەخۆی کەهەر تۆ بەدرۆخراویتەوە بیری ئەوکاتە بکەرەوە کە پەروەردگاری تۆ فەرمانی دا بەموسا کە تۆ بڕۆی بۆلای تاقمێ کەستەمیان لەخۆیان کردوە بەبی باوەڕی ستەمیان لەبەنوئیسرائیلی کردوە کردنیان بەبەندەی خۆیانو کوڕەکانیان سەرئەبرین.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَلا يَتَّقُونَ ﴾ ئەو تاقمە بریتی بون لەتاقمی فیرعەون، بەوان بڵێ : ئایا بۆ ئێوە ناترسن لەخوای مەزن ولەسزای خوا. دوایی ئێوە باوەڕی پی ناهێنن وستەم لەبەندەکانی خوای مەزن ئەکەن.

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ ﴾ موسا فەرموی: ئەی پەروەردگاری من: بەڕاستی فیرعەون پیاوێکی بالاْ دەستە وترسی فیرعەون لەدڵی دانیشتوانا چەسپیوە ئەترسم کاتێ من داوایان لێ بکەم بۆلای پەرستنی تۆ ئەو ترسەی ئەوان وایان لێ بکا من بەدرۆ بخەنەوەو پەلامارم بدەن.

﴿ وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلا يَنْطَلِقُ لِسانِي فَأَرْسِلْ إِلى هارُونَ ﴾ وەئەترسم کە دڵم پڕ بێ لەخەفەت بەوبۆنەوە من بەدرۆ ئەخەنەوەو ئەترسم زمانم بەرنەبێ ئەو شتەی لەدڵما بی ڕونی بکەمەوە، دوایی جبرەئیل بەنێرە بۆلای هارون بیکە بە پێغەمەر یاردیەی من بدا بۆ ڕاگەیاندنی فەرمودەی تۆ.

﴿ وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ فَأَخافُ أَنْ يَقْتُلُونِ ﴾ وە بۆ ئەو میسریانە هەیە بەسەر منەوە تۆڵەی ئەو کەسە لەمن بکەنەوە کەلەمەوبەر کوشتومەو تۆڵەم لێی بکەنەوە، دوایی ئەترسم کەمن بکوژن لەو تۆڵەیەدا، ئەگەر ئەوان بیانەوێ ئەو کارە بکەن هارونی برام بەرپێچیان ئەداتەوەو فەرمودەی تۆ بەجێگەی خۆی ئەگا.

﴿ قالَ كَلاَّ فَاذْهَبا بِآياتِنا إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ ﴾ پەروەردگار فەرموی: تۆ مەترسەو چاوەڕوانی خراپە مەکە، دوایی تۆو هارون بڕۆن بۆلایان بەچەندین نیشانەو کاری پەکخەر، بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم و ئەو پیلانەو گفتوگۆیە ئەوان بیکەن ئێمە ئەی بیسین ، ئەگەر کۆ ببنەوەوناتوانن تووشی ئازارت بکەن و ئێمە یارمەتیتان ئەدەین و سەرئەکەون.

﴿ فَأْتِيا فِرْعَوْنَ فَقُولا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعالَمِينَ ﴾ دوایی تۆو هارون بڕۆن بەیەکەوە بۆلای فیرعەون، دوایی ئێوە بڵێن بە فیرعەون: بەڕاستی ئێمە خاوەنی پەیامی پەروەردگاری هەمو بونەوەرانین بۆلای تۆ، پەروەردگاری تۆیشە شایستەی تۆ نیە بی شەرمانە داوای خوایەتی ئەکەی، پەشیمان ببەرەوەو باوەر بەپەروەردگاری خۆت بهێنە.

﴿ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنا بَنِي إِسْرائِيلَ ﴾ دوایی پێویستە لەسەر تۆ کەتۆ بەنی ئیسرائیلیەکان ڕەوانە بکەی لەگەڵ ئێمەو بەڕەلاّ بکەی و واز لەئازاردانیان بهێنی ورێگەیان لێ مەگرە بابچنە دەرەوە بۆلای فەلەستین. موساو هارون بەو فەرمانە چوون بۆلای فیرعەون.

﴿ قالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينا وَلِيداً وَ لَبِثْتَ فِينا مِنْ عُمْرِكَ سِنِينَ ﴾ فیرعەون ڕوی لێ وەرچەرخاندن، ڕووی کرد بۆلای موساو ووتی :ئایا ئێمە چاکەمان بەسەر تۆووە نیەو ئێمە تۆمان لەناو خۆمانا بەمناڵی بەخێو نەکردو پێ نەگەیشتی چەن ساڵێ لەتەمەنی خۆتا لەناو ئێمەدا نەبوی. هەتا تەمەنت گەیشتە سی ساڵان وبوی بەم پیاوە بەهێزە.

﴿ وفعلت فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَ أَنْتَ مِنَ الْكَافِرِيْنَ قالَ فَعَلْتُها إذاً وَّ أنا مِنَ الضّالِيْنَ ﴾ وەتۆ ئەو خراپەت کردو پیاوێکت لەئێمە کوشت وو ئێستا تۆ سوپاسی چاکەی ئێمە ناکەی وباوەڕت بەچاکەکردنی ئێمە نیە لەگەڵ تۆو، موسا فەرموی: ئەو کاتە من ئەو کارەم کردو نەمزانی بەو بۆکزە ئەو پیاوە ئەکوژرێ. من ئەم ویست تەمێی دا بدەم و بێ گوناهم لەو کارەدا ئەو کاتە ئەو کارەم لە خەتاباران بووم .

﴿ فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمّا خِفتكُمْ فَوْهِبَ لِي رَبّي حُكماً وَ جَعَلَنّي مِنَ الْمُرْسَلِيْنَ ﴾ دوایی موسا وەڵامی فیرعەونی دایەوە، ئاشکرای کرد کەکوشتنی ئەو پیاوە کارێکی چاك نەبو، ووتی: من نەم ئەویست ئەو پیاوە بکوژم وبۆکزێکم لێداو بەبی نیازی کوشتن، بەنەزانینەوە ئەو کارەم کرد و نەمزانی بەو بۆکزە ئەو پیاوە ئەکوژرێ، ئەگەر من بمزانیبایە ئەو پیاوە ئەکوژرێ ئە وبۆکزەم نەئەهاویشت، دووایی من ترسام ئێوە من بگرن بەهۆی ئەو کوشتنەوە من نیازم نەکرد لەدەستی ئێوە هەڵهاتم ولەمیسر چوومەدەرەوە کاتێ لە ئێوە ترسام بۆلای زەوی مەدیەن و پشتم بەخوای مەزن ئەستور بو، دوایی پەروەردگاری من پێغەمەرایەتی بەمن بەخشی و منی گێڕا بەیەکێ لەڕەوانەکراوی خۆی.

﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُها عَلى أنْ عَبَّدَتُ بَنِي إسْرائِيلَ ﴾ وەئایا بەخێو کردنی من بەمناڵی چاکەو ڕێزە بۆتۆ؟ کەتۆ بەنو ئیسرائیلیەکانت کردوە بەبەندەی خۆت و کوڕەکانیان ئەکوژی ، دوایی تۆ چۆن باسی چاکەی خۆت ئەکەی بەسەر منەوە، تۆ بەڕاستی بەم خزمانەی منت چێشتوون خراپترین سزا، ئەگەر تۆ چاکەت لەگەڵ من کردبێ، بەڕاستی تۆ سزای خراپی خزمەکانی منت داوە.

قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ

أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾

﴿ قالَ فِرْعَونَ وَما رَبُّ الْعالَمِيْنَ قالَ رَبُّ السّماواتِ وَ الأَرْضِ وَما بَيْنَهُا إنْ كُنْتُمْ موقنين ﴾ فیرعەون بەموسای ووت: ئایا چ شتێکه پەروەردگاری هەمو وبونەوەران و من بەهیچ خوایه نازانم لەجگەی خۆم؟ فیرعەون کاتێ ئەو پرسیارەی لەموسا کرد کاتێ زانی باسی چاکەکردنی خۆی بۆ موسا وهەرەشه کاری تێ ناکا، سەر بۆ فیرعەون دانانەوێنێ، ئەو شتەی موسا داوای ئەکا باوەڕهێنان و ڕزگارکردنی بەنو ئیسرائیلیەکانه. موسا لەوەلامی فیرعەونا ووتی: پەروەردگاری بونەوەران پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی وشتێکه لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدان بەتۆو بەتاقمەکەتەوە، خوای تۆو هەمو ئادەمیزاده ئەگەر ئێوه بتوانن ڕێگەیه بدۆزنەوه دڵتان گومانی نەبێ که پەروەردگاری هەمو بونەوەرانه.

﴿ قالَ لِمَنْ حَولَهُ ألا تَسْتَمِعُونَ ﴾ فیرعەون ڕوی خۆی وەرگێڕا بۆلای گەورە پیاوانی تاقمەکەی خۆی. بەسەر سوڕمانەوه ووتی: ئایا ئێوه گوێ ناگرن موسا چ شتێ به ئێوه ئەڵێ: لەوەی بۆ ئاسمانەکان وزەوی هەیه پەروەردگار و دروستی کەرێ، ئێمه شتی وامان نەبیستوه لەباوباپیرمانەوه، ئەو شتانه کۆنن وهەربوون.

﴿ قالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبائِكُمْ الأَوَلِيْنَ ﴾ دوایی وازی لێ نەهێنان وبەکەم ئەقڵی دانان و فەرموی: پەروەردگاری هەموو بونەوەران پەروەردگاری ئێوەو خاوەنی هەمو کارێکی ئێوەیه. نەك فیرعەون کەناتوانێ زیان لەخۆی بداو سودیش بەخۆی ناگەیەنێ، خوای مەزن خاوەنی هەموویانه، پەروەردگاری ئێوەو باوباپیرتانه بەرلەوەی فیرعەون پەیدا ببێ کە گومانی وایه خوای ئێوەیه، فیرعەون بۆری خواردو هیچ شتێکی بەدەستەوه نەماو لەگفتوگۆ لایدا.

﴿ قالَ إنَّ رَسُولَكُمْ الَّذِي اُرْسِلَ إلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴾ ووتی: بەڕاستی ئەو نێرراوەی ئەوتۆ نێرراوه بۆلای ئێوه شێته گومانی وایه جگەی من ئێوه خوایه ترتان هەیه.

﴿ قْالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَما بَيْنَهما إنْ كُنتمْ تَعْقِلُونَ ﴾ موسا بەردەوام بو لەسەر بەڵگەی پەکخەر فەرموی: خوای بونەوەران پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە وشتێ لەنێوانیانایە، ڕوناکی وتاریکی بەسەریانا پەیدا ئەکا بەهۆی جولانی زەوی و ئاسمانەکان بەجۆرێکی نەگۆڕاو ئەگەر ئێوە بیر بکەنەوە لەشتێ من بەئێوەی ئەڵێم لەو شتانەی من باسم کردن.

﴿ قْالَ لَئِنْ اتخذت أِلهاً غَيْري لأَجْعَلَنّكَ مِنَ الْمَسْجُونِيْنَ ﴾ فیرعەون هیچ شتێکی بەدەستەوە نەماو بینی دانیشتوان باوەڕ بەڕاستی موسا ئەهێنن و باوەڕ بەخوای مەزن ئەهێنن وفیرعەون بەدرۆزن ئەزانن، بەهەڕەشەی سەختەوە سوێندی خواردو ووتی: بەڕاستی ئەگەر جگەی من تۆ خوایێ تر وەربگری تۆ ئەخەمە بەندیخانەوە سزای زۆر سەختت ئەدەم بەوێنەی بەندکراوەکان کە خۆت ئەزانی چۆن سزایان ئەدرێ.

﴿ قْالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيءٍ مُبِين ﴾ موسا فیرعەونی پەکخستبو بۆی دەرکەوت فیرعەون ڕوخاوە زۆر نەفامە. دوایی پرسیاری لەفیرعەون کرد: ئایا تۆ باوەڕ ناهێنی، ئەگەر من بیهێنم بۆلای تۆ شتێکی ئاشکرا بەڵگە بێ لەسەرئەوەی تۆ دروست کراوێکی لاوازی و خوایەکی بەهێز هەیە تۆ هەڵوێستت چۆنە؟.

﴿ قْالَ فَأتِ بِهِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الْصّادِقِيْنَ ﴾ فیرعەون بریاری‌دا ووتی: من ڕێگە لەتۆ ناگرم و لەبەڵگەی تۆ ناترسم، بەتەمای ئەوەبوو موسا پەك بخاو ووتی: دوایی ئەو شتە بهێنە ئەگەر تۆ لەڕاستگۆیانی و ئەوەی لاتە بۆ خۆتی ئامادەیکە.

﴿ فَأَلْقى عَصاهُ فَإذا هِيَ ثُعْبانٌ مُبِيْنٌ ﴾ دوایی موسا داردەستەکەی خۆی هاویشتە سەر زەوی، دوایی کتوپڕ ئەو داردەستەی بوبە ئەژدیهایەکی زۆر ئاشکراو، گیانی کرا بەبەریا بەوێنەی مار بەڕاستی.

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُ فَإذا هِيَ بَيْضاءُ لِلّناظِرِيْنَ ﴾ فیرعەون ووتی: ئایا بەڵگەی ترت لایە، موسا فەرموی: بەڵێ، دەستی کرد بەباخەڵیدا وهێنایە دەرەوە کوتوپڕ دەستی زۆر بەفراوانی ڕوناکی بلاوکردەوەو سپی هەڵگەڕا تەماشا کەران سەریان سوڕما بەفیرعەونو تاقمەکەیەوە.

﴿ قْالَ لِلْمَلأَ حَوْلَهُ إِنَ هَذا لساحِرٌ عَلِيْـمٌ يُرِيْـدُ أَنْ يُخرِجكُـمْ مِـنْ أرْضِكُـمْ بِسِحْرِهِ فَماذا تَأمُرُونَ ﴾ فیرعەون هەستی کرد بەلاوازی خۆی و نەمانی دەستەلاتی و لەبەردەم کارە پەکخەرەکانی موسادا پەکی کەوت، ووتی بەوکەسانەی کۆبونەتەوە لەلای. بەڕاستی ئەو شتەی ئێوە بینیتان لەجادوگەرێکی زۆر ئاشکرایە ئەیەوێ ئێوە لەزەوی و نیشتمانی خۆتان دەربکا بەو جادوەی خۆی،دوایی بەچ شتێ ئێوە ئاماژە ئەکەن بۆ من لەبارەی ئەم جادوەی موساوە، فیرعەون بەو گفتوگۆیەی خۆی ئەیەوێ هانی دانیشتوان بدا لەدژی موسا.

﴿ قَالُوا أرجِهْ وَأخاهُ وَابْعَثْ فِي الْمَدائِنِ حاشِرِيْنَ يَأتُوكَ بِكُلِّ سَحارٍ عَلِيمٍ ﴾ دانیشتوانی لای فیرعەون ووتیان: تۆکاری موساو براکەی دوابخە، بەکوتوپڕی فەرمان مەدە بەکوشتنیان نەوەك کارەساتێکی خراپتر ڕوبدا تۆ ڕەوانە بکە چەند کەسێ بەناو شارەکانا جادوگەرانی هەمویان کۆبکاتەوە، هەمو جادوگەرە زۆر زاناکان بەهونەری جادو بیان هێنن بۆلای تۆ، بۆ پەکخستنی موساو هارون.

فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾

﴿ فَجُمِعَ السَحَرَةُ لِمیقات یَوْمٍ مَعْلُومٍ ﴾ دوایی کۆبونەوە هەموو جادوگەران لەناو شارەکاندا لەکاتێکی دیاری کراودا کەکاتی چێشتەنگاو ڕۆژی جەژن بو. بەبۆنەی ڕۆژی نیلەوە.

﴿ وَقِیْلَ لِلّناسِ هَلْ اَنْتُمْ مُجْتَمِعُونَ ﴾ وەبێژراوە لەلایەن فیرعەونەوە بەدانیشتوانی میسر: ئایا ئێوە کۆبونەتەوەو پەلە ئەکەن بۆلای جادوگەران بۆیارمەتی دانیان وتەمەڵی مەکەن لەچونتانا، چاوەڕوانی سەرکەوتنیان بکەن.

﴿ لَعَلّنا نَتَبِّعُ السَّحَرَةُ إنْ کانُوا هُمُ الْغالِبُونَ ﴾ ئێمە ئومێدمان وایە جادوگەران سەرەئکەون زۆر بەباشی بەسەر موسادا، بۆیە ئێمە پەیڕەو لایەنگری ئەوان ئەکەین. بەرلەوەی جادوگەران بگەن بەموساو هارون وبکەونە کێشە لەگەڵیانا چونە لایفیرعەون ووتی: ئێوە لای من ڕێزی زۆرتان لێ ئەگیرێ.

﴿ فَلّما جاءَ السَّحَرَةُ قالُوا لِفِرْعَونَ اَینَّ لَنا لأجْراً إنْ کَنّا نَحْنُ الْغالِبِیْنَ ﴾ دوایی کاتێ جادوگەران هاتن وچوونە لای فیرعەون، بەفیرعەونیان ووت: ئایا بەڕاستی بۆ ئێمە ئەبێ پاداشتی بەنرخ لای تۆ کەئێمە سەرئەکەوین بەسەر موساو هارونا.

﴿ قالَ نَعَمْ وَإنّکُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِیْنَ ﴾ فیرعەو نووتی:بەڵێ.پاداشت دان بەئێوە بەس نیەو بەڕاستی سەرەڕای پاداشت ئێوە ئەوکاتە سەرکەوتن پلەوپایەی ئێوە بەرز ئەکەمەوە لەنێوان دانیشتوانا، نزیکترین کەس ئەبن لای من وبەبێ پرس ئەتوانن بێن بۆلای من.

فیرعەون و پیاوە گەورەکان لەڕۆژی دیاری کراودا کۆبونەوە، جادوگەران لەلایەکەوە ڕیزیان بەست و گوریس و داردەستی خۆیانیان بەدەستەوەبو، موسا وهارونیش لەلایەترەوە وەستان.

﴿ قالَ لَهُمْ مُوسی اَلْقُوا ماأنْتُمْ مُلْقُونَ ﴾ موسا بەجادوگەرانی فەرمو: ئێوە فڕە بدە نشتێ ئێوە ئەتانەوێ فڕەی بدەن، ئەوانیش ئەوەی لایان بو فڕەیان دا، بڕوایان وابو زاڵ ئەبن بەسەر موسا وهارونا.

﴿ فَأَلْقَوا حِبالَهُمْ وَعَصِیّهِمْ وَقالُوا بِعِزَةْ فِرْعَونَ إنّا لَنَحّنُ الْغالِبِیْنَ ﴾ دوای گفتوگۆ کردنیان لەگەڵ موساو هارونا جادوگەران گوریس و داردەستەکانی خۆیان فڕەداو ووتیان: بەهۆی گەورەی و هێزی فیرعەونەوە بەڕاستی ئێمە زاڵ ئەبین بەسەر موساو هارونا.

﴿ فَأَلْقی موسی عَصاهُ فَإذا هِيَ تَلْقَفُ مایَأْفَکُونَ ﴾ دوای ئەوان موسا داردەستەکەی خۆی فڕەدا، دوایی کوتوپڕ داردەستەکەی بو بەئەژدیهایەکی گەورەی ڕاستی وگیانی کرا بەبەردا وئەوشتەی ئەوان بەدرۆ لەبەرچاوی دانیشتوان کردبونیان بەمار وئەم دیو دیویان پی ئەکردن و داردەستەکەی موسا هەمویانی قوتدا.

﴿ فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ ساجِدِيْنَ ﴾ دوای ئەوەی جادوگەران بۆیان دەرکەوت ئەو کارەی موسا جادو نیە بە دەماکەوتن وسوژدەیان برد بۆ خوای مەزن وباوەڕی خۆیانیان ڕاگەیاند.

﴿ قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعالَمِيْنَ رَبِّ مُوسى وَهارُونَ ﴾ جادوگەران ووتیان :ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری هەمو بونەوەران پەروەردگاری موساو هارون، بەو ڕستەیە گومانی دانیشتوان بەخوایەتی فیرعەون پوچیان کردەوە، کاتێ هەواڵی باوەڕهێنانی جادوگەران گەیشت بەفیرعەون بەتوڕەییەوە هەڵسایە سەرپێ وووتی .

﴿ قَالَ آمَنْتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ ﴾ فیرعەون ووتی: ئێوەی جادوگەرباوەڕتان هێنا بەپەروەردگاری موساو هارون بەرلەوەی من دەستور بدەم بەئێوە بەباوەڕهێنانتان و دەستی کرد بەبروبیانوو هەڕەشە و ووتی:

﴿ إِنَّهُ لَكَبِيْرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی موسا گەورەو مامۆستایەکی ئەوتۆی ئێوەیە جادوی فێری ئێوە کردوە، دیارە ئەو لەئێوە زاناترە بەپیشەی جادو، دوایی ئێوە ئەزانن وبۆتان دەرئەکەوێ چ شتێکتان بەسەر دێنم لەتۆڵەی ئەو شتەی ئێوە کردوتانە، بەتازەترین وگەورەترین سزا ئێوە سزا ئەدرێن.

﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَ أَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلافٍ وَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِيْنَ ﴾ بەڕاستی دەست وپێی ئێوە ئەبڕم بەپێچەوانەوە: یانی دەستی ڕاستتان وپێی چەپتان ئەقرتێنم وبەڕاستی هەمویشتان هەڵئەواسم بەلقی درەختی خورمادا هەتا ئێوە ببن بە پەند و تەمێ کردنی کەسانی تربیانەوێ بێ فەرمانی من بکەن. هەڕەشە کاری تێ نەکردن.

﴿ قَالُوا لا ضَيْرَ إِنَّا إِلى رَبِّنا مُنْقَلِبُونَ ﴾ جادوگەران ووتیان: هیچ خراپەو زیانێ بەئێمە ناگا چیت لەدەست دێ بیکە. بەڕاستی ئێمە بۆلای پەروەردگاری خۆمان ئەگەڕێینەوە دوای سزادان و کوشتنی تۆ، مردن ئەنجامی هەمو کەسێکە بەبێ جیاوازی.

﴿ إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنا رَبُّنا خَطايانا أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئومێدەوارین کە پەروەردگاری ئێمە خۆشببێ لەهەڵەو گوناهە پێشوەکانی ئێمە یەکەم کەسین ڕاستیمان بۆ ڕوون بویەوەو باوەڕمان هێنا بەموساو بەردەوام نابین لەسەر بێ باوەڕی..دەنگ و باسی باوەڕهێنانی جادوگەران بەپەروەردگاری موساو هارون بڵاوبویەوە بەناو دانیشتوانا، برِوایان بەفیرعەون لاواز بوو، فیرعەون ترسی نەمان وشکۆی خۆی لێ پەیدایوو دەستی کرد بەئازاردانی دانیشتوان .موسایش لەگەیاندنی پەیامی خۆی نەوەستا.

وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِيٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ

لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَـٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَـٰهُم مِّن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَـٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾

﴿ وَ اَوْحَيْنا إلي مُوسي اَنْ اَسرِ بِعِبادِي إنّكُمْ مُتَّبَعُونَ ﴾ وە ئێمە سروشمان نارد بۆلای موسا کەتۆ برۆ لەشەودا لەگەڵ بەندەکانی مندا لەبەنو ئیسرائیلی هەتا تۆ کۆتایی ڕۆیشتنەکە ئەهێنی لای دەریای سور. بەڕاستی فیرعەون و ئۆردوەکەی دێن بەدوواتانا بتان گێڕنەوە. بەڵام ئێوە ڕزگارتان ئەبێ، فیرعەون و تاقمەکەی ئەخنکێن ، موسا و تاقمەکەی شەوێ چونە دەرەوە بۆلای ئەو دەریایە.

﴿ فَأرْسَلَ فِرْعَوْنَ فِي الْمَدائِنِ حاشِرِيْنَ ﴾ دوایی فیرعەون چەن دکەسێکی نارد بەناو شارەکانا لەشکر کۆبکەنەوەو برۆن بەدوای مۆساو بەنو ئیسرائیلیەکاناو بەزۆر بیان گێڕنەوە بۆ لای دەستەڵاتی فیرعەون، دوایی ئەوەی خۆی ئەیەوێ و ئەیزانێ پێیان بکا لەسزاو ئازاردانیان. فیرعەون ووتی:

﴿إنَّ هؤُلاءِ لَشِرْ ذِمَةٌ قَلِيْلُونَ وَ اَنّهُمْ لَغائِظُونَ ﴾ بەڕاستی ئەو تاقمەی موسا کۆمەڵێکی کەمن وبی نرخن وجێگەی ترس نین و بەڕاستی ئەوان چەند کارێکیان کردوە ئێمەیان تورە کردوە، زێرو زیوی ئێمەیان لایەوەو بەوبۆنەوە ڕایان کردوە، ئەیانەوێ بچوکی و خزمەتکاری ئێمە نەکەن.

﴿ وَ إِنّا لَجَمِيْعٌ حاذِرُونَ ﴾ وه بەڕاستی ئێمه هەمومان ئاگاداری کردەوەی ئەوانین، دوای جم وجۆڵی ئەوان کەوتووین و چاوەڕوان ئەکەین چ شتێ پەیدا ئەبێ ، ئێمه کارامەین لەجەنگداو چەکی زۆرمان هەیه وئەوان بی هێز وبێ چەکن ،ئێمه ئامادەین هەموو ئاشوبێ بنەبڕ بکەین لەکاتی خۆیا، ئەم کاره خراپەو ئاشوبەی ئەوانیش لەناو ئەبەین . فیرعەون بەبیریا هات خۆی سەرۆکایەتی ئەو کاره بکاو بڕوا بەدوایانا هەتا بەتوندی تۆڵەیان لێ بسێنێ، بەڵام خوای مەزن تۆڵەی لەفیرعەون ولەتاقمەکەی کردەوە، سامان و شکۆو باخ و بۆستانی نایابی لێ سەندنەوەو دای بەبەنوئیسرائیلیەکان. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَأَخْرَجْناهُمْ مِنْ جَنّاتٍ وَ عُيُونٍ وَكُنُوز وَ مُقامٍ كَرِيمٍ ﴾ دوایی ئێمه فیرعەون و تاقمەکەیمان دەرکردن کەدوای موسا و بەنو ئیسرائیلیەکان کەوتبوون لەمیسر ، بەجێیان هێشتلەدووای خۆیان چەندین بۆستان وباخ و ڕوبار و سەرچاوەی ئاو و گەنجینەی زێڕ و زیوو جێگەی زۆر بەرێز و بەنرخ.

﴿ كَذلِكَ وَأَوْرَثْناها بَنِي إِسْرائِيْلَ ﴾ هەر بەوجۆرەی ئێمه ئەوکارەمان هێنا بەسەر فیرعەون وتاقمەکەی وتۆڵەیان لێ کردنەوە، هەروەها هەمو وشتێ کەفیرعەون وتاقمەکەی بەوان ڕایان ئەبوادر لەسامان و جێگەی ڕابواردن بەخشیمان بەبەنوئیسرائیلیەکان لەزەوی فەلەستین و دانیشتن لەناویدا ویپت و خەزێنەی فەلەستینمان کرده بەشیان.. زانایان بیریان جیاوازە: ئایا ئەو بۆستان وسامانی زێڕو وزیو و جێگەیه خوای مەزن بەخشی به بەنوئیسرائیلیەکان دوای ڕزگار بونیان و خنکانیفیرعەون وتاقمەکەی زەوی میسر بوو یا زەوی فەلەستین.هەندێ لەزانایان ئەڵێن: زەوی میسره، چونکه ئەو ئایەته دوای ڕستەی (فَأَخْرَجْناهُمْ ) هاتوه. هەندێ تریان ئەڵێن: زەوی فەلەستینه وەك باسمان کرد . هەرچۆنێ بێ خوای مەزن بەنوئیسرائیلیەکانی ڕزگارکرد و ڕابواردنی چاکی پی بەخشین و فیرعەون وتاقمەکەی لەناوبردن.

﴿ فَأَتْبَعُوهُمْ مَشْرَقِيْنَ فَلَمّا تراءى الجُمْعان قالَ أصْحابُ مُوسى إِنّا لَمُدْرَكُونَ ﴾ دوایی فیرعەون و تاقمەکەی کەلەکاتی خۆرهەڵاتدا لای دەریا کەگەیشتن بەبەنو ئیسرائیلیەکان، دوایی کاتێ هەردوو تاقم لەیەك نزیك بونەوەو یەکتریان بینی بەنوئیسرائیلیەکان ترسان و هاوڕێکانی موسا ووتیان: بەڕاستی دوژمن بەئێمه گەیشتن، ئێمه توانای ئەوانمان نیه، دوژمن له دوامانەوەن ودەریا لەپێشمانەوەیه.

﴿ قالَ كَلاّ إِنَّ مَعِي رَبِّي سَيَهْدِيْنِ ﴾ موسا فەرموی : مەترسن وپێمان ناگەن. بەڕاستی پەروەردگاری من لەگەڵ من و ئێوەدایه ئەمانپارێزێ وڕێگەی ڕزگاریمان پێ نیشان ئەداو یارمەتیمان ئەدا.

﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ ﴾ دوایی ئێمە سروشمان نارد بۆلای موسا کەتۆ داردەستەکەی خۆت بدە لەو دەریایە، دوای ئەوەی موسا داردەستەکەی دا لەدەریاکە، دەریاکە بو بەچەند پارچەیە بەئەندازەی هۆزەکانی بەنوئیسرائیلی، هەر پارچەیەکیان بەوێنەی کێوێ بەرزبویەوە، موسا و بەنوئیسرائیلیەکان بەبێ ئازار بەرێگەی کراوەی خۆیانا چونە ئەوبەری دەریاکەوە بەبێ ئەوەی قاچیان تەڕبێ.

﴿ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ ﴾ وەئێمە تاقمەکەی تری جگەی تاقمی موسا نزیکمان کردنەوە لەوێدا لەلێواری دەریاکە، بۆئەوەی بچن بە دوای بەنوئیسرائیلیەکان بۆناو دەریاکە، دوایی ئێمە خستمانە دڵی فیرعەون وتاقمەکەی کەبڕۆنەناودەریاکەوەو چونە ناویەوە.

﴿ وَ أَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ ﴾ وە ئێمە موساو ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون هەموویانمان رزگار کردن وچونە ئەوبەری دەریاکەوە، لەپاش ئەوان ئێمە تاقمەکەی تر لەفیرعەون و تاقمەکەی بەئاوی دەریاکە خنکاندمان وئاوی دەریاکەمان بەرەڵا کرد بەسەریاناو هەموویان خنکان.

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَّ مَاكَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ بەڕاستی لەڕزگاربوونی موساو تاقمەکەی وخنکاندنی فیرعەون و تاقمەکەی نیشانەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر توانای خوای مەزن، وەتاقمێکی زۆرتر لەهەردوو تاقمەکەیان باوەڕیان نەهێنا بەموسا لەگەڵ ئەو هەمو وبەڵگە رونانەدا .

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ وەبەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر گەورەو بەدەستەڵاتە تۆڵە ئەسێنێ لەدوژمنانی خۆی ، میهرەبانە بۆ دۆستانی خۆی و ڕزگاریان ئەکا لەئازاری هەردوو جیهان.

خوای مەزن لەزۆر جێگەی قورئانی پیرۆزدا باسی موساو ئیبراهیمی کردوە، هەروەها باسی پێغەمەرەکانی تریشی کردوە زۆر جاران. بەڵام لەهەر جێگەیەکدا بەجۆرێکی تایبەتی کە شایستەی ئەو جێگەیە بێ. ئێستایش دوای باسی موسا باسی ئیبراهیم ئەکاو ئەفەرموێ:

وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا

كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبْ لِى حُكْمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَٱجْعَل لِّى لِسَانَ صِدْقٍ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِى مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾

﴿ وَأتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إبْراهِيْمَ ﴾ وەتۆ بخوێنەرەوە بەسەر بت پەرستانی عەرەبدا هەواڵی باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم کەئەوان خۆیان بەوە ئەبەستن و ئەڵێن: ئێمە نەوەی ئەوین وخۆیانی پێوە هەڵئەکێشن.

﴿ إذْ قالَ لأبِيْهِ وَقَوْمِهِ ماتَعْبُدُونَ قالُوا نَعْبُدُ أصْناماً فَنَظَلُّ لَهاعاكِفِيْنَ ﴾ کاتێ ئیبراهیم ووتی بەباوکی و تاقمەکەی خۆی وباوکی: ئێوە چ شتێ ئەپەرستن؟ تاقمەکەی ووتیان: ئێمە ئەو بتانە ئەپەرستین ولەسەر پەرستنیان بەردەوام ئەبین، خوایشمان نیە جگەی ئەو بتانە.

﴿ قالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إذْ تَدْعُونَ ﴾ ئیبراهیم کاتی بۆی دەرکەوت ئەو تاقمە زۆر گێلن و بێ ئەقڵن ووتی: ئەو بتانە کە ئێوە لەزێڕو زیو دروستتان کردوون پاڕانەوەی ئێوە ئەبیسن کاتێ بانگیان بکەن و کاتێ ئەیانپەرستن؟ .

﴿ أوَ يَنْفَعُونَكُمْ أوَ يَضُرُّونَ ﴾یا ئە وبتانە سود بەئێوە ئەبەخشن یا زیانتان لێ ئەدەن ئەگەر نەیان پەرستن وەڵامی ئیبراهیمیان دایەوە زۆر بەبێ ئەقڵانە.

﴿ قَالُوا وَجَدْنا آباءَنا كَذلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾ تاقمه بت پەرستەکانووتیان: ئێمه باوك وباپیری خۆمانمان دەست کەتوە هەر بەوجۆرە بوون وئەو بت پەرستیەیان کردوه، ئێمه لاسایی ئەوان ئەکەینەوە با هیچ شتێ نەبیستن.

﴿ قَالَ أفرَأيْتُمْ ماكُنتُمْ تَعْبُدُونَ أنتُمْ وآباؤُكُمْ الأَقْدَمُونَ فَأَنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إلا رَبَّ الْعالَمِيْنَ ﴾ ئیبراهیم بەبت پەرستانی ووت: ئایا ئێوە زانیوتانە ئەو بتانەی ئێوە و باوباپیرە پێشوەکانتان پەرستوتانە ئەگەر من بیان پەرستمو رێزیان لێ بگرم. بەڕاستی ئەبن بەدوژمنی من و لەرۆژی دواییدا بێزاری خۆیان لەمن دەرئەبڕن وئەبن بەدوژمنی من. بەلاّم من ئەوان ناپەرستم و خوای هەمو بونەوەران ئەپەرستم، کەخاوەنی چاکەیە بەسەر منەوە لەرۆژی لەدایك بونمەوە هەتا ئەو رۆژەی ئەمرم .

﴿ الَّذِي خَلقَنِيْ فَهُوَ يَهْدِينِ وَالَّذي هُوَ يُطعِمُنِي وَيَسْقِيَنِي وَإذا مَرِضْتُ فَهُوَ يُشْفِيْنِ ﴾ پەروەردگارێکی ئەوتۆیە منی دروست کردوە یەکەم جار لەنەبونەوە و دوایی هەرئەوە رێگەی ڕاست شارەزای من بکا، لاسایی وپەیڕەوی ئێوە ناکەم و، کەسێکی ئەوتۆیە خواردەمەنی دەرخوادری من ئەدا لەکاتی برسێتیداو ئاویشم دەرخوارد ئەدا لەکاتی تینوێتیداو ، هەرکاتی من نەخۆش کەوتم، دوایی هەرئەوە ڕزگارم بکا لەو نەخۆشیە، زۆرجاران بەبی دەرمان.

﴿ وَالَّذي يُمِيْتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ وَالَّذِي أطْمَعُ أنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيْئَتِي يَوْمَ الّدِيْنِ ﴾ وەپەروەردگاری بونەوەران کەسێکی ئەوتۆیە من ئەمرێنێ لەجیهاندا لەپاشا دوای مردن زیندوم ئەکاتەوە لەرۆژی دواییدا بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵەو پرسیار کردن و ، کەسێکی ئەوتۆیە ئومێدەوارم کە لە هەڵەو خراپەکانم خۆشبێ لەرۆژی زیندو بونەوەو پاداشت وەرگرتندا.

﴿ رَبِّ هَبِّ لِي حُكْماً وَّ ألْحِقِنِي بِالْصّالِحِيْنَ ﴾ ئەی پەرورەدگاری من : تۆ زانیاری و ناسینی خۆت و زانیاری یاساو دەستوری خۆت ببەخشە بەمن و بمگێڕە لەڕیزی پێغەمەران و پیاوچاکانی ڕابوردودا ولەگەڵ ئەوانم کۆبکەرەوە، بەوێنەی ئەوان لەگوناهی گەورەو بچوك بم پارێزە.

﴿ وَاجْعَلْ لِي لِسانَ صِدْقٍ فِي الآخَرِيْنَ ﴾ وەتۆ زمانی ڕاستگۆیی ورەوشتی بەرزو دروست بکە بۆمن لەناو ئەو کەسانەی تردالەمەوپاش دێن و بەچاکی وبەپەرستنی تۆ باسم بکەن لەداوی مردنم، هەروایشبو خوای مەزن نزاکەی وەرگرت و خاوەن نامەکان باسی ئیبراهیم بەزمان پاك و ڕاستگۆ ئەکەن.

﴿ وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةَ جَنَّةِ النَّعِيمِ وَأغْفِرْ لأبِي إنَّهُ كانَ مِنَ الضّالِيْنَ ﴾ وەتۆ من بگێڕە لەوکەسانە ئەگەن بەڕەزامەندی تۆ لەرۆژی دواییدا وئەبن بەخاوەنی بەهەشتی پڕ لەخۆشی

وڕابواردن، جێگەو پلەی بەرزم بدەرێ لە بەهەشتا، داوات لێ ئەكەم كەتۆ ڕێگە نیشان بدەی بەباوكم بۆلای ئەو بەڵێنەی تۆداوتە بەمن و تۆ خۆشببە لەباوكم. بەڕاستی باوكم لەڕێگەی ڕاستی تۆ پەرستی لایداوە.

﴿ وَلا تَخزني يَوْمَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ لايَنْفَعُ مالٌ وَّلا بَنُونَ إلا مَنْ أتَى اللهِ بِقَلْبٍ سَلِيْمٍ ﴾ وەتۆ من ڕسوا مەكە لەو ڕۆژەدا مردووان زیندو ئەكرێنەوەو لەخزمەت تۆدا ئەوەستن، ئەو ڕۆژە كوڕو دارایی سود بەئادەمیزاد نابەخشن كەلەجیهاندا خۆیانیان پێوە هەڵەئەكێشا مەگەر كەسێ سود لەوان وەر ئەگرێ چوبێتە خزمەت خوای مەزن بەدڵێكی پاك و چۆڵ لەهەمو خراپەیە، با ئەوەیشمان لەبیر بێ ئەو ڕستانە بۆ فێركردنی ئادەمیزادە بۆ جۆری پاڕانەوە.

وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾

﴿ وَأزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِيْنَ وَ بُرِزَتْ الْجَحِيْمُ لِلْغاوِينَ ﴾ وەنزیك ئەخرێتەوە و ئامادەكراوە بۆ ئەو كەسانەی لەخوای مەزن ئەترسن هەتا بچنە ناو ئەو بەهەشتەوەو، دۆزەخ دەرئەخرێ و ئاشكرا ئەكرێ بۆ كەسانێ لایانداوە لەڕێگەی ڕاست و باوەڕیان نەهێناوە و بێ فەرمانی خوای مەزنیان كردوە، بەچاوی خۆیان جێگەی خۆیان لەدۆزەخدا ئەبینن.

﴿ وَقِيْلَ لَهُمْ أيْنَ ماكُنْتُمْ تَعْبُدُونَ ﴾ وەئەبێژرێ بەبێ باوەڕان لەلایەن فریشتەكانەوە لەچ جێگەیەكن شتی ئێوە ئەتان پەرستن لەبتەكان لەجیهاندا.

﴿ مِنْ دُونِ اللهِ هَلْ يَنْصُرونَكُمْ أَوْ يَنْتَصِرُونَ ﴾ لەجگەی خوای مەزن. ئایا ئەو بتانە یارمەتی ئێوە ئەدەن ورزگارتان بکەن لەسزای خوای مەزن و یا ئەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن بەلادانی سزا لەخۆیانو یارمەتیان ئەدرێ؟ نەئەتوانن یارمەتی ئێوە بدەن ونەخۆیشیان ڕزگار ئەکەن و نەیارمەتیتان ئەدرێ.

﴿ فكبكبوا فِيها هُمْ وَالغاوونَ وَجُنُودُ إبْلِيسَ أجْمَعُونَ ﴾ دوایی ئەو بتانەو بێ باوەڕان وسەربازەکانی شەیتان هەموویان فڕە ئەدرێنە ناو دۆزەخ، هەندێکیان ئەکەون بەسەر هەندێ تریانا لەدۆزەخدا بەگەورەو بچوکیانەوە، بەمامۆستاو شاگردیانەوە.

﴿ قالُوا وَهُمْ فِيْها يَخْتَصِمُونَ تَاللهِ إنْ كُنّا لَفِي ضَلالٍ مُبّينٍ ﴾ یەکێ تر لەبەدبەختی دانیشتوانی دۆزەخ ئەوەیە کاتی لەدۆزەخدان هەندێکیان دەست ئەکەن بەدوژمنایەتی هەندی تریان ئەڵێن: سوێندمان بەخوای مەزن. بەڕاستی ئێمە لەناو گومڕایی ورسواییەکی ئاشکرادا بوین لەجیهانداو کوێرو سەرلێ شێواو بوین، بت پەرستان وبتەکانیان ، شەیتان وسەربازەکانی وگوناه بارەکان ولادەرەکانیان لەڕێگەی ڕاست ئەڵێن: ئێمە ڕێگەی خراپمان گرتبو:

﴿ إذ نسوبكُمْ بِرَبِّ العالَمِيْنَ وَما أضَلّنا إلاّ الْمُجْرِمُونَ ﴾ کاتی ئێمە ئێوەی بتمان کردبو بەوێنەی پەورەدگاری هەمو بونەوەراندا لەپەرستنتانا وئێمەی لانەدا لەڕێگەی ڕاست مەگەر تاوانباران لە پێشەواکانمان .

﴿ فَمالَنا مِنْ شافِعِيْنَ وَ صَدِيْقٍ حَمِيْمٍ ﴾ دوایی ئێستا بۆ ئێمە نیە هیچ کەسێ بۆ ئێمە بپارێتەوە لەفریشتەو پێغەمەرانو پیاوچاکان و نەدۆستێکی دڵسۆزو نیاز پاك گرنگی بەئێمە بدا. خۆزگایە ئێمەیش بەوێنەی باوەڕداران بوینایەو باوەڕمان بهێنایە.

﴿ فَلَوْ أنَّ لناكَرَةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ دوایی ئێمە ئومێدمان وایە ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە جارێ تر بۆلای جیهان دوایی ئێمە باوەڕ ئەهێنین بەخواو بەپێغەمەران و بەڕۆژی دوایی و کردەوەی چاك ئەکەین.

﴿ إنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً وّماكانَ أكْثَرُهُم مُؤمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەباسی مێژووی ئیبراهیم و هەواڵی دانیشتوانی مەککە بەڵگەیەکی ڕوون وئاشکرا لەسەر پوچی ئایین و بت پەرستی ئەوان، لەڕۆژی دواییدا ئابڕویان ئەچێ وخۆیان بەدرۆ ئەخەنەوەو زۆرتر لەو کەسانە باسی ئیبراهیمیان بۆ کراوە باوەڕناهێنن و بەردەوام ئەبن لەسەر بی باوەڕی.

﴿ وَإنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيْزُ الرَّحِيْمُ ﴾ وەبەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر ئەو خاوەنی توانایە بەگورجی تۆڵە بسێنێ لەبێ باوەڕان، خاوەنی بەزەی ومیهرەبانیە مۆڵەتیان ئەدا هەتا ئەوان یا منالێکیان باوەڕ بهێنن.

كَذَّبَت

قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿١١٥﴾ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنْجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِيْنَ ﴾ نوح کاتێ باسی نێرراوەکانی خـوای مـەزنی ئـەکرد بـۆ گەلـەکەی خۆی و تاقمی نوح پێغەمەرەکانیان بەدرۆخستبووەوە ئەیان ووت: هیچ نێرراوێکی خوای مەزن نەبوە هەتا تۆیش نێرراوی خوای مەزن بی. بێگومان هەرکەسێ تاکـە پێغەمـەرێ بەدرۆ بخاتەوە، وەك ئەوە وایە هەموو پێغەمەرانی بەدرۆ خستبێتەوە.

﴿ إِذْ قالَ لَهُمْ اَخُوهُمْ نُوحٌ اَلا تَتَّقُونَ إِني لَكُمْ رَسُولٌ اَمِيْنٌ ﴾ کاتێ نوحی برای پشتی ئـەو تاقمە ووتی بەوان: ئایا بۆ ئێوە لـەخوای مەزن ناترسـن واوز لـەوبتانـە بـهێنن. بەڕاسـتی مـن نێرراوێکی نیاز پـاك وڕاسـت وپژم لـەلایـەن خـوای مەزنـەوە نـێرراوم بـۆلای ئێـوە، ناتـان خەڵـەتێنم، خۆتان ئەزانن من ڕاستگۆم.

﴿ فـاَتَّقُوا اللّٰهَ وَأَطِيْعُـونِ ﴾ دوایـی ئێـوە لـەخوا بترسـن ووازلـەبت پەرسـتی بـهێنن وفەرمانبەرداری من بن، ئەو شتەی من بەئێوەی ڕائەگەیەنم چاکەی هەردوو جیـهانی ئێـوەی تێدایە.

﴿ وَما أَسْأَلُكُمْ عَلَيهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاّ عَلى رَبِّ الْعالَمِيْنَ فَاتَّقُوا اللّٰهَ وَ أَطِيْعونِ ﴾ وەمن داوای هیچ پاداشت و کرێیە لـەئێوە ناکەم لـەسەر ڕاگەیاندنی پـەیامی خـۆم ، پاداشتی مـن لای هیچ کەسێ نیە مەگەر هەر لـەلای خوای هەمو وبنەوەرانە ، دوایی ئێوە لـەخوا بترسن و پەیڕەوی وفەرمانبەرداری من بن، دوای ڕاستی بکەون ، ئەم داوایەی من بەختیاری هــەردوو جیهانی تێدایە بۆ ئێوە.

﴿ قالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الأَرْذَلُونَ ﴾ تاقمی نوح لـەوەلآمی فـەرمودەی نوحـدا ووتیـان :ئایا ئێمە چۆن باوەڕ بەتۆ بهێنین و لـەکاتێکا ئەو کەسانەی دوای تۆ کەوتوون بێ نرخ و کەم دارایی و پلـەو پایەن و ژێردەستەی ئێمەن، ئەوانەیش بەبێ بیرکردنەوەو بەڕووالـەت باوەڕیان هێناوە لـەدواکەوتنی تۆدا ڕاست ناکەن و نیاز پاك نین.

﴿ قالَ وَما عِلْمِي بِما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ نوح فەرمووی: من بەشـتێ نـازانم ئـەوان ئەیکـەن لـەنهێنییداو چ شـتێ لـەدڵیانایـە، مـن تەماشـای کـاری ئاشـکرای ئـەوان ئەکـەم ،مـن هـەر ڕاگەیاندنم لـەسەرە ،دوایی هەرکەسێ ئارەزۆوی هەیــە بابـاوەڕ بـهێنێ وهەرکەسـێ نایـەوێ باوەڕنەهێنێ خۆی بەرپرسیارە.

﴿ إِنْ حِسابُهُمْ إِلاّ عَلى رَبِّي لَوْ تَشْـعُرُونَ ﴾ پرسـیاری کـردەوەی ئـەوان و ئاگـاداربوون لـەسەر شتێ لـەدڵیانا نیە مەگەر لـەسەر پەروەردگاری منە ئەگەر ئێـوە هەسـتی پـێ بکـەن و خاوەن هەستبن ئەزانن هەر خـوای مـەزن ئاگـای لـەنـهێنی دڵ هەیـە، ئێوەبـۆ دوری ئـەگرن لـەباوەڕهێنان هەرلـەبەرئەوەی هەژاران و زۆربەی خاوەن پیشەکان باوەڕیان هێنــاوە؟ خـاوەن داراییەکان داوایان کرد لـەنوح ئەو هەژارانە دەربکا لای خۆی هەتا ئەوان باوەڕی پی بهێنن.
نوح فەرموی:

﴿ وَما أَنا بِطارِدِ الْمُؤْمِنِيْنَ إِنَ أَنا إِلاّ نَذِيْرٌ مُبِّينٌ ﴾ وەمن هەرگیز ئەو باوەڕدارانە دەرناکــەم لای خۆم پاڵـیان پێوە نانێم لـەبەرئەوەی ئەوان هەژارن، باوەڕهێنان نرخ بۆ دارای و پلـەوپایــە دانانێ وشارەزایی کەری ئادەمیزادە بۆلای ڕێگــەی ڕاسـت . مـن چـۆن لـەبـەر ڕەزامـەندی ساماندارانی ئەوان دەربکەم؟ من هیچ ناکەم بەبێ فەرمانی خوای مەزن مەگەر مـن ئاگـاداری کەری ئاشکرام بۆ ئادەمیزاد و لـەسزای خوای مەزن ئەیان ترسێنم، باوەڕهێنان و بی باوەڕیان بەدەستی خۆیانەو خۆیان سەربەستن .

﴿ قالُوا لَئِنْ لَم تَنْتَهِ يا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِـنَ الْمَرْجومِـيْنَ ﴾ بـی بـاوەڕانی تـاقمی نـوح کـەبی ئومێدبوون لـەدەرکردنی هەژارەکان ووتیان: ئەی نوح: ئەگەر تۆ واز نەهێنی لـەجنێودان بـەم

خوایانەی ئێمە بەڕاستی تۆ لەوکەسانە ئەبی لەلایەن ئێمەوە بەردەباران بکرێ و ئازاری زۆرت بدەین. نوح کەبێ ئومێد بو لەباوەڕهێنانیان

﴿ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحاً وَنجِّنِي وَمَنْ مَعِي مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ نوح فەرموی: ئەی پەروەردگاری من: بەڕاستی ئەو بێ باوەڕانە من وفەرمودەکانی تۆ بەدرۆئەخەنەوەو هەڕەشەی کوشتنم لێ ئەکەن. دوایی تۆ فەرمان بدە لەنێوان من و ئەو بێ باوەڕانەدا بەفەرمانێ ئەو کەسانەی ڕاستن بەهۆی ئەو فەرمانە سەربکەون وتۆڵە لە پیاوخراپان بسێنرێ.

﴿ وَنجِّنِي وَمَنْ مَعِي مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ وەتۆ من وکەسێ لەگەڵ منە لە باوەڕداران ڕزگارمان بکە لەوسزایە دێتە خوارەوە بۆ سەربی باوەڕان. خوای مەزن پاڕانەوەکەی وەرگرت وئەفەرموێ:

﴿ فَأَنْجِيْناهُ وَمَنْ مَعَهُ فِيْ الْفَلَكِ الْمَشْحُون ﴾ دوایی ئێمە نوح وکەسێ لەگەڵ نوحدا بوون لەباوەڕداران ڕزگارمان کردن لەناو کەشتیەکا پڕ لەخۆراك و ئاو و کەل وپەل و گیاندارانا لەهەموو ڕەگەزێ.

﴿ ثُمَّ أغْرَقْنا بَعْدُ الْباقِيْنَ ﴾ لەپاش ئەوەی نوح و باوەڕداران ڕزگاریان بو ئێمە ئەوانی ترمان لەبی باوەڕان دوای ئەوان خنکاند، چونکە بەردەوام بوون لەسەر بی باوەڕی .

﴿ إن فِي ذلِكَ لآيَةَ وَّ ماكانَ أكْثَرُهُمْ مُؤمِنِيْنَ وَإنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْرَحِيْمُ ﴾ بەڕاستی لەڕزگار کردنی نوح و باوەڕداران و خنکاندنی بێباوەڕان بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر گەورە هەیە بۆ بێباوەڕانی قورەیشکە ئازاری زۆری موحەمەد ئەدەن و زۆرتر لەوان باوەڕناهێنن بەخوای مەزن و بەڕاستی خوا زۆر بەدەسەلاتە بۆ سزادانی بێ باوەڕان بەگورجی، میهرەبانە مۆڵەتیان ئەدا هەتا خۆیان یا منالەکانیان باوەڕبهێنن و پەشیمان ببنەوە.

كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾

وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾

﴿ كَذَّبَتْ عادٌ الْمُرْسَلِيْنَ إِذْ قالَ لَهُمْ أخوهُمْ هُودٌ ألا تَتَقُونَ ﴾ هۆزی عاد بەدرۆیان خستەوە پێغەمبەرەکانی خۆیان کاتێ هودی برای پشتی خۆیان بەوانی فەرمو: ئایا بۆ ئێوە لەخوا ناترسن و خۆتان ناپارێزن لە بێ فەرمانی خوای مەزن کە ئەم چاکەو زانیەرییەی بە ئێوە داوە. ئەو هۆزە دانیشتوی نێوان عومان و حەزرەمەو تبون و عاد باپیریان بوە؟

﴿ إِنِي لَكُمْ رَسُولٌ أمِيْنٌ فَاتَّقُوا اللهَ وَأطِيْعُون ﴾ بەڕاستی من نێراوێکی دەست پاك و بێفێڵو ڕاست ویژو کردە ڕاستم نێراوم بۆلای ئێوە هەتا ڕێگەی ڕاست شارەزای ئێوە بکەم، دوایی ئێوە لە خوای مەزن بترسن و خۆتان لەبێ فەرمانی خوا بپارێزن و فەرمانبەرداری من بکەن بۆ بەجێهێنانی ئەو شتانە من پێتان ڕائەگەیەنم.

﴿ وَما أسألُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجْرٍ انْ أجْرِيَ إلاّ عَلى رَبِّ الْعالَمِيْنَ﴾ وەمن داوا لە ئێوە ناکەم لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خوای مەزن هیچ پاداشتێ، پاداشت دانەوەی من لەسەر هیچ کەسێ نیە مەگەر هەر لەسەر پەروەردگاری هەمو بونەوەرانە.

﴿ أتَبْنُونَ بِكُلِ رِيْعٍ آيَةً تَعْبَثُون ﴾ ئایا ئێوە بۆدروست ئەکەن لەهەمو جێگەیەکی بەرزو لەسەر هەمو تەپۆلکەیە کۆشکێکی بەرزو بڵندو نایاب لەبەرئەوە هاتوچۆ کەران تەماشایان بکەن و ئێوە لەنێو ئەو کۆشکانەدا ڕابوێرن و یاریو کاری بێسودیان تێدابکەن و خۆتانیان پێوە هەڵکێشن. ئەو جۆرە کۆشکانە بەو نیازانەوە زۆر خراپەو گاڵتە ڕابواردنی نە ماوەی جیهانن، بەڵام هەمو خانویەك دروست بکرێ بۆئەوەی خۆیو خێزانی لەناویا دانیشن بەگوێرەی پێویست زۆر چاکەو بەگوێرەی یاسای ئایینە.

﴿ وَتَتَخِذُوْنَ مَصَانِعَ لَعَلَكُمْ تَخلدُونَ ﴾ وه ئێوه دروست ئەكەن چەندین كۆشك و خانوی بەرزی قایم و حەوزی ئاو، ئومێدتان وایه بەردەوام ئەبن لەجیهاندا، چاوەڕوانی مردن و نەمان ناكەن.

﴿ وَإذ بَطَشْتُمْ بَطَشْتُم جبارِيْنِ فَأَتَقُوا اللهَ وَأطِيْعُون﴾ وه هەر كاتێ ئێوه ویستبێتان پەلاماری یەكێ بدەن و سزای بدەن هەڵمەتان ئەبرد بۆ ئەو كەسه بەبێ بەزەیی‌و ئەتان كوشت كاتێ ئێوه توڕه ببونایه، وێنەی مرۆڤێكی زۆردارو بێ‌ویژدان و ناڕەوایانه ئەتان كوشت. دوایی ئێوه خۆتان بپارێزن لەو شتەو پەلاماره ناڕەوایه، لەسزای خوا بترسن و پەیڕەوی من بكەن بۆئەو شتەی داوای لەئێوه ئەكەم و كاری بێ‌بەزەیی مەكەن.

﴿ وَاتَقُوا الَذِی أمَدَكُمْ بِما تَعْلَمُونَ ﴾ وه ئێوه بترسن لەكەسێكی ئەوتۆ كه بەخشیویه بەئێوه چەندین چاكەی گەورەو بەنرخ ئێوه ئەیزانن و بەوان ڕائەبوێرن و ئەیانكەن بەهۆی كاری بێ سودو ستەمكردن و پەلاماری ناپەسەند.

﴿ أمَدَكُمْ بِأنْعامِ وَّبَنِيْنَ وَجَنات وَّعِيُوْن ﴾ ئێوه بترسن لەكەسێكی ئەوتۆ بەخشیوێ بەئێوه چوار پێ‌و گیاندارانی زۆرو چەندین باخ و بۆستان و چەندین سەرچاوەی ئاوی شیرین، بەكاریان ئەهێنن بۆبەدەست هێنانی پلەو پایەو سامان، بەهۆی كوڕەكانتانەوه هێزو دارایتان بۆزۆر ئەبێ، بەو ئاوەیش كشتوكاڵی پێ فەراهەم ئەهێنن و باخەكانتان بەرهەمی چاك ئەرەخسێنن.

﴿ إنِی أخافُ عَلَيْكُمْ عَذابَ يَوْمِ عَظِمِ ﴾ بەڕاستی ئەگەر ئێوه لە ستەمكردن و زۆرداری واز نەهێنن من چاوەڕوان ئەكەم ئەترسم لەسزای ڕۆژێكی زۆر گەورەو سەخت توشتان ببێ‌و بەو سزایه ئێوه بنەبڕ ببن.

﴿ قالُوا أسواءٌ عَلَيْنا أو عَطَتَ أمْ لَمْ تَكُنْ مِنْ آلُوا غِطِيْنْ ﴾ ڕون كردنەوەی ئەو چاكانەی دراوه بەو بێ‌باوەڕانەو ئاگاداركردنیان لەكردنی كاری خراپ و ترساندنیان لەسزایەكی سەخت سودێكی بەوان نەبەخشی و بەردەوام بوون لەسەر بێ باوەڕی و ووتیان: تۆ ئامۆژگاری ئێمه بكەی یا لەو كەسانەبی ئامۆژگاریمان نەكەی لای ئێمه یەكسانه ئێمه باوەڕ بەتۆ ناهێنین و كاری خۆمان زۆرتر ئەكەین.

﴿ إنَ هذا إلا خُلُقُ الأَوَّلِيْنَ وَما نَحْنُ بِمُعَذَبِيْنَ ﴾ ئەو شتەی ئەو تۆ ئێمه لەسەرینی لەبت پەرستی‌و ئایین و ڕەوشتی ئێمه هیچ شتێ نیه مەگەر یاساو ڕەوشتێكه ئێمه بۆمان ماوەتەوه لەباو باپیره پێشوەكانمانەوەو ئێمه دوای ئەكەوین و ئێمه سزامان نادرێ لەسەر بێ‌باوەڕی بەتۆو لەسەر بێ‌فەرمانی تۆو پەلاماردانی ئێمه بۆسەر دانیشتوان و ئازاردانیان.

﴿ فَكَذَبُوهُ فَأَهْلَكْناهمْ ﴾ دوایی هۆزی عاد هودیان بەدرۆ خستەوەو بەردەوام بون لەسەر بێ‌باوەڕی. دوایی ئێمه ئەو هۆزه بێ‌باوەڕەمان لەناو بردن بەبایەكی زۆر سەخت و تیژ .

﴿ إنَ فِي ذلِكَ لآيَةً وَماكانَ أكْثَرُهُمْ مُؤمِنيْنَ إنَ رَبَكَ لَهُوَ العَزِيْزُ الرَّحِيْمُ ﴾ بەڕاستی لەناو بردن و بنەبڕکردنی تاقمی عاد تەمێ کردن و ئامۆژگاری کردنە بۆ بت پەرستانی قورەیش و زۆر لەوان باوەڕ ناهێنن، هەرچەندە تۆ داوایان لێبکەی باوەڕ بهێنن. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بەدەسەڵاتە بۆ سزادانیان، خاوەنی بەزەیی و میهرەبانیەو مۆڵەتیانی ئەدا بۆئەوەی یا خۆیان یا منالەکانیان باوەڕ بهێنن.

كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

﴿ كَذَبَتْ ثَمُودُ المُرْسَلِيْنَ إِذْ قالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صالِحٌ ألا تَتقُونَ ﴾ هـۆزی سمـود نێراوەكـەی خوايان بەدرۆ خستەوە بەتايبەتی صالح پێغەمبەر، ئـەو هـۆزە بـت پەرستانە دەستيان دابـوە ڕابواردن و خواردنەوەو دروست كردنی خانوو كۆشكی ناياب كاتێ برای ڕەگـەزی ئـەوان صالح فەرموی بەو هۆزە: ئايا بۆ ئێوە لـەسزای خوای مەزن ناترسن و هاو بەشی بۆ دائەنێن و خۆتان ناپارێزن لـە بێ‌فەرمانی خوای مەزن؟

﴿ إِنِي لَكُمْ رَسُولٌ أمِيْنٌ فَأتَقُوا اللهَ وَأطِيْعُونِ ﴾ بەڕاستی بۆ ئێوە من نـێراوێكی نياز پـاك و ڕاست گۆم لـەهەمو رويەكەوە بەو جۆرە ئێوە منتان تاقی كردوەتەوە، دوايـی ئێـوە لـەسـزای خوای مەزن بترسن و پەيڕەوی پەيامی من بكەن بۆ بەجێ‌هێنانی فەرمانەكانی خوای مەزن.

﴿ وَما أسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجْرٍ انْ اجْرِىَ إلاّ عَلى رَبِ العالَمِيْنَ ﴾ وەمن داوای هيچ پاداشتێ لـە ئێوە ناكەم لـەسەر ڕاگەياندنی پەيامی خواو ئامۆژگاری من بۆئێوە لـەم جيهانەدا، پاداشـتی من لـەسەر هيچ كەسێ نيە مەگەر لـەسەر پەروەردەكەری هەمو بونەوەرانە لـەهەردو جيهاندا.

﴿ أتُتْرَكُونَ فِي ماهُنا آمِنْيْنَ ﴾ ئايا ئێوە لـەم جيهانەدا وازتان لێ ئەهێنرێ لـەناو ئەم خۆشیو ڕابواردنەدابێ وەبیو بەبێ ئازارو توشی سزا نابن لـەسەر بێ‌باوەڕيتان و بەردەوام ئەبن.

﴿ فِي جَناتٍ وَعِيُونٍ وَزُرُوعٍ وَنَخلٍ طَلَعُها هَضِيْمٌ ﴾ لـەنێو ئەم باغ و بێستانەداو لـەنێو ئـەم هەموە سەرچاوەی ئاوەداو لـەنێو ئـەم هـەموە كشـتوكاڵو سـەوزاييەداو لـەنێو ئـەم هـەموە خورمايانەدا كەبەرهەمێكی نەرم و تازەيـان هەيـەو خـوای مـەزن هـەمو ئەوانـەی بەخشـيوە بەئێوە.

﴿ وَتَنْحِتُونَ مِـنَ الْجِبـالِ بُيُوتـاً فـارِهْيْنَ فَـأتَقُوا اللهَ وَأطِيْعُـونِ ﴾ وە ئێـوە چـەندين خـانوو كۆشكی ناياب لـە كێوەكانا ئەتاشن بۆخۆتان بەخۆشی لـەناويا ڕابوێرن، دوايی پێويسـتە ئێـوە لـەسزای خوا بترسن و سوپاسی خوای مەزن بكەن و پەيڕەوی پەيامی من بكەن و جێ‌بەجێيان بكەن و وامەزانن بەردەوام ئەبن لـەو خۆشيەدا.

﴿ وَلاتَطِيْعُوا أمْرَ المُسرِفِيْنَ الذِيْنَ يُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ وَلا يُصْلِحُـونَ ﴾ وە ئێـوە پـەيڕەوی فەرمانی كەسانێكی ئەوتۆ مەكەن لـەسنور لايان داوە خراپە بـڵاو ئەكەنـەوە لـەناو زەويـداو ئاژاوە دروست ئەكەن و هەوڵی چاكە نادەن بۆ دانيشتوان لـەڕوی زەويداو دانيشتوان ئەكەن بەدوژمنی يەكتری.

﴿ قالُوا إنَما أنْتَ مِنَ المُسَحَرِيْنَ ماأنْتُمْ إلا بَشَر مِثْلُنا فَآتِ بِآيَـةٍ إنْ كُنْـتَ مِـنَ الصّـادِقِيْنَ ﴾ هۆزی سەمود بەصالحيان ووت: بەڕاستی تۆ لـەو كەسانەی جادوت لێ‌كراوەو ئـەقڵيان تێـك چوەو، تۆ هيچ شتێك نيت مەگەر ئادەميزادێكی وێنەی ئێمەو ئەخۆی و ئەخۆيتەوەو ئەگەڕێی بەبازاڕدا، دوايی ئەگەر تۆ لـەو كەسانەی گفتوگۆيان ڕاستە نيشانەيەكی ئاشكرا بهێنە بـۆلای ئێمە بەڵگەبێ لـەسەر پێغەمبەرايەتی تۆ.

ساڵح بەجۆرێکی ئاسایی لەسەر داخوازی ئەو هۆزە بەحوشترێکەوە چو بۆلایان کەلەبەر چاوی خۆیان لەناو بەردێکەوە حوشترێکی ڕەنگ سوری لێهاتە دەرەوە، دەمانگ بەسەر ئاوسی ئەو حوشترەدا تێپەڕیبو، کتوپڕ بەگوێرەی داخوازی ئەوان بێچویەکی لێ پەیدابو.

﴿ قَالَ هٰذِهِ نَاقَةُ اللهِ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ ﴾ ساڵح فەرموی : ئەم هوشترە نیشانەیەکی زۆر گەورەی خوای مەزنە بۆ ئێوەو ئازاری مەدەن و ئەبێ ڕێزی لێ بگرن، خوای مەزن پێویستی کردوە ئاوەکەتان بکرێ بەدوو بەشەوە. ئەو هوشترە بەشێکی هەبێ لەو ئاوەداو ئێوە بەشەکەی ترتان هەبێ لەڕۆژێکی دیاری کراوا بۆ هەردوو لاتان.

﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ وە ئێوە تووشی ئەو هوشترەی مەکەن هیچ ئازارێ وبەنیازی خراپە ونزیکی مەبنەوە، دوایی ئەگەر ئێوە ئازاری بدەن تووشی ئێوە ئەبێ سزایەکی گەورەو سەختی ڕۆژێ کەدیاری کراوە بۆ نەمانی ئێوە.

﴿ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ ﴾ دوایی ئەو هۆزە هوشترەکەیان کوشت وسەریان بڕی، دوای پیلانێ دایان نابو بۆ کوشتنی ، دوای کوشتنی هوشترەکە پەشیمان بونەوەو ترسان ئەو سزایە ساڵح بەڵێنی پێدابو بڕژێ بەسەریانا.

﴿ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ ﴾ دوای کوشتنی هوشترەکە تووشی ئەوان بو سزایەکی زۆر سەخت بەوجۆرەی ساڵح بەڵێنی پێدابوو بەبێ کەم و زۆری و لەکاتی دیاری کراوا، ئەوەبو لەناکاودا خوای مەزن هەورەگرمەیەکی بۆ ناردن و گیانیان دەرچوو، هەموویان مردن و بەردو خۆڵ ڕژا بەسەریان.

﴿ إِنَّ فِي ذٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەو سزایە تووشی هۆزی سەمود بو نیشانەیەکی زۆر گەورە بۆ بت پەرستانی قورەیش وتەمێ کردنیان. بەڵام زۆرتر لەبت پەرستانی قورەیش باوەڕناهێنن وبەردەوامن لەسەر بێ باوەڕی.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بەدەستەڵاتە بۆ تۆڵەسەندن لەبێ باوەڕان وبت پەرستانی قورەیش، خاوەنی بەزەیی ومیهرەبانە بۆیان هەتا خۆیان یامناڵەکانیان پەشیمان ببنەوە.

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم

مِنْ أَزْوَٰجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِيْنَ إِذْ قَالَ لَهُمْ أخوهُمْ لُوطٌ ألا تَتَّقُونَ إِنِي لَكُمْ رَسُولٌ امِيْنٌ ﴾ تاقمی لوت بەدرۆیان خستەوە پێغەمەرەکان بەتایبەتی لووت پێغەمەر کاتی لووتی برای رەگەزی ئەوان بەوانی ووت :ئایا ئێوە بۆ لەسزای خوای مەزنناترسن و خۆتان ناپارێزن لەداوێن پیسی و کاری بێز لێ کراوەو باوەڕناهێنن. بەڕاستی من نێرراوێکی نیاز پاکم بۆ ئێوەو ئاسایشی ئێوەم ئەیەوێ.

﴿ فَأتَّقُوا اللهَ وَأطِيْعُونِ ﴾ دوایی ئێوە لەخوای مەزن بترسن و واز لەبی فەرمانی خوا بهێنن و پەیڕ ٙوی من بکەن بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای مەزن.

﴿ وَما أَسْألُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجْري إلا عَلى رَبِّ الْعالَمِيْنَ ﴾ وەمن داوای هیچ پاداشتێ ناکەم لە ئێوە لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خۆم و ئامۆژگاری کردنی ئێوە، پاداشتی کاری من لەسەر هیچ کەسێ نیە مەگەر لەسەر پەروەردگاری هەمو بونەوەرانە.

﴿ أتَأتُونَ الذكْرانَ مِنَ الْعالَمِيْنَ ﴾ ئایا بۆ ئێوە ئەچنە لای پیاوان ومندالانی نێر لەئادەمیزادو کاری خراپیان لەگەڵ ئەکەن لەبونەوەران بەدژی سروشت ولەسنوور لائەدەن بەکردنی ئەو کارە خراپە.

﴿ وَتَذَرُونَ ماخَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أزْواجِكُمْ بَلْ أنْتُمْ قَوْمٌ عادُونَ ﴾ وە ئێوە واز ئەهێنن لەشتێ پەروەردگاری ئێوە دروستی کردوە بۆ ئێوە بچنە لایان لەژنەکانتان کەچونەلایان مەبەستی سروشتیە. بەڵکو ئێوە تاقمێکن لاتان داوە لەسنوری دیاری کراو بۆ ژن ومێردی کەمەبەست زاوزی کردنە نەك تەنها بۆ ڕابواردن.

﴿ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يالُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِيْنَ ﴾ تاقمەکەی لوت بەلوتیان ووت: ئەی لوت: ئەگەر تۆ کۆتایی نەیەری لەداواکردنی ئێمە بۆ باوەڕهێنان بەتۆ، واز نەیەری لەئێمە بۆ چونە لامان بۆلای پیاوان تۆ لەوکەسانە ئەبی دەربکرێن لەم گوندەی ئێمە، نایەڵین لەسەر جگەی ئایینی ئێمە بی ودژی ئێمە بی.

﴿ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ القالِينَ ﴾ لوت فەرمووی: من بەڕاستی لەو کەسانەم ئەوکارەی ئێوەم پێ ناخۆشە. واز لەباسکردنی ئەو خراپە نایەرم و داواتان لێ ئەکەم وازی لێ بهێنن وەمن ڕازی نیم بەدانیشتن لەنێو ئێوەدا هەتا ئێوە لەسەر کردنی ئەو کارە خراپەبن. لووت فەرموی:

﴿ رَبِّ نِجِّني وَ أَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ فَنَجَّيْناهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِيْنَ إِلا عَجُوزاً فِي الغابِرِيْنَ ﴾ ئەی پەروەردگاری من:تۆ من وخێزانەکەم و ئەو کەسانەی لەگەڵ مندان وباوەڕیان هێناوە ڕزگارمان بکە لەشتێ ئەو تاقمە ئەیکەن، دوایی ئێمە پاڕانەوەکەمان وەرگرت لوت و خێزانەکەیمان ڕزگار کرد وباوەڕداران بەگشتی مەگەر پیرەژنێ نەبێ کەژنی لووت بو ڕزگارمان نەکرد، مابوەوە لەگەڵ ئەوان وبەوکارە خراپەی ئەوان ڕازی بوو. زانایان ئەڵێن: ئەو کەسانەی لەگەڵ لووت بوون بریتی بوون لە دوو کچ وزاوایەکی.

﴿ ثُمَّ دَمَّرْنا الآخَرِيْنَ وَأَمْطَرْنا عَلَيْهِمْ مَطَراً فَساءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِيْنَ ﴾ لەپاش ڕزگارکردنی لووت وخێزانەکەی ئێمە لەناومان بردن ئەو کەسانەی ئەو ئەوتۆ مابونەوە لەسەرکردنی ئەو کارە خراپەو بەردەوامبوون لەسەر بێ فەرمانی خوای مەزن، دوایی ڕژاندمان بەسەریانا بارانێکی زۆر سەخت کەبریتی بو لە بەردو گۆگرد و ئاگر، دوایی خراپ بوو بارینی ئەو بەردە بەسەریانا، بەوێنەی ئەو بەردە بو خوای مەزن ئەوتاقمەی بەو بەردە ترساندبو کە سزای ئەوانی پی ئەدرێ.

﴿ إِنَّ فِي ذٰلِكَ لَآيَةً وَماكانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤمِنِيْنَ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيْزُ الرَّحِيْمُ ﴾ بەڕاستی لەسزادان و لەناوبردنی تاقمی لووت نیشانەو بەڵگەی ئاشکرایە بۆئەو کەسانەی بێ فەرمانی خوای مەز نئەکەن وکردەوەی خراپ ئەکەن. بەتایبەتی تەمێ کردنە بۆ بت پەرستانی قورەیش، زۆرتر لەتاقمی بت پەرستانی قورەیش باوەڕنایەرن بەموحەمەدو هەروەك تاقمەکانی ڕابووردو پێغەمەرەکانی خۆیانینا بەدرۆخستەوەو بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر گەورەو بەهێزە بۆ سزادانی بێ باوەڕان، خاوەنی بەزەییە بۆ کەسانێ خۆیان یا منالەکانیان پەشیمان بنەوەو مۆڵەتیان ئەدا. بەڵکو باوەڕبهێنن.

كَذَّبَ أَصْحَٰبُ

لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾

﴿ كَذَبَتْ أصْحابُ الأيْكَةَ الْمُرْسَلِيْنَ ﴾ دانیشتوانی ئەیکە بەدرۆیان خستەوە ڕەوانەکراوەکانی خوای مەزن بەتایبەتی شوعەیب پێغەمبەر. ئەیکە دارستانێکی زۆر چڕو پڕو درەختەکانی چووبون بەناو یەکا، دانیشتوانی ئەو جێگەیە خاوەنی ڕەوشتێکی زۆر خراپبون لەنێوان خۆیانا. بەتایبەتی لەکڕین و فرۆشتن و پێوانەدا. بۆخۆیان پێوانەو کێشانەیان تەواو بو. بەڵام کەمیان ئەدا بەجگەی خۆیان.

﴿ إذْ قالَ شُوعَيْبُ ألا تَتَقُونَ إنِي لَكُمْ رَسُولٌ أمِيْنٌ فَأتَقُوا اللهَ وَاطِعُونِ ﴾ کاتێ شوعەیب فەرموی بەدانیشتوانی ئەیکە: ئایا ئێوە بۆ لەخوا ناترسن و واز لەکاری خراپ بۆ نابەرن

لەبارەی کێشانەو پێوانەو ژمارەدا. بەڕاستی من نێراوێکی نیازپاك و دەست پاك و دەمیاکم بۆ ئێوە. دوایی ئێوە پێویستە پەیڕەوی من بکەن بۆ بڵاوکردنەوەی دادپەروەریو خۆتان بپارێزنلەسزای خوای مەزن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن.

﴿ وَما أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجرٍ إنْ أَجْرِيَ إلاّ عَلى رَبِ العالَمِيْنَ ﴾ وەمن داوای پاداشت لەئێوە ناکەم لەسەر ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی خوای مەزن، پاداشتی من لەسەر هیچ کەسێ نیە مەگەر لەسەر پەروەردگاری هەمو بونەوەرانە.

﴿ أوْفُو الكَيْلَ وَلا تَكُونُ مِنَ الْمُخَسِرِيْنَ ﴾ شوعەیب فەرمانی پێدان و فەرموی: پێویستە ئێوە بەتەواوی شتەکان بپێون کاتێ پێوراوەکان ئەفرۆشن بەئادەمیزادو، ئێوە کەم مەکەنەوە لەو فرۆشراوە بەوانی ئەدەن و لەسەری ڕێککەوتون و زیانیان لێمەدەن، زۆر بۆخۆتان بهێنن و کەم بدەن بەوان.

﴿ وَزِنُوا بِالْقِسْطاسِ الْمُسْتَقِيْمِ ﴾ وەئێوە بەترازویەکی ڕاست و بێ فێڵ کێشانە بکەن و ناتەواوی تێدا نەبێو دادپەروەری بەکار بهێنن لەکێشانەو کڕین و فرۆشتندا.

﴿ وَلاّ تَبْخَسُوا النّاسَ أشْياءَهُمْ وَلاّ تَعْثُوا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِيْنَ ﴾ وەئێوە هیچ شتێ لەمافی ئادەمیزاد کەم مەکەنەوە لەکاتی مامەڵەکردنداو مافی تەواوی خۆیانیان بدەنێو، ئێوە لەزەویدا ئەوپەڕی خراپە بڵاو مەکەنەوە، مافیان زەوت مەکەن بەهۆی کێشانەو پێوانەوە، تاڵان کردن مەکەن بەپیشە بۆخۆتان.

﴿ وَأتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالجِبْلَةَ الأَوَّلِيْنَ ﴾ وە ئێوە بترسن لەسزای کەسێکی ئەوتۆ ئێوەو خاوەن سروشتە پێشوەکانی تری لەئادەمیزادو جگەی ئادەمیزاد دروست کردوە لە پێش ئێوەوە.

﴿ قالُوا إنَما أنْتَ مِنَ الْمُسَحَرِيْنَ وَما أنْتَ إلا بَشَراً مِثْلَنا وَإنْ نَظُنُكَ مِنَ الكاذِبِيْنَ ﴾ دانیشتوانی ئەیکە بەشوعەیبیان ووت: بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی جادوت لێکراوە لەلایەن جادو گەرانەوەو تۆ هیچ نیت مەگەر ئادەمیزادێکی وێنەی ئێمە ئەخۆی ئەخۆیتەوە ئەڕۆی بەبازاڕو، ئێمە بەڕاستی گومان ئەبەینە تۆ لەو کەسانەی درۆئەکەن لە گفتوگۆو کردەوەیانا، ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی:

﴿ فَأَسْقِط عَلَيْنا كِسْفاً مِنَ السَماءِ إنْ كُنْتَ مِنَ الصادِقِيْنَ ﴾ دوایی تۆ بخەرە خوارەوە بەسەر ئێمەدا لەئاسمانەوە پارچەیەکی لەناو بەر لەسزای زۆر گران ئەگەر تۆ لەو کەسانەی ڕاست ئەکەن لەداواکاری خۆیانا.

﴿ قالَ رَبِي أعْلَمُ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ شوعەیب ووتی: پەروەردەکەری من زاناترە لەهەمو کەسێ بەشتێ ئێوە ئەیکەن و زاناترە بەسزایە شایستەی کردەوەی ئێوە بێ، خوای مەزن

ئەوەی سپاردویە بەمن ئەوەیە داوا لەئێوە بکەم خوای مەزن بپەرستن و بتانترسێنم لەدژایەتی فەرمانی خوای مەزن و لەسزای ئەو.

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كانَ عَذابُ يَوْمٍ عَظِيْمٍ ﴾ دوایی دانیشتوانی ئەیکە شوعەییبیان بەدرۆ خستەوە، دوایی توشی ئەوان بو سزای ڕۆژێ هەورێ سێبەری پەیدا کردبو بەسەریانا. بەڕاستی سزای ئەو ڕۆژە سزایەکی زۆر گەورەو سەختبو کەئەوانی لەناو برد، یانی دوایی بەردەوامبونی ئەو تاقمە لەسەر بێباوەڕی خوای مەزن توشی گەرمایەکی زۆر سەختی کردن و هەناسەیان کورت بو، بەو بۆنەوە لەخانوەکانیان چونە دەرەوەو ئەگەڕان بەدوای سێبەرێکا، دوایی هەورێکیان بینی سێبەری کردبو، هەمویان کۆبونەوە لەژێریا، دوایی خوای مەزن بەردو ئاگرو هەورەگرمەی بەسەردا ناردنە خوارەوەو هەمویان سوتان و بنەبربون.

﴿ إِنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً وَماكانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِيْنَ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيْزُ الرَّحِيْمُ ﴾ بەڕاستی هەیە لەسزادان و سوتاندنی دانیشتوانی ئەلئەیکە نیشانەی ئاشکرا بۆ ئادەمیزاد بەتایبەتی بت پەرستانی قورەیش هەتا تەمێ خوار بن و باوەڕ بهێنن، زۆربەی ئەوان باوەڕ بەخوای مەزن ناهێنن و، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بەدەسەلاتە بۆ سزادان و تۆڵە کردنەوە لەبێ باوەڕان، زۆر میهرەبانە مۆڵەتی بێباوەڕان ئەدا لەبەر ئەوەی خۆیان یا منالەکانیان باوەڕبهێنن.

وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَـٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَـٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَـٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟

هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾

﴿ وَاَنَهُ لَتَنزِيلُ رَبَّ العالَمِيْنَ ﴾ وه بەڕاستی قورئان نامەیەکەهاتوەتە خوارەوە لەلایەن پەروەردگاری هەمو بونەوەرانەوە، جادوو پۆشە ویژی نیە، وەك ئەوەی قورەیشیەکان گومان ئەبەن.

﴿ نَزَلَ بِهَ الرّوُحُ الأَمِيْنُ عَلى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ المُنْذَرِيْنَ ﴾ جبرەئیل ئەو قورئانەی هێناوەتە خوارەوە بە فەرمانی خوای مەزن بۆ سەر دڵی تۆ هەتا لەبەری بکەی‌و بیزانی‌و مانا‌و ناوەرۆکی جێگەی خۆی بکرێ لەدڵتاو لەبیرت نەچێتەوە، لەبەر ئەوەی تۆ ببی بەیەکێ لە پێغەمبەران و ئادەمیزادو دانیشتوانی مەککە بترسێنی لەسزای خوای مەزن.

بۆزانین: جبرەئیل ناو براوە بەرۆحولئەمین، چونکە گیانی ئادەمیزاد ڕزگار ئەکا بڕوا پێکراوە بۆهێنانی سروش بۆلای پێغەمبەران بەو جۆرەی خوای مەزن فەرمانی پێداوە بەبێ دەستکاری کردن.

﴿ بِلِسان عَرَبِي مُبِيْـنٍ ﴾ ئەو قورئانە هاتوە بەزمانی عەرەبی ڕون، بەزمانی خۆت و تاقمەکەی خۆت، هەتا بەبێ وەستان و بیرکردنەوە گفتوگۆی پێبکەی‌و تاقمەکەیشت ڕاستەو خۆ بەبێ مانا کردنی ڕستەکانی لەماناو مەبەستی قورئان بگەن و بیانویان نەمێنێ، جگەی پێغەمبەری خۆمان شوعەیب و هودو صالح و ئیسماعیل بەزمانی عەرەبی دانیشتوانیان ترساندوە لەسزای خوای مەزن.

﴿ وَاِنَهُ لَفِي زُبُرِ الأَوَّلِيْنَ ﴾ وه بەڕاستی ئەو قورئانە پەکی ئێوە ئەخاو باوەڕی پی ناهێنن پوختەو ناوەڕۆکی نامەکانی پێشوە لەوانا باسی قورئان وهاتنی پێغەمبەر کراوە، جوەکان و ئەو عەرەبانەی بوون بەجو بەڕاستی ئە وڕاستیە ئەزانن، ئیتر چۆن تانە لەڕاستی قورئان و پێغەمبەر ئەدەن.

﴿ أَوَ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ آيَةً أَنْ يَعلَمَهُ عُلَمـاءُ بَنِـي إِسْرائِيْلَ ﴾ ئایا بـۆ بـت پەرسـتانی مەککـە بەڵگەی زۆر ئاشکرا نیە لـەسەر ڕاستی قورئان و پێغەمەر کە ئەو ڕاستیانەیان زانیوە زاناکـانی بەنوئیسرائیلی و ئەوانیش بەبت پەرستانیان ووتوە کاتێ بت پەرستان لـەوانیان ئەپرسـی، ئیتر ئێوە داوای چ شتێ ئەکەن دوای ئەوەی زاناکانی جوەکان ئـەو ڕاسـتیانەیان بـەئێوە ووتـوە؟ بەگوێرەی ئەقڵ ڕاستی موحەمەد ڕونە، چونکە ئێوە ناتوانن وێنەی قورئـان دابنێـن، تـەورات وئینجیلە نەگۆڕاوەکان موژدەیان بەهاتنی پێغەمەر داوە.

﴿ وَلَوْ أَنْزَلْناهُ عَلى بَعْضِ الأَعْجَمِيْنَ فَقَـرَأَهُ عَلَيْـهِمْ ماكـانُوا بِـهِ مُؤمِنِيْـنَ ﴾ وەئەگـەر ئێمـە قورئانمان ڕەوانە بکردایە بۆسەر هەندێ لـەئادەمیزادی جگەی عەرەب یا زمانی پاراو نەبوایـە لـەعەرەبیدا، دوایی موحەمەد ئەو قورئانـەی بخوێندایـە وبەسـەر ئـەواندا باوەڕیـان نەئـەهێنا، چونکە لـەمانای قورئان نەئەگەیشتن، ئیتر ئێوەی دانیشتوانی مەککە بیانوتان نـەماوە، چونکـە قورئان بەزمانی خۆتان هاتوەتە خوارەوەو باوەڕی پی ناکەن.

﴿ كَذلِكَ سَلَكْناهُ فِي قُلُوبِ الْمُجرِمِيْنَ لايُؤمِنُونَ بِـهِ حَتّـى يَـرَوا الْعَـذابَ الأَلِيْـمَ ﴾ هـەر بەوێنەی ئەو باوەڕنەهێنانەی ئێوە لـەسەرینی هەر بەوجۆرە ئێمە بێ باوەڕیمان خسـتوەتە دڵـی تاوانبارانەوەو دڵیان بەئیسلام ناکرێتەوەو بەسەربەستی خۆیان بـاوەڕ بـەقورئان نایـەرن هـەتا بەچاوی خۆیان سزای خاوەن ئازار ئەبینن لـەدوای مردنیـان. باوەڕهێنـان لـەوکاتـەدا سـوود بەوان نابەخشێ.

﴿ فَيَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لايَشْعُرُونَ فَيَقُولُوا هَلْ نَحْنُ مُنْظَـرُونَ ﴾ دوایـی باوەڕنـەهێنانیان ئـەو سزایە کوتوپڕ ئەچێ بۆلای ئەو تاوانبارانـە ولـەکاتێکا ئـەوان هەسـت بـەهاتنی ناکـەن کـە هەڕەشەیان پێ ئەکرا بەوسزایە، دوایـی ئـەو تاوانبارانـە ئـەڵێن: خۆزگایـە ئێمـە لـەجیـهاندا بۆماوەیەکی کەمتر دوابخراینایە وباوەڕمان بهێنایـەو کـاری چاکمـان پێشـی خۆمـان بخستایە وگوناهەکانمان بشۆرایەتەوە، ئەوەیش دوورە بۆ ئەوان. ئەو تاوانبارانە بەپێغەمەرەکەی خۆیان ئەووت: ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی ئەوەی تۆ بەڵێنی پـێ ئـەدەی لـەسـزادانی ئێمـە تـۆ بیهێنـە بۆلای ئێمە، خوای مەزن وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ أَفَبِعَذابِنا يَسْتَعْجِلُونَ ﴾ ئایا دوایی ئەو تاوانبارانـە چـۆن پەلـە ئەکـەن بـۆ هـاتنی سزا بۆلایان، کاتێ هاتە خوارەوە ئەوان توانای گەڕانەوەی ئەو سزایەیان نابێ ورێگەی هەڵهاتنیان بۆ نابێ.

﴿ أَفَرَأَيْتَ إِنْ مَتَّعْناهُمْ سِنِيْنَ ثُمَّ جاءَهُمْ مايُوعَدُونَ مـاأَغْنى عَنْـهُمْ ماكـانُوا يُمَتَّعُـونَ ﴾ ئایـا دوایی تۆ بەسەرهاتی ئەو تاوانبارانە چۆن ئەبینی و هەواڵ بدە بەمن ئەگـەر ئێمـە واز لـەوان بهێنین چەندساڵێ بەخۆشی ڕابوێرن لـەجیهاندا، لـەپاشـا هـات بـۆلای ئـەوان شتێ بـەڵێنی

پێدراوە بەوان لـەهاتنە خوارەوەی سزا سوود بەوان ناگەیەنێ ئەو شتەی ئەوان پێیان ڕابوردوە لـەجیهاندا و سزایان لێ ناگێڕێتەوە.

﴿ وَماأَهْلَكْنا مِنْ قَرْيَةٍ إلاّ لَها مُنْذِرُونَ ذِكْرى وَما كُنّا ظالِمِيْنَ ﴾ وە ئێمـە هیـچ گونـدێ لـەناو نابەین وسزایان نادەین مەگەر بۆ ئەوان نێرابێ پێغەمەران لـەبەر ئامۆژگاری کردنیـان و ترساندنیان لـەسزای خوای مەزن و، ئێمە ستەم لـەهیچ کەسێ ناکەین بەبێ ناردنی پێغەمـەران لـەناویان ببەین و سزایان بدەین.

﴿ وَما تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّياطِيْنَ ﴾ وەشـەیتانەکان قورئانیـان نەهێناوەتـە خـوارەوە بۆسـەر موحەمەد، هەروەك قورەیشیەکان ئەڵێن: موحەمەد بەوێنەی پۆشە وێژەکان شەیتان یـاریدەی ئەدان.

﴿ وَمايَنْبَغِي لَهُمْ وَمايستَطِيْعُونَ ﴾ وەشایسـتە نیـە بـۆ شـەیتانەکان قورئـان بـهێنن بـۆلای موحەمەد بەو جۆرەی قورەیشیەکان ئەیلێن و توانای هاوردنی قورئانیان نیە، چونکە سـروش هێنـان بەتایبـەتی هـەر بـۆ فریشـتەکانە پـاکن، لـەبەرئـەوەی شـەیتانەکان دەرونیـان پیسـەو بەرچاوتەنگن.

عەرەبەکان بڕوایان وابوو هـەمو پۆشـەوێژێ شـەیتانێکی هەیـە هـەواڵی پۆشـراویان بـۆ ئەهێنێ، کاتی قورئان هاتە خوارەوە بۆسەر پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتیان: هەرئەو شـەیتانانە سـروش دێنێ بۆلای موحەمەد .خوای مەزن بەدرۆی خستنەوە، فەرموی:

﴿ إنَّهُمْ عَنْ السَّمْعِ لَمَعْزولُونَ﴾ بەڕاستی ئەو شەیتانانە ڕێگەیان لێ گیراوە وقەدەغـەکراوە لـەوان کەئەوان بگەنە جێگەیە هەواڵی ئاسمان ببیسن، ئیتر چۆن ئەتوانن سروش بهێنن بـۆلای موحەمەد.

فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾

﴿ فَلا تَدْعُ مَعَ اللهِ إِلهاً آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِيْنَ ﴾ دوایی تۆ بلێ بەو کەسەی ئەو گومانە پوچە ئەباو بڕوای بە خوای مەزن نەهێناوەو بوختان بەتۆدا ئەکا:تۆ مەپەرستە لەگەڵ خوای مەزندا خوایێ تر وهاوبەشی بۆ دامەنێ، دوایی ببی لەو کەسانە پێویست کراوە لەسەریان سزایان بدرێ.

﴿ وَأَنْذِرْ عَشِيْرَتَكَ الأَقْرَبِيْنَ ﴾ وەتۆ هۆزو خزمە نزیکەکانی خۆت بتسرێنە لەسزای خوای مەزن نزیك لەدوای نزیك: یەکەمین جار داوایان لێ بکە دوای تۆ بکەون و بینا ترسێنە لەسەر مانەوەیان لەسەر بێ باوەڕی. ئەوان شایستەی ئەوەن لەپێشەوە بانگیان بکەی بۆلای ڕێگەی ڕاست، زۆرتر لەکەسانی تر ئارام بگرە لەسەریان پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەو فەرمانە هەڵساو چوە سەرکێوی سەفاو بانگی کردن و فەرمانی پێدان وفەرموی: ئەی نەوەکانی عەبدولموتەلیب، ئەی نەوەکانی هاشم، ئەی کوڕو نەوەی عەبدولمەناف، ئەی عەباسی مامی پێغەمەر، ئەی سەفیەی پوری پێغەمەر خۆتان بپارێزن و من ناگەمە فریاتان، باوەڕهێنان وکردەوەی خۆتان فریاتان ئەکەوێ لەپاشەڕۆژدا.

﴿ وَاخْفِضْ جَناحَكَ لِمَنْ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ وە تۆ باڵی خۆت دابنەوێنە بۆ کەسێ دوای تۆ کەوتوە لەباوەڕداران. نەرم ونیان بە لەگەڵیان وڕێزیان لێ بگری، ئیتر لەهۆزو خزمی خۆتبن یا لەجگەی ئەوان بن.

﴿ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِي بَرِئٌ مِمّا تَعْمَلُونَ ﴾ دوایی ئەگەر خزمەکانت بێ فەرمانی تۆیان کرد، دوای ئەوەی تۆ ئەوانت ترسان، دوایی تۆ بلێ بەوان: بەڕاستی من بێزارم لەشتێ ئێوە ئەیکەن لەبێ باوەڕی وهیچ جۆرە پەیوەندی خزمایەتی ودۆستایەتیمان لەنێواندا نامێنێ.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيْمِ الَّذِي يَراكَ حِيْنَ تَقُومُ وَتَقَلُّبَكَ فِي السّاجِدِيْنَ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيْعُ الْعَلِيْمُ ﴾ وەتۆ مەترسە لەدژاەیتی ئەوان پشت ببەستە لەسەر خوایەکی زۆر بەدەسەڵات و زۆر میهرەبان و خاوەنی بەزەیی و بەئومێدی جگەی خوای مەزن مەبە، ئەو خوایەی ئەوتۆ تۆ ئەبینێ کاتێ تۆ هەڵئەسی و ئەچی بۆ نوێژ کردن، وەجم و جۆڵ و هەڵسوکەوتی تۆ ئەبینێ لەنێو ئەو کەسانەی سوژدە ئەبەن بۆ خوای مەزن لەنوێژدا.

بەڕاستی خوای مەزن ئەبیسێ شتێ خزمەکانت ئەیلێن: ئەزانێ بەنیازی دەروونی ئەوان، پاداشتی چاکەو خراپەی هەمو کەسێ ئەداتەوە. خوای مەزن تۆ سەرئەخاو بەسەر دوژمنانی تۆدا، ئاگاداری کردەوەی ئەو بی باوەڕانەیە .

هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾

وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

﴿ هَلْ اُنَبِئُكُمْ عَلى مَنْ تَنَزَلُ الْشَياطِيْنَ تَنَزَلُ عَلى كُلِّ أفاكٍ أثِيْمٍ ﴾ موحەمەد بەوجۆرە نیە ئێوە گومانی بۆ ئەبەن کەشتێ بە ئێوەی ئەڵێ لەشەیتانەوە وەری گرتوە ، ئایا من هەواڵ بدەم بە ئێوە بەکەسێکی ئەوتۆ شەیتان بەهەواڵی دەست کردو درۆینە دێت بۆلای، شەیتان دێتە خوار بۆ سەرکەسێ زۆر بوختان کەر و گوناهبارە و درۆزنە.

﴿ يَلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كاذِبُونَ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە کەسانێکی ئەوتۆن گوێ ئەگرن لەشەیتانەکان وگفتوگۆی درۆو پڕو پوچ لەوانەوە وەرئەگرن و گومانیان وایە لەهەواڵی ئاسمانەکانن، لەپاشا ئەخەنە سەری شتێ ئارەزوویان هەبێ و، زۆرتر لەبێ باوەڕان درۆئەکەن لەهەواڵ و گفتوگۆکانیانا، موحەمەد لەو کەسانە نیە ئەوان باسی ئەکەن، چونکە ئەوان موحەمەدیان تاقی کردوەتەوە ڕاستەو زمان پاکە،لەلایەن خوای مەزنەوە سروشی بۆدێ بەهۆی جبرەئیلەوەو بەئێوەی ڕائەگەیەنێ.

﴿ وَالشُعَراءُ يَتَبِعُهُمْ الْغاوونَ ﴾ هەندێ لەبت پەرستان ئەیان ووت: قورئان هۆنراوەیەو شیعرە و موحەمەد هۆنراوە بێژو شاعیرە، خوای مەزن بەدرۆیانی خستەوەو فەرموی: هۆنراوەوێژەکان کەسانێکن دوای ئەوان ئەکەون ئادەمیزادی گێل وناشارەزا وسەرگەردان. بەدرۆو ناموسی دانیشتوان ئەڕوشێنن و خراپەیان ئەخەنە پاڵ وتاوانج لەخۆیان و ڕەگەزیان ئاراستە ئەکەن، باسی تاوانباران بەچاکە ئەکەن.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنهُمْ فِي كُلِّ وادٍ يَهِّيمُونَ وَيَقولُونَ مالايَفْعَلُونَ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کەبەڕاستی هۆنراوە بێژەکان لەناو هەموو گفتوگۆکانیانا ولەهەمو شیوێکا ولەهەمو کاتێکا سەرگەردانن و لەسەر بیروباوەڕ و بۆچونێ ڕاناوەستن و شتێ ئەڵێن خۆیان نایکەن. باسی پیاوچاکان بەخراپە ئەکەن، ناوی تاونباران بەچاکە باس ئەکەن و دوای ئاوات و نیازی پڕوپوچ ئەکەون وشتی ناشایستە ئەدەنە پاڵ خوای مەزن.

﴿ إلاّ الّذِيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ وَذَكَرُوا اللهَ كَثِيْراً ﴾ مەگەر هۆنراوە بێژانێکی ئوتۆ باوەڕیان هێنابێ و کردەوە چاکەکانیان کردبێ ویادو باسی خوای مەزنیان بەزۆری کردوەو

خۆیانسیان خـــەریك نـەكردوە بـەكاری خراپـەوەو، زۆرجـاران قورئـان ئـەخوێنن و كاربـە ناوەرۆكەكەی ئەكــەن، ئـەو كەسـانە لـەسـەر بیروبـاوەڕی بـەردەوامن و گفتوگـۆی چـاك لـەهۆنراوەكانیانا باس ئەكەن بەبی درۆو بوختان.

﴿ وَانْتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ ماظُلِمُوا ﴾ وەئەو هۆنـراوە بێژانـەی بـاوەڕداران تۆڵـەی خۆیانیـان لـەبت پەرستان سەندوەتەوە لـەدوای كـاتی سـتەمیان لێ كرابـوو، دوای ئـەوەی جنێودرابـو بەموسڵمانان ووەڵامی بی باوەڕانیان داوەتەوە ئەو هۆنراوە بێژە باوەڕدارانە وێنەی عەبدوڵای كوڕی ڕەواحەو حەسانی كوڕی سابیت، كەعبی كوڕی زوهەیر كـەوەڵامی بـت پەرسـتانیان دایەوە كەلـەدژی موسڵمانان هۆنراوەیان دانابو.

﴿ وَسَيَعْلَمُونَ الَّذِيْنَ ظَلَمُوا أيَّ مُنْقَلِبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ وەلـەمەودوا كەسانێكی ئەوتۆ ستەمیان كردوە لـەدژی موسڵمانان و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گفتوگۆیـان ئـەكرد ئـەزانن بـۆلای چ جێگـەیـە ئەوان ئەگەڕێنەوەو چارەنوسیان چۆن ئەبێ دوای مردنیان، بێگومان ئـەو جێگـەیـە دۆزەخـەو سزای زۆر سەختە.

**كۆتایی بەسورەتی شوعەراء هات لەڕۆژی سێشەممە**

**( ٥ ) ی مانگی سەفەر ( ١٤٢١ ) كۆچی**

**بەرامبەر بە ٩/ ٥/ ٢٠٠٠ ی زایینی**

# ﴿ سورەتی نەمل ﴾

لەمەككە هاتوەتە خوارەوە ژمارەی ئایەتەكانی (٩٣) ئایەتن .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ١ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٣ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ٥

﴿ طَس ﴾ مانای وێنەی ئەو دوو پیتانە لەسەرەتای سورەتی ئەلبەقەرەو سورەتەكانی تـردا باسیان كراوە بەدرێژی.

﴿ تِلْكَ آیاتُ الْقُرآنِ وَكِتابٍ مُبِيْنٍ هُدىً وَبُشْـرى لِلْمُؤْمِنِيْـنَ ﴾ ئـەو سـورەتە بریتـین لـە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز ئەخوێنرێنەوەو ئایەتەكانی نامەیەكن ئەنوسرێتەوە كـارە ڕەواكـان و كارە قەدەغەكراوەكان و شتی ڕاست و پوچ وسنورەكانی خوای مەزن وچـەندین شت ڕون ئەكەنـەوە، نامەیەكـە ئـادەمیزاد ڕانومـایی ئـەكا بـۆلای ڕێگـەلای ڕاسـت و مـــوژدە دەرە بەوكەسانەی باوەڕیان بەخواو فریشتەكان و نامەكان و پێغەمەرەكان و ڕۆژی دوایی هەیە.

﴿ الَّذِيْنَ يُقِيْمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُـونَ الزَّكـاةَ وَبِـالآخِرَةِ هُـمْ يَعْمَـهُونَ ﴾ كەسـانێكی ئـەوتۆن نوێژەكانی خۆیـان ئەكـەن لـەكاتی دیـاریكراوی خۆیانـاو زەكاتـەكانیان بـەگوێرەی یاسـا ئەبەخشن بەهەژاران و ئەوان باوەڕی بـێ گومانیـان بـەڕۆژی دوایـی هەیـەو ئـەزانن زینـدو ئەكرێنەوە.

﴿ إِنَّ الَّذِيْنَ لا يُؤمِنُونَ بِالآخِرَةِ زَيَّنا لَـهُمْ أعمالَـهُمْ فَـهُمْ يَعْمَـهُونَ ﴾ بەڕاستی كەسـانێكی ئەوتۆ باوەڕ بەڕۆژی داویی نایەرن ئێمە بۆ ئەوانمان ڕزاندوەتەوە كارە خراپەكانیان، ئـەقڵمان

پێداون وچاك و خراپ جوی ئەكەنەوە،دوایی ئەوان سەرگەردانن دێن وئەڕۆن و بی باوەڕیان بۆخۆیان هەڵبژاردوەو دوای شەیتان كەوتوون.

﴿ أولئِكَ الَّذِينَ لَهُمْ سُوءُ الْعَذابِ وَهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمُ الأَخْسَرُونَ ﴾ ئەو تاقمە بێ بـاوەڕو سەرگەردانانە كەسانێكی ئەوتۆن بۆئەوان هەیە سزای خراپ، وەك كوشتن و بەدیل كردنیـان و كردنیان بەبەندە لـەجیهانداو، ئەوان لـە ڕۆژی دواییدا هەرئەوان زیانۆمەندترینی ئادەمیزادن و بەشیان نیە لـە پاداشتی چاكەو شایستەی سزادانن.

وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ۖ فِى تِسْعِ ءَايَـٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَـٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾

﴿ وَ إِنَّكَ لَتُلَقى الْقُرآنَ مِنْ لَدُنْ حَكِيْمٍ عَلِيْمٍ ﴾ وەبەڕاستی فێرکراوە بەتۆو بەخشراوە بەتۆ قورئان لـەلایەن خوایەکەوە هەمووشتی لـەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنی، ئەزانێ بەهەمو شتێ، بۆیە قورئانی بێ بەخشیوی لـەبـەری بکـەیی و ناوەڕۆکەکـەی ڕابگەیـەنی بـەئادەمیزاد، ئـەو قورئانە خۆت دات نەناوە بەگوێرەی گومانی بێ باوەڕان خۆت دات نابێ.

﴿ إِذْ قَالَ مُوسى لأَهْلِهِ إِنّي آنَسْتُ ناراً سَآتِيكُمْ مِنْها بِخَيْرٍ ﴾ بیری ئەو کاتە بکەرەوە موسا دەستوری لـەشوعەیب وەرگرت کە بگەڕێتەوە بـۆلای دایگـی و براکـەی لـەمیسـر، دوایـی ڕێگەی دەشتی گرتەبەر ورێگەکەی لێ وونبو ، شەو تاریك و سارد، دوایی بەخێزانەکەی ژن وکورەکەی ووت: بەڕاستی من لـەدورەوە ئاگرێ ئەبینم ئێـوە لـێرە چاوەڕووان بکـەن مـن ئەڕۆم بۆلای ئەو ئاگرە و دوایی من بێمەوە بـۆلای ئێـوە بەهەواڵێکـەوە و کەسێ لای ئـەو ئاگرە بێ ورێگەیەکمان نیشان بدا.

﴿ أَوْ آتِيْكُمْ بِشَهابٍ قَبَسٍ لَعَلَّكُـمْ تَصْطَلُـونَ ﴾ یـا مـن بـهێنم بـۆ ئێـوە گرێکـی ڕوونـاك کەرەوەی ئاگر بەدارێکەوە یالـەسەر پلیتەیە، بۆئەوەی خۆتانی پێ گەرم بکەنەوەو ڕوناکی لێ وەربگرن لـەم شەوە زۆر تاریکەدا.

﴿ فَلَمّا جاءَها نُودِيَ أَنْ بُورِكَ مَنْ فِي النّارِ وَمَنْ حَوْلَها ﴾ دوایی کاتێ موسا چـوە لای ئـە وئاگرەو لـێی نزیك بویەوە موسا دەنگێکی بیست لـەلایـەن خـوای مەزنـەوە فـەرموی: ئـەی موسا: پیرۆزە کەسێ لای ئەم ڕوناکیەو لـەملاو لای ئەو ڕوناکیە بێ. ئەو شتەی ئەوتۆ کـەتۆ ئەیبینی و وائەزانی ئاگرە ڕوناکیەکی پیرۆزە خوای مەزن بەتوانای خـۆی دروسـتی کـردوەو تۆیش لـەلای ئەو ڕوناکیە وەستاوی پیرۆزی ومن تۆم هەڵبژاردوە بەپێغەمەر بۆ خـۆم مـوژدە بدەی بە ئادەمیزاد بیانترسێنە و پیرۆزی بلاوبکەرەوە بەسەر زەویدا.

﴿ وَسُبْحانَ اللهِ رَبِّ الْعالَمِيْنَ ﴾ وەتۆ خوای پاك بکـەرەوە لـەهـەموو کـارێکی ناشایسـتە لـەهاوبەش دانان بۆ خوایە کەپەروەردگاری هەموو بونەوەرانە و دروستکەریانە.

﴿ يا مُوسى إِنَّهُ أَنا اللهُ الْعَزِيْزُ الْحَكِيْمُ ﴾ ئەی موسا هەموو کارو فەرمان ئەمەیە: بەڕاسـتی ئەو کەسەی بانگی تۆی کردوە منم خوایەکی گەورەو بەدەسەلات هەموو شتێ لـەجێگـەی شیاوی خۆیا دائەنێ، ئەو کارە پەکخەرانە مـن پێـم داوی وەریـان بگـرەو لـەکاتی تایبـەتیدا بەکاریان بهێنە، خوای مەزن فەرموی بەموسا:

﴿ وَأَلْقِ عَصاكَ ﴾ وەتۆ فڕەبدە داردەستەکەی خۆت هـەتا توانـای ئێمـەببینی ، موسـایش داردەستەکەی خۆی فڕەدا و بینـی کەداردەسـتەکەی بوبـەمارێکی ڕاسـتەقینە، زۆر بـەتیژی ئەهاتو ئەڕۆیشت.

﴿ فَلَمّا رَأَها تَهْتَزُ كَأَنَّها جانٌّ وَلّى مُدبِراً وَلَـمْ يُعَـقِّبْ ﴾ دوایـی کەموسـا داردەسـتەکەی خۆی بینی زۆر بەتیژی ئەڕوا وەك ئەوەی ئەو داردەسـتە مـارێکی زۆر خێرایـە لـەڕۆیشـتندا، موسا ترساو ڕای کردو پشتی کردە مارەکەو ئاوڕی نەدایەوە.

﴿ يامُوسى لاتَخَفْ إنّي لايَخافُ لَدَيّ الْمُرْسَلُونَ ﴾ پـەروەردگاری موسـا فـەرموی: ئـەی موسا: تۆ مەترسە لـەهیچ بونەوەرێ. بەڕاستی نابێ بترسێ لای من هەموو نێرراوەکانی من.

﴿ إلاّ مَنْ ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْناً بَعْدَ سُوءٍ فَإنِي غَفُورٌ رَحِيْمٌ ﴾ بەلاّم کەسێ لـەخۆی ئەترسێ لەپێغەمەران ستەمی لـەخۆی کـردوە بەڕلـەوەی بکـرێ بەپێغەمـەر بـەگوناهێکی بچـووك ، بەوێنەی ئەوەی بۆ موسا پەیدابو بۆکزێکی دالـەپیاوێکی قیبتی وکوشتیو پەشـیمان بویـەوە و لـەپاشا لـەداوی خراپەکە چاکەی بەدوادا هێنـا، دوایـی پەشـیمان بونەوەکـەمان وەرگـرت، چونکە بەڕاستی مـن لێ خۆشـبوونم زۆرە، خـاوەنی میـهرەبانی و بـەزەییم بـۆ ئـەو کەسـەی پەشیمان ئەبێتەوەو چاوەڕوانی سزای من نەکا.

﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ ﴾ وەتۆ دەستی خۆت بکە بەیەخـەی کراسەکەی خۆتا لـەژێر قۆڵتەوە لـەپاشدا تۆ دەستی خۆت دەربهێنە ، تۆ دەستی خۆت ئەبینی بە سپیەتێکی زۆر جوان وڕوونـاك بـەبی ئـەوەی تووشـی نەخۆشـییەکی خـراپ بوبـێ وەك بەڵەکی. ئەو فڕدانەی داردەستی خۆت و دەرهێنانی دەستت لـەبەردەم ئێمەدا، لـەبەرئـەوەی دڵ ئارام بی و ئێمە یاریدەی تۆ ئەدەین.

﴿ فِي تِسْعِ آياتٍ إلى فِرْعَونَ وَقَوْمِهِ إنَهُمْ كانُوا قَوْماً فاسِقِيْنَ ﴾ ئەو دووکـارە پەکخەرانـە دوو کاری پەکخەرن لـەو نۆ کارە پەك خەرانەی ئێمە تۆ بـەو نـۆ کارانـەوە ئـەنێرین بـۆلای فیرعەون و تاقمەکەی .بەڕاستی ئەوان تاقمێکن لایانداوە لـەسنووری خوای مەزن.ئەو نۆکارە پەکخەرانە ئەمانەن: (١) داردەست . (٢) دەستی سپی. (٣)بچڕانی ئاوی دەریا. (٤) لافاو. (٥)کولـلە. (٦) ئەسپێ. (٧)بۆق. (٨) کەمئاوی لـەدەشتەکاندا. (٩) کەم دەرامەتی.

﴿ فَلَما جاءَتْهُمْ آياتُنا مُبْصِرَةً قالُوا هذا سِحْرٌ مُبِيْنٌ ﴾ دوایی کاتێ ئەو نۆکارە پەکخەرانەی ئێمە بەڕوونی و بەئاشکرا چوون بۆلای فیرعەونو تاقمەکەی دوای گەڕانەوەی موسا بۆ میسر و ووتیان:ئەو کارەی موسا جادوی ئاشکرایە وکـاری پەکخـەری پێغەمەرایەتیـە، نیـە بـەدەم باوەڕیان نەهێنا، لـەدڵیانان ئەیانزانی ڕاستە.

﴿ وَ جَحَدُوا بِها وَاسْتَيْقَنَتْها أنْفُسُهُمْ ظُلْمـاً وّعُلـواً ﴾ وەفیرعـەون وتاقمەکـەی باوەڕیـان نەهێنا بەو بەڵگەڕونانــە بـەجۆرێکی دەرکـەوتوو ، لــەدەروونی خۆیانـا بـڕوای بێگومانیـان بەڕاستی ئەو بەڵگەو کارە پەکخەرانـە هێنـابو، باوەڕیـان پـێ نـەهێنا لـەبەرئـەوەی ستەمیان لـەخۆیان کرد و خۆیان بەبالاّتر و گەورە دائەنا کەمل شۆڕبکەن بۆ موسا کەسـێکی تەنـهای ئاساییە، چۆن ئەبێ پێغەمەر بێ .

﴿ فَانْظُر كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُفْسِدِيْنَ ﴾ دوایی تۆ تەماشا بکە چۆن بـوە ئـەنجام و کۆتـایی ئەو کەسانە باوەڕیان نەهێناو خراپەیان بلاّو ئـەکردەوە لـەزەویدا: ئـەوەبو بەڕاسـتی بـەئاوی دەریا لـەجیهاندا خنکان و پاشەڕۆژ ئەچنە دۆزەخ.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنا داوُدَ وَسليمانَ عِلْماً ﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەخشیومانە بەداود وبەسولەیمان زانینی ئایین و فەرماندان لەنێوان ئادەمیزاد و پیشەسازی و زانینی زمانی باڵندە. بەتایبەتی داود زرێ وچەك و شتی تری دروست ئەكرد لەئاسن و ئاسنمان بۆنەرم كردبو . سولەیمان فێری زانینی زمانی باڵندەمان كردبو، ئەو زانستیانە ئێمە بەوانمان بەخشیبوو بەكاریان ئەهێنا بۆ سوودی بەندەكانی خواو پەرستنی خوای مەزن . بەكاریان نەئەهێنا لەدژی ئادەمیزادی تاوانبار و داگیركردنی سامانیان. بەڵكو سوپاسی خوای مەزنیان بكەن.

﴿ وَقالا الحَمْدُ للهِ الَّذِي فَضَّلَنا عَلى كَثِيرٍ مِنْ عِبادِهِ الْمُؤْمِنِينَ ﴾وە دوای ئەو هەموە زانستیە ئەیان ووت: سوپاس بۆ خوایەكێ ئەوتۆ ڕێزی ئێمەی داوە بەسەر زۆر كەس

لەبەندەو باوەڕدارەکانی خوای مەزن. مەبەست لەڕێز لێرەدا ڕێزی زانینێکە سوود بەخشێ ومەبەست لەزۆر کەس لە باوەڕداران کەسانێکن لەزانینا نەگەیشتبنە پلەی ئەوان لـەزانینا، ئەو ڕستانە ئاماژە ئەکەن بۆ ئەوەی کەلـەباوەڕدارانا کەسـانی واهـەن لـەداود و سـولـەیمان بەڕێزتر وگەورەترن، هەرچۆننێ بێ ڕێز لای خوای مەزن بەراورد بەزانین و ڕام کردنـی بـاو نزم کردنی ئاسن نابێ . بەڵکو بەراورد ئەکرێ بەسوود گەیاندن بەئادەمیزاد.

﴿ وَوَرِثَ سُلَيْمانُ داودَ ﴾ وە کاتێ داود کۆچی دوایی کرد سولـەیمان بوبـەمیرات گـری داوود لـەپێغەمەرایەتی و لـەپاشایەتیدا لـەناو هەژدە کوڕی داوودا بو بەجێگـە نشینی داوود. خوای مەز ننامەی زەبوری بۆ داوود ناردو دەنگێکی زۆر خۆشی پـێ بەخشـی و ئاسـنی بـۆ نەرم کرد، سولـەیمان دووهەمین پاشـایە دوای تـالوت بـۆ بـەنو ئیسـرائیلی، مێژوو ئـەڵێ: پاشایەتی سولـەیمان حەفتا ساڵ درێژەی کێشا ، دوای سـولـەیمان بەنوئیسـرائیلیەکان بـون بـە دووڕژێمـی دوژمنـی یـەکتری: ڕژێمـی ئیسـرائیل ، ڕژێمـی یـەهوزا، دوایـی بەختەنەسـر هەردووکیانی لـەناوبرد. جوەکـان ئـەڵێن زۆر بـەبێ شـەرمانە: داوود ژنـی هەڵئـەگرت و مێردەکانی ئەکوشتن، سولـەیمان پیاوێکی زۆردارو یاخی لـەخواو بەنارەوا دارایی بەکارئەهێنا.

﴿ وَقالَ يا أَيُّها النّاسُ عُلِمْنا مَنْطِقَ الطَّيْرِ وَ أُوتِينا مِـنْ كُـلِّ شَـيءٍ وَّ إِنَّ هـذا لَـهُوَ الْفَضْـلُ الْمُبِيْنُ ﴾ وە سولـەیمان ووتی: ئەی ئادەمیزاد :ئێمە لـەلایـەن خـوای مەزنـەوە فـێری زمـان و گفتوگۆکردنی باڵندەکان کراوین، ئێمە بەدەنگیانا ئـەزانین مەبەسـتیان چ شـتێکەو چ شـتێ بەیەکتری ئەڵێن و ، بەئێمە بەخشراوە لـەهەموو شتێ ئەوەی پێویستمان پێی هەبێ و بۆ ئێمـە چاکبێ لـەهەردوو جیهاندا لـە پێغەمەرایەتی و پاشـایەتی و ڕام کردنـی جنۆکـەکان و زانینـی گفتوگۆی باڵندەکان و زۆر شتی تریش. بەڕاستی بەخشینی ئەو شتانە بە ئێمە لـەلایەن خوای مەزنەوە ڕێزگرتنێکی زۆر ئاشکرایە وپەنهان نیەو شایستەی سوپاس کردنن.

﴿ وحُشِـرَ لِسُـلَيْمانَ جُنُـودُهُ مِـنَ الْجِـنِّ وَالْأِنْـسِ وَالْطَـيْرِ فَـهُمْ يُوزَعُـونَ ﴾ وە لـەلایــەن فەرماندەکانی سولـەیمانەوە کۆکرانەوە بۆ وسلیمان لـەشکرەکانی لـەهەندێ جنۆکەو ئادەمیزاد و باڵندە، دوایی ڕێگە لـەوان بەسترا کە بلاو ببنەوەو گێرەشێوێنی بکەن، هەریەکەیان لـەلایەن چاودێری کەرێ لـەخۆیان. یانـێ سـولـەیمان فـەرمانی دا بەفـەرماندەکانی خـۆی لـەهـەندێ جنۆکەو ئادەمیزاد و باڵندە لـەشکرەکەی خۆی بۆ کۆبکەنەوەو بەیەك پارچـە ڕیـز بدرێـن و بەڕێك وپێکی بڕۆن بەڕێگەدا، بۆ هەریەکە لـەو سێ تاقمە چاودێری کەرێکیان بۆ دانرا بـلاو نەبنەوەو پەیڕەو بپارێزن. بەوێنەی سەربازەکانی ئێسـتا، هـەروەها بـەڕێك و پێکـی ڕۆیشـتن بەنیشتمانی خۆیانا، بەدرێژایی فەلـەستین و خۆر هـەڵاتی ئـوردون و لوبنـان و سـوریەی لای ڕوباری فورات.

﴿ حَتّى إذا أَتَوا عَلى وادِ النَّمْلِ ﴾ هەروەها بەسواری و بەپیادەیی ڕۆیشتن هەتا کاتێ چون بەسەر زەوی (وادی نەملدا). زانایان بیریـان جیـاوازە لـەبارەی وادی نـەملدا: هـەندێکیان ئەڵێن: جێگەیەکە لـەنێوان (حەبرون وعەسقەلاندا لـەزەوی شامدا) هەندێ تریان لایـان وایـە لـەزەوی تایفدایە، هەرچۆنێ بێ گومان لـەڕاسـتی ئـەو ڕووادوەدا نیـە. کاتـێ گـەیشـتنە ئـەو جێگەیە سولـەیمان گوێی لـەدەنگی مێرولـەیە بوو لـەمێرولـەکانی وادی نەمل.

﴿ قـالَتْ نَمْلَـةٌ ياأيُّـها النَّمْلُ ادْخُلوا مَسـاكِنَكُمْ لا يَحْطِمَنَّكُـمْ سُـلَيْمانُ وَجُنُـودُهُ وَهُـمْ لا يَشْعُرُونَ ﴾ مێروو لـەیە ووتی بەمێرولـەکان: ئەی مێرولـەکان: ئێوە بچنە ناو جێگەکانی خۆتان وخۆتان دەرمەخەن، ئێوە ئەگەر بچنە ناو جێگەکانی خۆتان سولـەیمان و لـەشـکرەکەی ناتـان پلیشێنن، ئەگەر بتان پلیشێنێ هەستی پێ ناکەن.

﴿ فَتَبَسَّمَ ضاحِكاً مِنْ قَوْلِها ﴾ دوایی سولـەیمان بەخۆشیەوە پێ کـەنی لـەبـەر گفتوگـۆی ئەو مێردلـەیە، چونکە ئەو مێرولـەیە بڕوای بەدادپەروەری سولـەیمان هێناو بیانوشـی هێنایـەوە ئەگەر لـەشکرەکەی سولـەیمان بینا شێلن .ئەیزانی سولـەیمان دادپەروەرە.

﴿ وَقالَ رَبِّ أَوْزِعنِي أنْ أشكُر نِعْمَتكَ الَّتِي أنْعَمْتَ عَلَـيَّ وَعلـى والِـدَيَّ ﴾ وەسـولـەیمان ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ بخەرە دڵی من کەمن سوپاسی چاکەیەکی ئەوتۆی تۆ بکەم کەتۆ بەخشیوتە بەمن و بەباوکم و بەدایکم لـەموبەرو ڕژاندوتە بەسەرمانا.

﴿ وأنْ أعمَلَ صالِـحاً تَرْضاهُ ﴾ وەیارمەتیم بدەی کەمن کردەوەیەکی چـاکی وابکـەم تـۆ لـەو کردەوەیە ڕازی بی و پێت خۆشبێ.

﴿ وَأدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبادِكَ الصّالِحِيْنَ ﴾ وەتۆ بەهۆی ڕەزامەندی و میـهرەبانی تـۆوە من بخەیتە ناو ڕیزی پیاوچاکان لـەبەهەشتاو لێم ڕازی بی.

وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا

عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾

﴿ وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَالِي لاأرى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغائِبِيْنَ ﴾ وەسـولـەیمان چـوە دەرەوە لـەبەرئەوەی کاروباری لـەشکرەکە ببشکێنێ و هەواڵیان بزانێ و گەڕابەدوای پەپوسلـەمانەدا نەیبینی و فەرموی و پرسی: پەپو لـەچ جێگەیەکە من نای بینم؟ دوایـی باشـتر گـەڕا و هـەتا چاکتر بۆی دەرکەوێ دیارنیە، ووتی: بەڵکو پەپو لـەوانەیە دیارنین. بەڕاستی بێ فەرمانی منی کردوە، بەبێ ئەوەی من بزانم چوەتە دەرەوە، ڕقی جولاو هەڕەشەی سەختی لـەپەپولە کـردو فەرموی:

﴿ لأُعَذِبَنَّهُ عَذاباً شَدِيْداً أَوْ لأَذْبَحَنَّهُ ﴾ بەڕاستی مـن سـزایەکی زۆر سـەختی پـەپو ئـەدەم لـەسەر ئەوەی بێ فەرمانی کردوە بەڕنینەوەی توکەکەی یا بەندی ئەکەم یا بی بەشی ئەکـەم لـەڕیزی لـەشکرەکەم. یابەڕاستی من پەپو سەرئەبڕم بەگوێرەی چۆنیەتی گوناهەکەی؟

﴿ أَوْلَيَأتِيَنِي بِسُلْطان مُّبِيْن ﴾ یامن لـەپەپولـە خۆش ئـەبم کـاتی بەڵگەیـەکی ئاشـکرام بـۆ بهێنێ بەڵگەبێ لـەسەر ئەوەی خاوەنی بیانویەکی ڕاست ودڵخۆشکەر بێ .

﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيْدٍ فَقالَ أحطْتُ بِما لَمْ تُحطْ بِهِ ﴾ دوایی پەپو ماوەیەکی کەم بەردەوام بو لـەسەر ونبونەکەی و لـەماوەیەکی کەمدا هاتەوە بۆلای سولـەیمان ووتـی: توڕەمەبـە لـەمن و سزام مەدە، من وونبووم لـەبەر کارێکی گرنگ. دوایی من شتێکم زانیوە لـەکارەکانی جیـهان ومن باڵندەیەکی لاوازم، ئەو شتە تۆ هەرچـەندە پاشـای بـەهێزی نـەتزانیوەو پێغەمەریشـی و سروستت بۆ دێ .

﴿ وَجِئْتُكَ مِنْ سَبَأٍ بِنَبَإٍ يَقِيْنٍ ﴾ وەمن گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ لـەنیشتمانی هۆزی سـەبەئی یەمەن بەهەواڵێکی زۆر گەورەو ڕاست وبێگومان . سولـەیمان ووتی ئەو هەواڵە گەورەیـە چ تشێکە؟ پەپو ووتی:

﴿ إِنِّي وَجَدْتُ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وأُوتِيَتْ مِنْ كُلِّ شَيءٍ وَلَها عَرْشٌ عَظِيْمٌ ﴾ من فڕیم بۆلای باشووری وولاّت هەتا گەیشتمە نیشتمانی هۆزی سەبەء ژنێکم دەست کـەوت بوبـو بەپاشا وخاوەنی ئەوان کەناوی بەلقیسی کچی شەراحیلە، پاشایەکی زۆر گەورەیەو هەموو شتێکی لەهۆی هێزو چاکەی جۆراوجۆری نیشتمان و بۆخۆی پی بەخشراوەو ،ئە وپاشایە تـەختێکی زۆر گەورەی ڕازاوە بەهەموو جۆرێکی گەوهەری هەیەو زۆر بی وێنەیە.

﴿ وَجَدْتُها وَقَوْمُها يَسْجِدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ وەمـن ئـەو پاشـایە و تاقمەکـەیم دەست کەوت لـەسەر ئەو هەموە چاکەیە خوای مەزن بەوانی بەخشیوە سوژدە ئەبەن بۆ خۆر لـەجگەی خوای مەزن و ئاسمان و ئەستێرەکان ئەپەرستن.

﴿ وَزَيَّنَ لَهُمْ الْشَيْطانُ أعْمالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيْلِ فَهُمْ لايَهْتَدُونَ ﴾ وەشـەیتانەکان کردەوە خراپەکانی خۆیانی بۆ ڕازاندونەتەوە لـەبێ باوەڕی و پەرسـتنی خـۆرو ئاسمانـەکان ، ڕوی وەرگێڕاون لـەپەرستنی خوای مەزن و ڕێگـەی ڕاسـتی خـوا پەرسـتی، دوایـی ڕاغویـی وەرناگرن بۆلای پەرستن و باوەڕهێنان بەخوای مەزن ،چونکە سـوژدەی بـۆ نابـەن. شـەیتان وەری گێڕاون.

﴿ ألا يَسْجُدُوا للهِ الَّذِي يَخْرُجُ الْخَبأَ فِي السَّماواتِ وَالأرْضِ ﴾ لـەبەرئەوەی سوژدە نەبەن بۆ خوایەکی ئەوتۆ دەرئەهێنێ و ئاشکرا ئەکا لـەشتێ ئاسمانـەکان و زەویـدان لـەهـەمو چاکـە شاراوەکانی گەردون. بەهۆی بارانەوە، زانایان فێری ئەوە ئەکا زێڕو زیوو نەوت و شـتی تـر لـەزەوی دەربهێنن.

﴿ وَيَعْلَمُ ماتَخْفُونَ وَما تُعلِنُونَ اللهُ لا إلـهَ إلاّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ ﴾ وەخـوای مـەزن ئەزانی بەشتێ ئێوە ئەی شارنەوە لـەدەروونی خۆتاناو بەشتێ ئاشکرای ئەکەن لـەگفتوگۆی و کردارتان و ئەزانی بەشاراوەکانی ناو ئاسمانەکان و زەوی ، خوایەکی ئەوتۆیە هیچ خوایە نیـە شایستەی پەرستنبی مەگەر ئەو خوایە پەروەردگاری تەخت و توانای زۆر گەورەترە لـەتەختی بەلقیسی پاشای هۆزی سەبەءکەبەهیچ جۆرێ بەراوردی لـەگەڵ تـەختی بـەلقیس و جگـەی بەلقیس ناکرێ .

قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ

ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِيْنَ ﴾ کـاتی پـەپو ئـەو ڕوداوەی بەسولـەیمان ووت، باسی بەلقیسی کرد بەبی باوەڕیو پەرستنی خۆر، سولـەیمان بەپەپوی ووت: مـن بیر لـەوشتە ئەکەمەوە تۆ ئەیلێی وبزانم چۆنە وبۆم ڕون ببێتـەوە ئایـا تـۆ ڕاسـت ئەکـەی یـا تـۆ لـەوکەسانەی درۆ بکەن: ئەوکاتە فەرمان ئەدەم بەشتی دەرکەوت.

﴿ إِذْهَبْ بِكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهِ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴾ دوایـی تـۆ ئـەم نامەیەی من وەربگرەو برۆ بۆلای پاشاو هۆزی سەبەء ئەو نوسراوەلـەئاسمانەوە فڕەبدە بـۆلای بەلقیس لـەپاشا لـەوان دوور بکەوە بۆ جێگەیە ترو ئاگات لـەوانبێ، گوی لــەوان وەربگـرەو بزانە لـەسەر چ شتێ پێك دێن ودوایی تۆ بگەڕێوەو ئەو هەواڵـە ئەوانمان بـۆ بنێرەوە. کـاتی پەپو بەو نامەیەوە فڕی بۆلای نیشتمانی هۆزی سەبەء بەو جۆرەی سولـەیمان فەرمانی پێدابوو، نامەکەی فڕەدا بـۆلای بـەلقیس و فـەرماندااران و لەشـکر و پیـاو مـاقوڵان لـەلای بـوون، نامەکەی هەڵگرت و کردیەوەو خوێندیەوە بەسەریانان.

﴿ قَالَتْ يَاأَيُّهَا الْمَلأُ إِنِي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيْمٌ ﴾ بەلـقیس ووتی: ئەی پیاوان و دانیشتوانی بەڕێز: بەڕاستی من نامەیەکی زۆر بەڕێزم بۆ هاتوە بەڕێزترین گفتوگـۆو بـەرزترین مەبەسـتی تێدایە لـەلایەن پاشایەکی بەڕێزو زانا کەناوی سولـەیمانە، ئەمەیش ناوەڕۆکی ئەو نامەیەیە:

﴿ إِنَّهُ مِنْ سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ ﴾بەڕاستی ئەو نامەیە لـەلای سـولـەیمانەوە هاتوە ،بەڕاستی لـەو نامەیەدا نووسراوە: بەناوی خوای بەخشـنـدەی میـهرەبان، بـانگی ئێـوە ئەکەم بۆلای باوەڕهێنان بەخوای مەزن و پەیڕەوی من بکەن.

﴿ ألا تَعْلُوا عَلَيَّ وَائتُونِـي مُسْلِمِيْنَ ﴾ کـەئێوە خۆتـان بـەبالأتر دامـەنێن بەسـەر منـدا، گەورەیی نەتان گرێ و لـەرێگە ی ئایینی خوا لاتان بدا بەوێنــەی پاشـایانی تاوانبـار و، ئێـوە پێویستە بێن بۆلای من و باوەڕ بهێنن وپەیڕەوی من بکەن و سەرشۆڕی فەرمانی بـن. لـەپاشـا بەلقیس گرنگی دا بەو ڕوداوەو بیری کردەوە چ شتی بکا.

﴿ قالَتْ یاأیُها الْمَلأُ أفتوني أمْـرِي ﴾ بـەلقیس ووتـی: ئـەی پیـاوانی بـەرێزی نیشـتمان: پێویستە ئێوە بیر بکەنەوەو بۆ منی ڕون بکەنەوە ئەم کارە گەورەو گرنگە ڕوی کراوەتە مـن و من راوێژتان پێ ئەکەم و بەبیرو بۆچونی ئێوە ئەڕۆم بەرێگەدا ووتی:

﴿ ماکُنْتُ قاطِعَةَ أمْراً حَتّى تَشْهَدُونَ ﴾ من هیچ فـەرمانێکم جـی بـەجی نـەکردوەو هیـچ کارێکم بەبی ئێوە بڕیارم بۆ نەدراوە هەتا ئێوە ئامادەی لای من نــەبون. ئـەو کاتـە مـن ئـەو کارەم کردوە. بەلقیس بەو گفتوگۆیەی خۆی ویستی مەیلی ئەو ان بۆلای خـۆی ڕابکێشـی هەتا لـەژێر پەیڕەوکردنی ئەو دەرنەچن، بەجۆری بۆ ڕێــزی ئـەوانی بـۆ جـی بـەجی کردنـی کاروباری نیشتمان دانابوو.

﴿ قالُوا نَحْنُ اُولُوا قُوَةٍ وَ اُولُوا بأسٍ شَدِیْدٍ وَّ الأَمْـرُ إلَیْـكِ فَـأنْظُرِي مـاذا تـأمُرِیْنَ ﴾ پیـاوە بەرێزەکان ووتیان: ئەی پاشا تۆ لـەهیچ شتی مەترسە ئێمە تاقمێکین خاوەن شمشێرو ڕم و زرێ و ئامێری زۆری جەنگین و ئازاییمان تێدایە، ئامادەکراوین بۆ جەنگ کردن ولـەشمان خـاوەنی هێزە ، تاقی کراوینەتەوە لـەجەنگدا، ئامادەباشی تەواومان تێدایە بۆ جەنگ کردن وئامادەین بۆ هەلـمەتدانو پالـەوانیەتی، ئێمە لـەگرەوی ئاماژەی تۆداین وپەیڕەوی فـەرمانی تـۆ ئەکـەین، بەڕاستی هەموکارێ ئەگێڕینەوە بۆلای فەرمانی خـۆت، دوایـی تەماشـا بکـەو بـیر بکـەرەوە فەرمان بەچ شتی ئەدەی ئێمە لـەخزمەت تۆداین و لـەخزمەت پەیرەوی تۆداین.

بەلقیس هەستی کرد تاقمەکەی مەیلیان بۆلای جەنگ کردن هەیە، خۆی ژیر بوو بـیری لـەدوا ڕۆژ ئەکردەوە، بەلقیس ویستی لـەو مەیلـە لایانبدا بەجۆری ئاشـکرایی تێـدا نـەبی بـۆ جەنگ نەکردن و ئەیزانی بەخراپی جەنگ کردن.

﴿ قالَتْ إنَّ الْمُلُوكَ إذا دَخَلُوا قَرِیَةً أفْسَدوها وَجَعَلُوا أعِزةَ أهْلِها أذِلَةً وَکذلِـكَ یَفْعَلُـونَ ﴾ بەلقیس بەتاقمەکەی خۆی ووت: بەڕاستی ڕەوشتی پاشایان وایە بەجەنگەوە هەرکاتی چونـە گوندی یا شارێ کاولیان ئەکەن، ئاوەدانی و کۆشك و سەوزای و داراییــان لـەناو ئەبـەن، گەورە پیاوانی ئەو گوندە سەرشۆڕ و لاواز ئەکـەن و ئـەیان گـێڕن بەبـەندەو ئـەیان کـوژن ولـەنیشتمانی خۆیان دەریان ئەکەن و هەربەوجۆرە پاشایان ئەو کارە ئەکەن و ڕەوشتی خۆیان ناگۆڕن، هەروەها وامان بیستوە لـەباو باپیرمانەوە کەئەو کەسسانەی پاشاو فـەرمان ڕەوابـون لـەکۆنەوە ئەو کارانەیان کردوە.

﴿ وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِمْ بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴾ وەبەڕاستی من نیازم وایە ڕەوانە بکەم بۆلای سولـەیمان و تاقمەکەی بەنوێنەری خۆما دیارێکی زۆر بـەنرخ و گـەورە، دوایـی ئێمە تەماشا ئەکەین بزانین ئەو نوێنەرانەی من لای ئەوانەوە چۆن دێنەوە بۆلای مـن، ئەگـەر سولـەیمان پاشا بێ دیاریەکە وەرئەگری و بەو دیاریە ڕازی ئەبی و وازمان لێ دێنـی و ئەگـەر پێغەمەر بێ وەری ناگری بەجگەی باوەڕهێنان ڕازی نابێ .

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾

﴿ فَلَمَّا جاءَ سُلَيْمانَ قالَ أَتُمِدُّونَنِي بِمالٍ ﴾ دوایی کاتی نوێنەرانی بەلقیس چـوون بـۆلای سولـەیمان بەدیاریەکەیانەوە سولـەیمان بەڕویەکی کراوەوگەشەوە تەماشای نوێنەرەکانی کـرد، کاتی نوێنەرەکان تەماشـایان کـرد سـولـەیمان پاشـایەکی زۆر گەورەیـە وزۆر بەدەسـتەڵاتە، کۆشك و لـەشکری وای هەیە لـەمەئـەرەبی پایتـەختی هـۆزی سـەبەئدا وێنـەیان نیـە، کاتـێ بەخزمەت سولـەیمان گەیشتن دیاریەکەیان پێشکەش بەسولـەیمان کـرد، سـولـەیمان زۆری پـی ناخۆش بوو، چونکە ئەو نامەی بۆ بەلـقیس ناردبو خۆی بێت بۆلای. نەك دیاری بۆ بنـێری و ووتی: ئێوە ئەتانەوی بە دارایی یارمەتی من بدەن، ئێوە تەماشای سـامان و پلـەو پایـەی مـن بکەن، ئایا ئێوە گومان ئەبەن من داوای دیاریم لـەئێوە کردوە؟ .

﴿ فما آتانِي اللهُ خَـيْرٌ مِمّـا آتـاكُمْ بَـلْ أَنْتُـمْ بِـهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُـونَ ﴾ دوایـی خـوای مـەزن بەخشیویە بەمن شتی چاکترە لـەوشتەی ئێوە هێناوتانە بۆ من. خوای مەزن سامانێکی فراوانـی بەمن خشیوە و گەورەترە لـەوەی ئێوە هەتانەو من زۆر بەهێزترم لـەئێوە، خـوای مەزنجنۆکـەو ئادەمیزاد و باو باڵندەی بۆمن ڕام کردوە هـەموویان لـەخزمـەتی منـدان، لـەهۆی خۆشـی و ڕابواردن شتێکی وای داومەتێ بەکەسی تری نەداوە، من چاوەڕوانی ئەوە ناکـەم دیـاریم بـۆ بنێرن وداوای باوەڕهێنانتان بەخوا لێ ئەکەم، بەڵکو ئێوە بـەو دیاریـەی خۆتـان دڵخۆشـن و دڵتان بەجوانی جیهان ئەکرێتەوە. لـەپاشـا دیاریەکـەی وەرنـەگرت و نوێنـەرەکانی نـاردەوە بۆلای بەلـقیس ، هەرچەندە دیاری هۆی خۆشەویستیە و پێغەمەری خۆیشمان وەری گرتـوە، بەلاّم سولـەیمان وەری نەگرت ،چونکە بەلقیس بەنیازی خۆشەویستی نەیناردبوو ، ویسـتبوی سولـەیمان تاقی بکاتەوە ئایا پاشایە یا پێغەمەرە؟

﴿ ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَهُمْ بِجُنُودٍ لاَ قِبَلَ لَهُمْ بِها وَلَنُخْرِجَنَّـهُمْ مِنْـها أَذِلَـةً وَهُـمْ صـاغِرُونَ ﴾ سولـەیمان بە لێپرسراوی نوێنــەرەکانی ووت: تـۆ بگـەڕێرەوە بـۆلای بـەلقیس و تاقمەکـەی بەدیاریەکەیانەوە ،ئەوەی ئەی بینی لـەهێزو توانای من بۆ ئەوانی بگـێرەوە بـەوان بڵـێ: مـن بەتەمای دارایی نیم، من ئەمەوی ئەوان بـاوەڕ بـەخوای مـەز نـبهێنن ، ئەگـەر بـاوەڕ بـهێنن ڕزگاریان ئەبێ لـەهەردوو جیهاندا ئەگەر ئەوان بەردەوام بن لـەسەر بێ باوەڕی، دوایی ئێمـە بەلـەشکرێکی واوەدێـین بۆلایـان توانـای بـەرگریان نـەبی و خۆیـان نـەگرن لـەبـەردەمیاناو، بەڕاستی ئێمە ئەوان دەرئەکەین لـەزەوی نیشتمانی خۆیانان بەسەر شۆرشی و لاوازی و ئەوان بی نرخ ئەبن، دوایی نوێنەرەکان چونەوە و ئەوەی بینیان وبیستیان بۆیانی گێڕایـەوەو ووتـی: بەڕاستی سولـەیمان پێغەمەرە و ئێمە توانای جەنگمان نیە لـەگەڵ پێغەمــەران. بـەلقیس نیـازی وەلاّمدانەوەی سولـەیمانی کرد، خـۆی و پیـاوە گـەورەکانی تاقمەکـەی ڕویـا نکـرد بـۆلای سولـەیمان و باوەڕ بەخوای مەز نبهێنن و پەیڕەوی سولـەیمان بکــەن ، بەرلـەوەی بگەنـە لای سولـەیمان ویستی هەندێ کاری پەکخەری تایبەتی نیشان بدا بەوان ، بۆیە سولـەیمان:

﴿ قَالَ ياأَيُّها الْمَلأُ أيكم يَأْتِينِي بَعَرْشِها قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْـلِمِيْنَ ﴾ فـەرموی بەوانـەی لـەدەوری بون: چ کەسی لـەئێوە ئـەو تـەخت وکورسـیەی بـەلقیس ئـەهێنی بـۆلای مـن بەرلـەوەی ئـەو و تاقمەکەی بێن بۆلای ئێمەو باوەڕ بهێن و پەیڕەوی ئێمە بکەن، لـەبەرئەوەی توانای خوایەکی ئەوتۆ ببینن من داوایان لێ ئەکەم بۆلای پەرستنی، ئەو کورسیەی بەلقیس دانرابو لـەهۆدەیەکی زۆر قایم و قوفڵ درابوو لـەدەرگاکەی .

﴿ قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أنا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقامِكَ وَإِنـي عَلَيْـهِ لَقَـوِيُّ أَمِيْـنٌ ﴾ دێوێکی زەبەلاّحی بی باوەڕ و بەهێزی ئەوان ووتی: من ئەو تەختەی بەلقیس ئـەهێنم بـۆلای تۆ بەر لـەوەی تۆ لـەوجێگەیەی خۆت هەڵسی و بەڕاستی من لـەسەر هـەڵگرتنی ئـەو تەختـە دەست پاکم و گەوهەرو لوءلوءو شتە بەنرخەکانی ئەپارێزم ، سولـەیمان فەرموی: من ئەمەوێ ئەو کورسیە بهێنرێ بۆئەو مەبەستە.

﴿ قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنْ الْكِتابِ أنا آتِيَكَ بِهِ قَبْلَ أنْ يَرْتَـدَّ إلَيْـكَ طَرْفُـكَ ﴾ کەسێکی ئەوتۆ زانین ومەبەستی نامە ئاسمانییەکانی لابو ووتی: من ئەو تەختەی بەلقیس ئـەهێنم بـۆلای تۆ بەر لـەوەی چاوی خۆت وەرگێڕی بۆلای خۆت یانی لەچرکەیەکا یا لـەچەند چرکەیـەکا، سولـەیمان فەرموی:بیهێنە و دوایی ئەویش هێنای.

زانایان بیریان جیاوازە لـەدیاری کردنی ئەوز کەسەدا، ئایا جبرەئیل بوە یا فریشتە یە تر یـا ئاسەفی کوڕی بەرخیا، هەندی لـەزانایان ئەڵێن : ئەو کەسە سولـەیمان خۆی بوەو بـەکارێکی پەخەری خۆی هێناویەتی و هەر چۆنی بی بەهۆی کەسـێکەوە ئـەو تەختـە لـەچاو نوقـان و کردنەوەیدا هێناوە. هەموو شتی هەرخوا ئەیزانی .

﴿فَلَّما رَآهُ مُسْتَقِراً عِنْدَهُ قال هذا مِنْ فَضْلِ رَبّي لِيَبْلُوني أاشْكُرُ أمْ أكْفـر ﴾ دوایـی کـاتی سولـەیمان ئەو تەختەی بەلقیسی بینی دانراوە لـەلایا، سولـەیمان ووتی: ئەو یـاریدان و ڕێـزەی من ڕێزی پەروەردگاری منە، لـەبەرئەوەی من تاقی بکاتەوەو نیشانی دانیشتوانی بدا ئایـا مـن سوپاسی خوای مەزن ئەکەم یا سوپاسی ئەو ناکەم. بەڕاستی من سوپاسی چاکـەکانی خـوای مەزن ئەکەم بەسەر منەوە.

﴿ وَمَنْ شَكَرَ فَإنَمّا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَر فَإنَّ رَبّي غَفُورٌ كَرِيمٌ ﴾ وەهەرکەسی سوپاسـی خوای مەزنی کردبێ ، دوایی بەڕاستی سوپاسی بۆخۆی کردوەو سودەکەی هەر بۆ خۆیـەتی وئەبێتە هۆی چاکەی زۆرتر بۆی و خوای مـەزن چاکـەی تـری بـۆ زۆر ئـەکا، هەرکەسـی سوپاسی خوای مەزن نەکا، دوایی خوای مەز نیێویستی بەکەس نیە ،سەخی و گەورەیە چاکە ئەبەخشێ بەهەرکەسی ئارەزووی هەبێ .

قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِيٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِي ٱلصَّرْحَۖ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن

سَاقَيْهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾

﴿ قْالَ نَكَرُوا لها عَرْشَها نَنْظُر أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونَ مِنَ الَّذِينَ لايَهْتَدُونَ ﴾ سولەیمان فـەرموی بەهەندی لەپیاوانی بەردەستی خۆی: ئێـوە هـەندی لەشێوەی تەختەکـەی بـەلقیس بگۆڕن وهەندێ ڕووالّەتی داپۆشن ، ئێمە تەماشـا ئەکـەین ئایـا بەلقیسڕاغویی وەرئـەگری بـۆلای ناسینەوەی تەخت و کورسی نیشتمانەکەیخۆی یا بەلقیس لەو کەسانەی ئەوتۆیـە ڕانومـای وەرناگرن بۆلای ناسینەوەی کورسیەکەی خۆی .

﴿ فَلَّما جاءَتْ قِيْلَ أهكذا عَرْشِكَ قْالَتْ كَأَنَهُ هُوَ ﴾ دوایـی کـاتی بـەلقیس چـوو بـۆلای سولەیمان و تەختەکەی بەسەر ڕانوێنرا و لەلایا وەستا وسەرگەردان بوو هـاتوچۆی ئـەکرد، شێوازی تەختەکە لەوە ئەچوو ئەوەی خۆییێ، بەبەلقیس بێژرا: تەماشای چ شتیئەکەی، ئایـا ئەم تەختە وێنەی تەختەکەی تۆیە؟ ووتی: وەك ئەوە وایە ئەوەی من بێ، دوو رنیە ئەویشبێ.

﴿ وَأُوتِينا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِها وَكُنّا مُسْلِمِيْنَ ﴾ بەلقیس ووتـی: بەڕاستی سـولـەیمان بەلّگـەی بێگومانی بەرپاکرد لەسەر پێغەمەرایەتی خۆی، وەئێمە زانیاریمان پی بەخشرابوو لـەپێش ئـەو بەلّگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمەرایەتی سـولـەیمان وئێستا باوەڕمـان هێنـا بەپەیامەکـەی وئێمـە فەرمانبەردار و مل کەچی فەرمانی ئەوین هـەندی لـەزانایان ئـەلێن ئـەو ڕسـتانە فـەرمودەی سولـەیمانن.

﴿ وَصَدَّها ماكانَتْ تَعْبُدُ مِنْ دُونِ اللهِ إِنَـها كـانَتْ مِـنْ قَـوْمٍ كـافِرِيْنَ ﴾ وەرێگـەی گرتبـو لـەبەلقیس شتێ ئەپەرستێ لەجگەی خوای مەزن کەرێگەی خوا پەرستی بدۆزێتـەوەو بـاوەڕ بەیەکێتی خوای هەبێ ، چونکە بەڕاستی بەلقیس لەناو تاقمێکی بـێ بـاوەڕدا پـێ گەیشتبوو کەخۆریان ئەپەرست .

سـولـەیمان بەرلـەوەی بـەلقیس بگاتــە لای فــەرمانی دا بەئــەندازیارە پسـپۆرەکان و بەجنۆکەکان کۆشکێکی نایاب و بەرزی بۆ دروست کەن، بەردەمی ئەو کۆشـکە شوشـەی پاك وڕێك ولوسبێ، بەجۆری بێئاو لـەژێر شوشــەکەوە بـڕواو ماسـی بـلاّو بکەنـەوە بـەناو ئاوەکەدا، کاتی بەلقیس هات.

﴿ قِيْلَ لَها ادخِلِي الصَّرْحَ فَلما رأَتْهُ حسبته لِجَةّ وَكشف عَنْ ساقِيْها ﴾ بێـژرا بەبـەلقیس : تۆ برۆ بۆناو ئەو کۆشکە هەتا بەخزمەت سولەیمان بگەی، دوایی کاتێ چوە نـاو کۆشـکەوە

ترسا وسەری سوڕما و وای زانی تەختی سولـەیمان بەسەرئاوۆ دانراوە، چاوی کەوت بەکۆڕو کۆمەڵێکی زۆر لـەبونەوەرانی جیـاواز لـەیـەکرتی، پۆشـاکەکەی خـۆی بـەرزرکردەوە هـەتا تەرنەبی. دوایی کاتێ نـاوەوەی کۆشـکەکەی بینـی وای زانـی ئـاوێکی زۆر گـەورەو قوڵـە هەردوو قاچی خۆی دەرخست .

﴿ قَالَ إِنَّهُ صَرحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ القَوارِيْر ﴾ سولـەیمان بەبەلقیسی فەرمو: تـۆ مەترسـەو خـۆت هەڵمەکە ئەو ئاونیە، ئەوە کۆشکێکە ناوەوەی دروست کراوە لـەشوشەیەکی پاك و لوس ئاو لـەژێرەو ەئەڕوا.

﴿ قَالَتْ رَبِّي إِنِي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمانَ للهِ رَبِّ العالَمِيْنَ ﴾ بەلقیس هەسـتی بەپەشیمانەوە کرد لـە سەرکاری پێشوی خۆی ووتی: ئەی پەروەردگاری من : بەڕاستی من ستەمم لـەخۆم کردوە کەخۆرم پەرستوەو من ئێستا لـەگـەڵ ئـایینی سـولـەیمانام مـل کـەچ و سەرشۆڕی فەرمودەی خوایەکم پەروەردگاری بونەورانە.

بۆ زانین : دوای باوەڕهێنانی بەلـقیس باسی دوارۆژی نەکراوە نەلـەنامەی خوای مەزندا و نەلـە فـەرمودەی پێغەمـەردا ﴿ﷺ﴾، زانایـان ئـەڵێن: ئـەو دەنـگ وباسـەی ئەگێڕرێتـەوە کەسولـەیمان پیلانێکی پێك هێناوە بۆئەوەی تەماشای قاچی ڕووتی بەلقیس بکـا ڕاسـت نیـە، چونکە بەلقیس بێگانەبوە وشایانی سولـەیمان نیە، هەروەها بیریان جیاوازە: ئایا بەلـقیس شـوی کردوە یان نە، هەندێکیان ئەڵێن: سولـەیمان مارەی کردوە کوڕێکـی لێ پـەیدا بـوە، هـەندێ تریان ئەڵێن: سولـەیمان مارەی کردوە لـەزیتوبەعی پاشای هەمدان.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا

مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنا إلى ثَمُودَ أخاهُمْ صالِحاً أنْ اعْبُدُوا اللهَ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان کـرد بـۆلای هۆزی سەمود سالّحی برای ڕەگەزی خۆیان، لـەبەرئەوەی خوای مەزن بپەرستن و واز لـەبت پەرستی بتەکان بهێنن .

﴿ فَإذا هُمْ فَرِيْقانِ يَخْتَصِمُونَ ﴾ دوایی کوتوپـڕ ئـەو هـۆزە بـوون بـەدوو تـاقم دژایـەتی یەکتریان ئەکرد: تاقمێکیان باوەڕیان هێناو ووتیان: ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە نـێرراوە بـۆلای سالّح، تاقمێ تر ووتیان: ئێمە باوەڕمان بەوە نیە .

﴿ قالَ ياقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ لَوْلا تَسْتَغْفِرُونَ اللهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ سالّح بە دڵسۆزی و لـەسەرخۆ ووتی: ئەی تاقمی مـن: ئێـوە لـەبـەر چ شتێ داوای بەپەلـە هاتنی سزا ئەکەن کەهات پەشیمان بونەوە سوودی نیە بەرلـە هـاتنی چاکەیـە ئەنجامەکـەی ڕزگاری و بێ وەییە، بۆ ئێوە داوای لێ خۆشبوون لەخوای مەزن ناکەن، بۆئەوەی بـەزەییتان بۆ بەکاربهێنرێ وسزاتان نەدرێ، دوای تاقمەکەی سالّح ووتیان: تۆ هەڕەشەمان لێ ئەکـەی، ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی ئەو سزایەی تۆ بابێت بۆلامان.

دوای ئەوەی بەردەوام بون لـەسەر بی باوەڕی گرانێکی زۆر سەختیان تووشبو کەم ئـاوی پەیدا بو تووشی سزای سەخت بون لـەلایەن خوای مەزنەوە ووتیان: بەڕاسـتی ڕەوانـەکردنی تۆ نەگبەتی دا بەسەر ئێمەدا.

﴿ قالُوا أطيرْيا بِكَ وَبِمَنْ مَعَكَ ﴾ تاقمەکـەی سـالّح یەسـالّحیانووت: ئێمـە ئەو ئـازارو گرانی دوژمنایەتی نێوان خۆمان ئەدەینە پاڵ نەگبەتی و بەدفەڕی تۆو تاقمەکەی تۆ ، بە بۆنەی خراپی ئێوەوە ئێمە تووشی خراپی بووین.

﴿ قَالَ طائِرُكُمْ عِنْدَ اللهِ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴾ سالّح فەرموی: هیچ شتێ خـۆی لـەخۆیا بەدفەڕی نادرێتە پاڵ بەڵام شتی وا هەیە ئەبێتە هۆی خراپی و نەگبەتی، چاك و خـراپ تـاقی کردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی خۆی، بەڵکو ئێوە تاقمێکن تاقی ئەوکرێنەوە وسزاتان ئەدری بەهۆی گوناهی خۆتانەوە، نەك بەبۆنەی نەگبەتی شتێ ترەوە .

بۆ زانین: ئێویستە ئاماژە بکەین بۆلای بێ ئەقڵی و لادان لـەئایین، هـەندی لـە ئـادەمیزاد خراپی و بەدفەڕی ئەدەنە پاڵ هەندی ژمارە یا مرۆڤـی یـا ئـامێری، گومانیـان وایـە هـەرکاتێ تووشی کەسێکی ناسراو ببن تووشی خراپەیە ئەبن. یاقەلـەڕەش یا فلان باڵندە خوێنـدی نابێ بچین بەلای کارێکی خۆمانەوە، ئەگەر بچن تووشی خراپەیە ئەبن، ئەو شتانە بەگوێرەی ئایین ڕاست نین .

﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهطٍ يُفسِدُونَ فِي الأَرْضِ وَلايَصْلحُونَ ﴾ وەلـەناو حیجـری شاری سەمودا نۆ تاقم هەبون هەریەکەیان لێ پرسراوێکیان هـەبو خراپـەیان بـڵاو ئـەکردەوە لـەناو زەویدا و هانی ئادەمیزادیان ئەدا لـەسـەر خراپـە وهیـچ جـۆرە چاکەیـەکیان لێ پـەیدا نەئەبو، بەڵکو پیشەی گەورەو بچوکیان خراپەی ڕووت بو.

بەو کارە خراپەی خۆیانەوە نەئەوەستان . بـەڵکو پـەیمانیان ئـەدا لـەسەر کردنـی کـاری خراپ و ڕایان ئەسپارد لـەسەر کردنی دوای مردنی خۆیشیان ، بۆ نمونە کۆبونـەوە بـۆ پێـك هاتنی پیلانێ کە سالّح و تاقمەکەی لـەناو ببەن.

﴿ قَالُوا تَقاسَمُوا بِاللهِ لنبيتنهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِهِ مانَشْهدنا مَهْلَكَ أَهْلهِ وَإِنـا لَصـادِقُونَ ﴾ هەندێکیان بەهەندی تریان ووت: ئێوە هـەموتان کۆببنـەوە و سـوێند بـەخوای مـەزن بخۆن بۆیەکتری کەسالّح و خێزانەکەی لـەناویان ببەن لـەشەودا،لـەپاشا ئەگەر تـاقمی سـالّح هـاتن وئەیانویست تۆڵـە بکەنەوە بەڕاستی ئەو کاتە ئێوە بەخاوەن خوێنەکەی بڵێن: ئێمـە ئامـادەی کوشتنیان نەبووین نەهی خۆیی و نەخێزانی و، بەڕاستی سوێندبخۆن کەئێمـە ڕاسـت ئەکـەین ئامادەی کوشتنیان نەبووین .

﴿ وَمَكَرُوا مَكْراً وَمَكَرْنا مَكْراً وَهُمْ لايَشْعِرُونَ ﴾ وەتاقمی سالّح پیلانیان پێـك هێنـا بـۆ کوشتنی سالّح زۆر بەفێڵاوی، بەوێنەی پیلانی قورەیشیەکان بـۆ کوشـتنی موحەمـەد ﴿ﷺ﴾. بەڵام خوای مـەزن ئاگـای لـەپیلانی ئەوانـە فـەرموی: ئێمـە پیلانێکـی زۆر گـەورەمان بـۆ لـەناوبردنی ئەوان سـاختە هێنـا بەرلـەکاتی بـەکارهێنانی پیلانـی ئـەوان، دوایـی سـزاماندان بەڕژاندنی بەردی سۆرکراوەو ڕەق و ئەوان هەستیان بەلـەناوبردنی خۆیان نەئەکرد.

﴿ فَانْظُرْ كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أنا دَمَرْناهُمْ وَقَوْمِهِمْ أَجْمَعِيْنَ ﴾ دوایی تۆ تەماشا بکەو بیر بکەرەوە بەچ جۆرێ بۆ کۆتایی پیلانی خراپی ئەوان وئەنجامەکەی بەڕاستی ئێمە ئـەوان و تاقمەکەی ئەوانمان لـەناوبرد هەمویان ویەك کەسیان ڕزگاریان نەبوو.

﴿ فتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خاوِيَةً بِما ظَلَمُوا إِنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئائـەوە خانوەکانیانە ڕوخاون ودارو پەردویان کەوتوون بەسەریەکا بەهۆی ستەم وبێ باوەڕیانـەوە، بەڕاستی لـەتۆڵـە کردنەوەی بی باوەڕان و پیلانیان و ئامۆژگاری کردن و نیشانەی گرنگە بـۆ تاقمی ئامۆژگاری وەرگرن و بزانن بەتواناى ئێمە .

﴿ وَأَنْجَيْنا الذيْنَ أمَنُوا وَكانُوا يَتَقُونَ ﴾ وەئێمە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو لە سالح و باوەڕداران ڕزگارمان لە پیلانی بێ باوەڕان ئەوان تاقمێ بوون خۆیانیـان ئەپاراست لـەبێ فەرمانی خوای مەزن .

وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ ۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾

﴿ وَلُوطاً إِذْ قالَ لِقَوْمِهِ أَتَأتُونَ الْفاحِشَةَ وَأَنْتُم تُبْصِرُونَ ﴾ وەتۆ باسی لـوت بکـە و بـیری بکەرەوە کاتی ئێمە ئەومان ڕەوانە کرد بۆلای تاقمەکەی خۆی وبەوانی ووت: ئایا ئێـوە بـۆ ئەو کارە زۆر بێز لێ کراوەو ناپەسەندە لـەئەوپەڕی خراپی و بێ ناموسیە ئەیکەن، ئێوە ئەزانن زۆر خراپەو ناڕەوایەو ئێوە ئەیکەن بە ئاگاداری ئادەمیزاد وئێوە ئەو کارە ناڕەوایە بـەچاوی خۆتان ئەی بینن.

﴿ أَئنَكُمْ لَتَأتُونَ الرِّجالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِسّاءِ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾ ئایا ئێوە بـۆ ئەچنـە لای پیاوان لـەپشتەوە لـەبەر ئارەزۆوی نارەواو ناپەسەندی خۆتان لـەجگەی ژنـان بـەو پاکیـە هەیانە بەکوێرەی سروشت . پیاوان بۆ ئەو کارە بێز لێ کراوە دروسـت نـەکراون، بەڕاسـتی ئێوە تاقمێکن نەزانن ولەڕێگەی ڕاست لاتان داوە .

کاتی لوت تاقمەکەی خۆی ترساند لەسەر کردنی کاری نارەوا ولادان لـەکاری رەوا لەگەڵ ژنان بەپاکی. کەژنان سەرچاوەی زاوزێ وزۆربوونی ئادەمیزادن وئاوەدان کردنەوەی ماڵەکانە، لەژنان لائەدەن بۆلای پیاوان کەپیاوان بەگوێرەی دروست بوونیان بـۆ ئـەو کـارە خراپە دروست نەکراون، ئەو تاقمە داوێن پیسانە کەبەڵگەیان دەست نەکەوت خۆیـان لـەو کارە خراپە دوور ئەخەنەوە بەووتوێژ ، پەنایان برد بۆلای زۆر و ئازاردان و هەڕەشە کـردن لەلوت .

﴿ فَما كانَ جوابُ قَوْمِهِ إلا أنْ قالُوا أخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إنَهُمْ أناسٌ يَتَطَـهَّرُونَ ﴾ دوایی ئەو تاقمە هیچ وەڵامێکیان بۆ نەمایەوەو ڕووبەڕوی لوت بوەستن مەگەر ئەو تاقمـە ی لوت ووتیان بەیەکتری : ئێوە لوت و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لـەخۆی و زاعـوراو ریسـای هـەردوو کچە کـە دەریـان بکـەن لـەسـەدومی گونـدی خۆتـان چونکـە بەڕاستی ئـەوان ئادەمیزادێکن خۆیان لەم کارەی ئێمە دوور ئەخەنەوە و خۆیـان لـەچونـە لای پیـاوان بـەپاك ئەگرن .

﴿ فَأنْجَيْناهُ وَأهْلِهِ إلاَ إمْرَأتُـهُ قَدَّرْناهـا مِـن الْغـابِرِيْنَ ﴾ دوایـی ئێمـەلوت وخێزانەکـەیمان ڕزگارکرد لـە خراپـەی ئـەو تاقمـە داوێـن پیسـەو فـەرمانمان پێدان شـەوێ لـەوگوندەی دانیشـتوانی سـتەمکار بـوون دەرچـن چونکـە سـەرلەبەیانی سـزا ئـەڕژێ بەسـەریانا جگـە لەژنەکەی لوت دیاریمان کردبوو بڕیارمان دابو بمێنێتەوە لـەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەدا ماونەتـەوە لەگوندەکە یاناو سزای بدرێ ، چونکە بێ باوەڕ بوون.

﴿ وَأمْطَرْنا عَلَيْهِمْ مَطراً فَساءَ مَطَرُ الْمُنْذِرِيْنَ ﴾ وەئێمە ڕژانمان بەسەر تاقمە بێ باوەڕەکەی لوت بارانێکی زۆر سەخت بەبەردو ئاگرەوە ، دوایی بارانی ئـەو کەسـانەی ترسـێنراو بـون بەسزای خراپ و لەناو بەری ئەو تاقمە بێ باوەڕە بو لەناوی بردن و بوون بەخۆڵەمێش .

**بەیاریدەی خوا کۆتای بەمانای جزمی نۆزدەهەم هات لەڕۆژی هەینی**
**ڕێکەوتی ( ٨ ) ی مانگی سەفەری ساڵی ( ١٤٢١ ) ی کۆچی**
**بەرانبەر ١٢/٥/ ٢٠٠٠ زایینی**

# ﴿ پێرست ﴾

خوێنەری هێژا لەم بەرگەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| مەوسبەعە | مەوسوعە | ٧ | ٢٣ |
| وەربکرێن | وەربکرین | ١٠ | ٢ |
| (یعلمون) | یعملون | ١٤ | ٦ |
| (والأرش) | (والأرض) | ١٦ | ٨ |
| (رتتا فقناهما) | رتقا فنتقمناهما | ١٦ | ٨ |
| (أن غميد) | أن تميد | ١٧ | ٣ |
| محفوضا | محفوظا | ١٧ | ١١ |
| نەخۆشی | خۆشی | ١٧ | ١٩ |
| بە پەلە | پەلەلە | ٢٠ | ٥ |
| وجههم | وجوههم | ٢٠ | ١٧ |
| وكفي نيا | وكفى بنا | ٢٣ | ١٧ |
| شێ | شتێ | ٢٤ | ٣ |
| پەیلەر | پەیکەرە | ٢٥ | ١٠ |
| لەوانە نیە | لەوانەیە | ٢٦ | ٢٠ |
| من الضالين | من الصالحين | ٣٠ | ٢١ |
| وأدخلنا | وأدخلماه | ٣ | ٢٥ |
| بەلای شتێ | بەشتێ لای | ٤٧ | ٩ |
| بێ ٧ ێ | بێ ئەوەی | ٤٩ | ١٢ |
| تابلۆی | تابۆی | ٤٩ | ١٤ |
| ئەداتەوە | ئەداتە | ٥١ | ٤ |
| چاکتر | چاکترە | ٥٢ | ٩ |
| ضر | خر | ٥٣ | ١ |
| چاکە | چاکەی | ٦٩ | ١١ |
| أملمين | أمليت | ٧٠ | ١٣ |
| باوەڕیان | باوەڕیان نەهێناوە | ٧٠ | ١٥ |
| والذين | الذين | ٧٢ | ٢٤ |
| عەرانیف | عەرانین | ٧٤ | ٢١ |
| خوای | خوا | ٧٧ | ٤ |
| لە خشتەی | لەخشەی | ٧٧ | ٢٠ |
| خوا | خوایە | ٧٨ | ٧ |
| مەز | مەزن | ٧٩ | ١٣ |
| بەرتا | بەرتانا | ٧٩ | ١٧ |
| أيهديهم | أيديهم | ٨٣ | ١٧ |
| زاناباں | زانایان | ٨٦ | ١٦ |
| لـلغوی | اللـغو | ٨٨ | ١ |
| أتبغی | أبتغی | ٨٨ | ٩ |
| أئێمە | ئێمە | ٩٠ | ١١ |
| وزەی | وەرزی | ٩٢ | ١٢ |
| النور | التنور | ٩٥ | ٢٠-٢١ |
| ڕەوانە | ڕەوانەمان | ٩٧ | ١٥ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| تعلمون | تعملون | ١٠٢ | ٥ |
| زبورا | زبرا | ١٠٢ | ٢٢ |
| سزای ن | سزا | ١٠٣ | ١٨ |
| پەروەردکار | پەروەردگاریان | ١٠٤ | ٦ |
| وچاکانەوە | وەچاکانە | ١٠٥ | ١٣ |
| کاسێ | کاتێ | ١٠٦ | ٣ |
| من خير | من ضر | ١٠٩ | ١٠ |
| زیند | زیندویان | ١١٠ | ٩ |
| بیگرمە | بگرمەوە | ١١٥ | ٢١ |
| کاتە | دگانە | ١١٧ | ١٤ |
| قورئانی | قورئانی من | ١١٧ | ١٧ |
| بەرزەیی | بەبەزی تری | ١١٨ | ١٤ |
| چوە بدە | چوبوەوە | ١١٨ | ١٧ |
| بە ئێوە | ئێوەی | ١١٩ | ٨ |
| العابدين | العادين | ١١٩ | ١٠ |
| لە ڕێوە | لەبەڕێوە | ١٢٠ | ٦ |
| سەد | هەشتا | ١٢٤ | ٤ |
| ئەوبو | ئەو | ١٢٦ | ٣ |
| تادان | تاوان | ١٣٥ | ١٤ |
| بەلی چ | بەلێبوردن | ١٣٧ | ٣ |
| کەمەرە | کەمەرەی | ١٤٣ | ٣ |
| الله | يغنيهم الله | ١٤٤ | ١٢ |
| بد | بدەن | ١٤٥ | ٨ |
| مەز | مەزن | ١٥٢ | ٢ |
| داتە | دابە | ١٥٤ | ١٣ |
| دووڕکانە | دوو ڕووەکان | ١٥٧ | ٤ |
| زعنوا | دعوا | ١٥٧ | ١١ |
| سویچندی | سوێند | ١٥٧ | ٢٨ |
| يبتن | يبين | ١٦٢ | ١ |
| انزل لە | أنزلە | ١٧٠ | ٢٠ |
| کنزا | کنز | ١٧٢ | ٩ |
| بنەوەراندا | بونەوەراندا | ١٩١ | ١٤ |
| و ئێمە | ئێمە و | ١٩٤ | ٦ |
| أسود | سواء | ١١٨ | ٢٠ |
| ناقة الله | ناقة | ١٢١ | ٤ |
| خوای | خوا | ٢٣٥ | ٢٠ |
| لە داوی | لە دوای | ٢٣٦ | ٦ |
| أمری | في أمری | ٢٤٣ | ٥ |
| ئەوز | ئەو | ٢٤٦ | ٥ |
| کشف | کشفت | ٢٤٧ | ٢٥ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| القورابر | قواریر | ٢٤٨ | ٥ |
| ئەو | ئە | ٢٥٠ | ٣ |
| ڕزگارمان | ڕزگارمان کردن | ٢٥١ | ٦ |
| لاوط | لوط | ٢٥٢ | ٧ |